4

زنجیرە دەرسی

# ئیمان وعەقیدەی ئیسلامیی

## لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

چاپی دووەم



ئیمان بە:

خوا

فریشتەکانی

کتێبەکانی

پێغەمبەرانی



التفسير

عەلی باپیر





# ئیمـــان بە :

## فریشـتەكانی خـوا ( عزّوجـل )

## كـتـێـبەكانی خـوا ( عزّوجـل )

## پێغەمبەرانی خوا ( علیهم الصلاة والسلام )

زنجیــره دەرسی

# ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قوڕئان و سوننەت دا

## (37 ـ 38 ـ 39 ـ 40)

بەرگــی چــوارەم

ئیمـــان بە:

فریشتەکانی خـوا ( عزّوجل )

کتێبەکانی خوا ( عزّوجل )

پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)

عەلــی باپیــر



بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

ناوی کتێب: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا - بەرگی چوارەم
نووسەر: عەلی باپیر
بڵاوکردەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: نۆرەو أمین مخلص
ساڵی چاپ: یەکەم 1428ك - 2007ز
تیراژ: 3000 دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (468) ی ساڵی 2006 دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاص
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

چاپکردنی پێشووی کتێبەکانم بەنەوە بەگوێرەی

توانا و هەلومەرجی ئەوڕۆژگارە بوو.

وە لە مێژبوو هیوام وابوو شێوە چاپکردنێکی

وایان بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەرانیان بێ. جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم لە نووسینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵستێ.

خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و کۆمەکیان

بێت، هەمیشە سوپاسیان دەکەم.

عەلی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وعلى آله

بەندە (عەلی باپیر) ڕێز مامۆستا مخلص و

نووسینگەی تەفسیرم تەخوێل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و خێری زیاتر

بخاتە ئیشی و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچکەسێکی تر مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نییە.

ع

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

بسم الله الرَّحمن الرَّحيم

﴿ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾(١).




(١) (البقــرة: 285) .

# پێشـــکـەش بێ

بەو مسوڵمانانەی کە وەك قوڕئانو سوننەت خستوویانەتە ڕوو، بێ کەمو زیادو موو بە موو، ئیمانیان بە فریشتە پاكو چاکەکانی خواو کتێبە بێ هە ڵەو پە ڵەکانیو پێغەمـبەرە هەڵبژاردەو پا یە بەرزەکانی ﷺ هە یەو بەو پێیەش مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن.

# پێشـــەكی

الحمدلله ذي الجلال والأكرام والصلاة والسلام على محمد خيـر الأنام وآله الكرام السّائرين على نَهْجِهِ والمهتدين بِهُداهُ الى يوم القيام.

خوێنەری سەنگینو شیرین!

دوای ئەوەی كە لە بەرگی یەكەمی ئەم زنجیرە دەرسەدا بە گ شتی با سی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامییمان كردو لە بەرگی دووەمو سێیەمیشدا بە تیـرو تەسەلـی لە بارەی خوا بەیەكگرتن (توحـید الله)ەوە دوا ـین، ـلەم ـبەرگی چوارەمەشدا خوا یاربێ سێ پایەو بنەڕەتی دیكەی ـگەورەو گرن ـگی ئیـ ـمان دەتوێژینەوە كە بریتین لە: ئیمان بە فریشتەكانی خواو ئیمان بە كتێ ـبەكانی خواو ئیمان بە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام).

شایانی باسیشە كە ئیمان بە خوا ((عزّوجل))و بە ـیەكگرتنی، بنا ـغەو بنەڕەتی سەرجەم پایەكانی دیكەی ئیمانەو هەموو پایەكانی دیكەی ئیـ ـمان چەند لقێكن لەو ئەسڵو بنەڕەتە پەیدادەبن!

چونكە: فریشتەكان پەیكو ڕەوانەكراوی خوان كە ـپەیامو بەرنا ـمەكانی خۆییان پێدا دەنێرێ بۆ پێغەمبەرەكانیو، ڕۆژی دواییش ڕۆژی دیداری ـخواو وەرگرتنەوەی ئەنجامی مامەڵەكرد ـنە لە ـگەڵ ـپەیامو بەرنا ـمەكانی ـخواو پێغەمبەرەكان ـیدا (عـلیهم الـ ـصلاە والـ ـسلام)، كەوا ـتە: ـسەرجەم پا ـیەو بنەڕەتەكانی دیكەی ئیمان لە خزمەت ئەسڵـی گەورەو بـ ـنەڕەتی ئیـ ـمان دان

کە بریتیە لە ئیمان بە خوا بوونو خوا بەیەکگرتنو، هەموویان چەند لقێکن لەو ئەسڵو بنکەوە پەیدا دەبن، هەر بۆیەش ئێمە لە پەنجا دەرس، بیست و چوار دەرسمان بۆ توێژینەوەو ڕوونکردنەوەی ئەو ئەسڵو بنەڕەتە گەورەو گرنگەی ئیمان تەرخان کرد! ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە کتێبی خوا (تبارك‌و تعالـى) تەنیا پێنج شتی دیاری کردوون وەك پایەو بنەڕەتەكانی ئیمان کە بریتین لە:

1 ـ ئیمان بە خوا (سبحانەو تعالـى).

2 ـ ئیمان بە فریشتەکانی خوا.

3 ـ ئیمان بە کتێبەکانی خوا.

4 ـ ئیمان بە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام).

5 ـ ئیمان بە ڕۆژی دوایی.

وە لە سێ شوێنان لە قورئانیدا باسی ئەو پایەو بنەڕەتانەی ئیمان کراوە، کە ئەمانەن:

أ ـ ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ ...﴾[1]، واتە: چاکەکاریی بریتی نیە لە ڕووکردنتانە لای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکەکاریی وەسفی کەسێکە کە ئیمانی بە خواو ڕۆژی دواییو فریشتەکانو کتێبەکانو پێغەمبەران هێناوە ... .

[1] (البقـرة 177 ).

ب ـ ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ...﴾()، واتە: پێغەمبەر ئیمانی بەوەهێناوە، کە لە پەروەردگارییەوە بۆی دابەزێنراوە، هەروەها بڕوادارانیش، هەر کامێکیان ئیمانی بە خواو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرەکانی هێناوە...

ج ـ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنْزَلَ مِنْ قَبْلُ وَمَنْ يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً بَعِيداً﴾()، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئیمان بە خواو پێغەمبەرەکەیو ئەو کتێبەی ناردوویەتە سەر پێغەمبەرەکەیو ئەو کتێبانەی پێشتر ناردوونیە خوارێ، بێنن، چونکە هەرکەسێك بێبڕوا بێت بەخواو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرەکانو ڕۆژی دوایی، ئەوە بێگومان ڕێ لێونبوونێکی دوور ڕێی لێ ون بووە.

مەسەلەی قەزاو قەدەریش کە لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ وەك پایەو بنەڕەتی شەشەمی ئیمان خراوەتەڕوو، بۆ نموونە لەو فەرموودەیەدا کە بە فەرموودەی جیبریل (حديث جبريل) ناسراوە، هاتوە: ﴿... قال: فأخْبرني عن الأيمان! قال: أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وتؤمن بالقدر خيره وشرِّه ...﴾()، واتە: گوتی: دەی هەواڵم پێبدە ئیمان چیە؟!

فەرمووی: ئەوەیە کە ئیمان بە خواو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرەکانیو ڕۆژی دوایی بێنی. وە ئیمان بێنی بەوە کە چاکەو خراپە لە لایەن خواوە- ئەندازەگیری کراون، ئنجا لە ڕاستیدا ئیمان بە قەزاو

() ( البقـرة 285 ).
() ( النسـاء 136 ).
() رواه مسلم عن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) .

قەدەریش هەر دەچێتەوە نێو ئیمان بەخوا ((عزّوجل))، چونکە ئیمان بەقەدەر بریتیە لە ئیمان بە زانیاری‌و تواناو ویست‌و حیکمەتی بێ‌سنوورو بێوێنەی خواو هەرکام لەمانەش سیفەتی خوای بەرزو مەزنن، وەك لە دەرسەکانی پێشوودا باسمان کرد.

هیواداریشم ئەم بەرگەش وەك هاوەڵە پێشووەکانی ئەو ئامانجە بپێکێ کە بۆی نووسراوەو بتوانێ تیشکێکی باش بخاتە سەر هەرسێك پایەو بنەرەتی گرنگی ئیمان بە فریشتە بێ هەڵەو پەڵەکانی خواو کتێبە تێرو تەواوەکانی‌و پێغەمبەرە هەڵبژاردەکانی (علیهم الصلاة والسلام).

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ألاّ اله الاّ أنت أستغفرك وأتوبُ اليك

27 ی ذي القعدة 1427
17 ی کانوونی یەکەم 2006
هـــەولێر

# ڕێ خۆشـــکردن

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەرگی چوارەمە کە تەرخان کراوە بۆ توێژینەوە دەر بارەی هەر سێك پایەی ئیمان: ئیمان بە فریشتەکانی خواو، ئیمان بە کتێبەکانی خواو ئیمان بە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) لە سێ بەندان پێکدێ کە لە هەرکام لەو بەندانەدا یەکێك لەو سێ پایەو بنەڕەتەی ئیمان توێژراونەوە:

بەندی یەکەم: ئیمان بە فریشتەکانی خوا (عزَّوجلَّ).
بەندی دووەم: ئیمان بە کتێبەکانی خوا (عزَّوجلَّ) .
بەندی سێیەم: ئیمان بە پێغەمبەرەکانی خوا (علیهم الصلاة والسلام).

شایانی باسیشە کە قسەکردن لە بارەی چۆنیەتی ئیمان هێنان بە پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) زۆر بەی پانتایی ئەم بەرگی چوارەمەی داگرتوە ئاشکراشە کە لە قورئانیدا پانتایی (مساحة)یەکی زۆرو فراوان بۆ باسو خواسی پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) گفتوگۆو وتووێژو تێکگیرانیان لەگەڵ گەلەکانیاندا بە سەرقافڵەیەتیو دەمڕاستێتی دەستەڵاتدارو سامانداره خۆبەزلگرو خۆشگوزەرانەکان تەرخان کراوەو بێگومان لە میانەی وتووێژو مشتومڕی نێوان پێغەمبەرانی خوا (علیهم

الصلاة والسلام)و نەیارو ناحەزەکانیشیاندا باس‌و خوا سی سەرجەم پا یەو بنەڕەتەکانی ئیمان‌و غەیری وانیش هێنراوەتە پێش(تر).

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئەم بەرگە وێڕای چوار دەر سـەکانی: (37و 38و 39 و40)، چەند باس‌و بابەتێکی دیکە شی گرتوو نە خۆ کە لە پێناسەی بەندەکاندا باسیان دەکەین.

---

(تر) لە کتێبی: (الأسلام يتجلَّى في كتاب الله)دا، کە ئێستا لە ژێر چاپە، بە دێرو تەسەلتر هەرکام لە ئیمان بە فریشتەکان‌و ئیمان بە کتێبەکانی خوا توێژراونەوە.

# ئــــەم بەنــــدە

ئەم بەندە کە لە هەردووك دەرسی ژ مارە (37)و (38) پێك هاتوە، لە پایەی دووەمی ئیمان دەکۆڵێتەوە کە بریتیە لە: ئیمان بە فریشتەکانی خوا (سبحانەو تعالـی).

وە ئەم بەندە ســـــەرجەم لە هە شت خاڵان پێ کدێ کە ئە مە ناوو نیشانەکانیانە:

1 ـ ئیمان بە فریشتەکان یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیمان.

2 ـ فریشتەکان کێن‌و چۆنن؟!

3 ـ ئیش‌و کاری فریشتەکان.

4 ـ پێویستە هەڵوێستمان لەگەڵ فریشتەکانی خوادا چۆن بێ؟!

5 ـ ناوی ژمارەیەك لە فریشتەکان.

6 ـ هەڵوێست‌و ڕەفتاری فریشتەکان لەگەڵ بڕواداراندا.

7 ـ ئایا ئینسان گەورەترە یان فریشتە؟!

8 ـ پێناسەیەکی کورتی جندو شەیطان.

ئێستاش با بە ڕیز بەم هەشـــت خاڵەدا بڕۆین:

لە چەندان ئایەتی قورئاندا، وە لە چەندان فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ ئەوە ڕاگەیەندراوە کە بڕواهێنان بە فریشتەکانی خوا یەکێکە لە پایەو کۆڵەکەکانی ئیمانو بەبێ ئەوە ئیمان نایەتە دیو دانامەزرێ، هەڵبەتە ئەو پێنج پایانەی ئیمان، بەبێ هیچ کامیان ئیمان دروست نابێتو لەم ڕووەوە یەکسانن.

جا یەکێك[تر] ، لەو دەقانەی کە باسی پایەکانی ئیمان دەکاتو دەیخاتە ڕوو کە یەکێکیان بڕوا بە فریشتەکانە، ئەو فەرموودەیە کە بە فەرموودەی جیبــریل (حدیث جبــریل) ناسراوەو تێیدا هاتوە: ((قال: فأخبرني عن الأيمان، قال: أن تؤمن بالله وملئكته وكتبه ورسله واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره، قال صدقت))[یر] ، واتە: کە (جیبریل) پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، هەواڵم پێ بدە ئیمان چیە؟ فەرموویەتی ئەوەیە کە ئیمان بێنی بە خواو فریشتەکانیو بە کتێبەکانیو بە پێغەمبەرەکانیو بە ڕۆژی دوایی، وە بڕوا بێنی بە ئەندازەگیریی کران (القدر) چ چاك بێت چ خراپ بێت کە لەلایەن خواوەیە، هەروەها لە قورئانیش لە سێ شوێندا باسی ئیمان بە فریشتەکان کراوە، وە لە شوێنێکیاندا باسی ڕۆژی دوایی تێدا نیە، وە لە هەر سێ شوێنەکەشدا باسی ئەندازەگیری (القدر) نەکراوە:

۞ ـ وەك خوا (عزّوجل) فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ

---

(تر) دیارە لە (پێشەکی)یشدا ئەم دەقانە خراونەڕوو، چونکە تایبەت نین بەم بەندی یەکەمەوەو هەرسێك بەندەکان دەگرنەوە.

(یر) رواه مسلم عن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) .

﴿وَالنبـيينَ﴾[]، واتە: چاکەکاریی ئەوە نیە کە ڕوو لە ڕۆژهەلاَتو ڕۆژ ئاوا بکەن، بەلَکو چاکەکاریی ڕەفتاری کەسێکە کە بڕوا بێنێ بە خواو ڕۆژی دوایىو بە فریشتەکانو بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة السلام).

- وە فەرموویەتی: ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ...﴾[ِب]، وەك دەبینین لە ئا یەتی پێ شوودا باسی(القدر)ی تێدا نەبوو، بەلاَم لەم ئایەتەیاندا باسی هەر کام لە (قدر)و ڕۆژی دوایی تێدا نیە، بەلَکو تەنیا باسی ئیمان بە خواو بە فریشتەکانو بە پێغەمبەرانی خواو بە کتێبەکانی دەکات.

- وە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنْزَلَ مِنْ قَبْلُ وَمَنْ يَكْفُرْ بِاللهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالا بَعِيداً﴾[]، لێرەدا بە شێوازی (کوفر) پێکردن هێناویەتی کە پێچەوانەی (ئیمان)ە، وە هەڕەشەی کردوە، کە هەر کەسێك کوفر بکات بە خواو بە فریشتەکانو بە کتێبەکانیو بە پێغەمبەرانیو بە ڕۆژی دوایی، ئەوە زۆر دوور کەوتۆتەوەو خراپ ڕێگای لــێ تێك چووە.

دیارە دوایی لە کاتی خستنەڕووی خالَەکانی دیکەدا بۆمان دەردەکەوێت کە بۆچی ئیمان بە فریشتەکان یەکێکە لە پێنج پایەو کۆلَەکەکانی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی، ئنجا کە پێغەمبەر ﷺیش پایەکانی ئیمانی بە شەش دادەنێ، کە چی خوای پەروەردگار لە دوو شوێندا (پێنج)یانی هێناوە لە شوێنێکیشدا تەنیا (چوار)یانی هێناوە،

---

(تر) ( البقـرة [] 177 ).
(ين) ( البقـرة [] 285 ).
([]) ( النسـاء [] 136).

ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئیمان بە قەزاو قەدەر (القضاء والقدر) هەر دەکەوێتەوە نێو بازنەی ئیمان بە خوا، چونکە ئەگەر ئیمانت بە خوا هەبێت، دەبێ ئیمانیشت بە زانیاریو ویستو تواناو حیکمەتی خوا هەبێ، دەجا قەزاو قەدەریش هەر لەو سیفەتانەی خوا پێك دێت، وەك دوایی باسی دەکەین. وە لە ئایەتی (﴿﴾)ی (البقرة)شدا باسی ڕۆژی دوایی نەکراوە، چونکە لە شوێنەکانی دیکەدا هاتوەو بگرە مەگەر چۆن دەنا ئیمان بە ڕۆژی دوایی هەمیشە لەگەڵ ئیمان بە خوا دێ، وە وادیارە حاڵو مەقامیش داخوازی نەکردوە کە لێرەدا باس بکرێ.

لە کۆتایی ئەم خاڵی یەکەمەش دا دەڵێم: ئیمان بە فریشتەکانی خودا (عزّوجل) بە کورتی پوختی ئەوەیە کە: ((ئینسان بەوجۆرەی کە لە قورئانو سوننەتدا خراوەتەڕوو بڕواو قەناعەتی تەواوی بەبوونی فریشتەکان هەبێو، دانی پێدا بنێو قبووڵی بکاتو، بەو جۆرەش کە ئەو قەناعەتو بڕوایە دەخوازێ لەگەڵ فریشتەکاندا مامەڵە بکات)) چونکە ئێمە لە دەرسەکانی سەرەتای ئەم زنجیرە دەرسەدا لە بەرگی یەکەمدا خستمانە ڕوو کە ئیمان چوار پێکهێنەری هەنو بەبێ هیچ کامیان دروست نابێ، کە بریتین لە:

- زانینو بە ڕاست زانینی عەقڵو دڵ.
- کردەوەی دڵ، وەك قبووڵ کردنو خۆشویستن.
- دان پێداهێنانی زمان.
- کردەوەی ئەندامەکان.

جا بێگومان ئەم چوار پێکهێنەرە بۆ هەموو پایەکانی ئیمان هەر پێویستن.

دیارە دەتوانین زۆر شت دەربارەی پێناسەکردن بنووسین لەبەرتیشکی قورئانو سوننەتدا، بەڵام من ئەوەی کە پێویستە بیزانین بۆناسینی فریشتەکانی خوا لە شازدە (١٦) برگەدا کورتو پوختم کردوە، بەڵام سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە فریشتەکان (الملئکة) لە سنووری جیهانی نادیار (عالم الغیب)و لە بازنەو جوغزی جیهانی نەبینراو نابەرهەست (غیر محسوس)دان بۆ ئێمە، چونکە ئێمە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە هیچمان دەربارەی فریشتەکان بۆ مەیسەر نابێ، بگرە لە ڕێی عەقڵو دڵیشەوە هەر ناتوانین فریشتەکان بناسینو پێیان ئاشنا بین! بەڵێ ئەسڵی بوونی فریشتان عەقڵ سەرەدەرییەکی لێ دەکات، چونکە: کاتێك ئینسان بە عەقڵ تەماشا دەکات، کە خەڵکێك بەرەو خێرو چاکە دەچێت جا ئەگەر (تأمل) بکاتو رابمێنێت، هەست دەکات کە ئەو هاندەر (دافع)ەی مرۆڤی بەرەو دەجوولێنێ لە دەرەوەی خۆی بۆی دێت، هەروەها هەندێك کەسیش کە بەرەو شەڕو خراپە دەجوولێ، ئەگەر لەویش رابمێنێو سەرنج بدات، هەست دەکات کە هەتا رادەیەك لە دەرەوەی خۆیەوە کاری تێدەکرێ! جا لەو تاودرانو هاندەرانە بەرەو خراپەوە ئینسان هەست دەکات، کە چەند دروستکراو (مخلوق)ێکی چاك هەن ئینسان بەرەو خێر هان دەدەن، هەندێکی خراپیش هەن، کە بەرەو شەڕو خراپەی هان دەدەن، دیسان لە بارەی دڵو دەروونو فیطرەتیشەوە دەتوانین بڵێین، هەرکات ئینسان دڵی سافو فیطرەتی پاك بوو، دەتوانێ هەست بە بوونی هەرکام لە فریشتەکانو شەیطانەکانیش بکات! بەڵام بە هەرحاڵ ئەگەر مرۆڤ بەکورتیو سەرپێیش بزانێ، کە فریشتەکان هەنو بەهەندێك شت بوونیان دەربکەوێت، بەڵام ئەوە کە فریشتەکان کێنو چۆنو چی دەکەنو چیان پێ سپێردراوە؟ لە ڕێگای (وحي) یەوە نەبێ نازانرێ، هەروەها (جِنّ)یش

بە هەمان شێوە، کەواتە: بۆ زانینی ئەوە با هەوڵبدەین لەبەرتیشکی وەحی دا کە ئایا فریشتەکان کێنو چۆنن؟!

## یەکەم: فریشتەکان لە رووناکی دروست بوون:-

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿خُلِقَتِ الملئكة مِنْ نور، وخُلِقَ الجانُّ من مارجٍ من نار، وخُلِقَ آدم مِمّا وُصِفَ لكم﴾[تر]، واتە: فریشتەکان لە رووناکی (نور) دروست بوون، جند (جِنّ) یش لە بلێسەی ئاگر دروست بوونە، (ئادەم)یش لەوە دروستکراوە کە بۆتان باسکراوە (کە قوڕە). بەڵێ فریشتە لە ڕووناکی دروست بوون، کە ڕووناکی ئێمە هەندێکی دەبینین، بۆ نموونە زانایان دەڵێن: تیشکی ژێرسوور، وە تیشکی سەرووی وەنەوشەیی نابینرێن، هەروەها جۆرە تیشکی دیکە هەیە کە نابینرێ، جا دەگونجێ فریشتەکان لەو جۆرە تیشکانە بن کە نابینرێن، وە دەگونجێ لە جۆرێك تیشکی دیکە بن کە هەتا ئێستا زانیاری بۆی کەشف نەبوون گرنگ ئەوەیە کە فریشتەکان لە رووناکی درووست بوونو (جِنّ)یش بە کافرو موسڵمانیانەوە لە بلێسەی ئاگر دروست بوون.

## دووەم: نازانین فریشتەکان کەی دروست کراون!:

خوای پەروەردگار بۆی دەرنەخستووین کە فریشتەکان کەی دروست کراون، هەروەها پێغەمبەریش ﷺ هەر باسی نەکردوە، کەواتە نازانین، بەڵام ئەوەی کە لێی دڵنیاو مسۆگەرین ئەوەیە کە فریشتەکان پێش ئینسان دروستبوون، چونکە خوای بەدیهێنەر فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي

(تر) رواه مسلم عن عائشة (رضي الله عنها).

**الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾**[1]، واتە: وەیادبکەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: من دەمەوێ جێنشینێك لەسەر زەوی دابنێم، کەوا تە فریشتەکان هەبوون، کە جارێ جێنشینەکە نە دروست بووەو نە دانراوە، مانای وا یە بە دڵنیایی یەوە فریشتەکان پێش ئینسان دروست بوون، وە پێ دە چێ پێش (جن)یش دروست بووبن، ئەگەر چی لەوبارەوە دەق (نص)ێ کی بێ پێچو پەناشمان بە دەستەوە نیە.

هەروەها خوای بەبەزەیی بە فریشتەکانی فەرمووە: **﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾**[2]، واتە: کاتێك ئینسانم ڕێك خست (( کە مەبەست (ئادەم)ە))، ڕووحیشم بە بەردا کرد لە ڕوو حی خۆم، وا تە: (ڕووحێکی تایبەتی خوایی)، ئێوەش کڕنووشی ڕێزی بۆ بەرن. کەواتە پێش ئەوەی مرۆڤ جەستەکەی دروست بکرێو ڕێك بخرێو ڕووحیشی بە بەردا بکرێت، فریشتەکان هەبوون.

## سێیەم: هەندێک لە فریشتەکان یەکجار قەبارە زل و بەهێزو توانان:

بە پێی دەقەکانی قورئانو سوننەت، فریشتەکان گەورەو بچووکییان لە نێواندا هەیە، لە ڕووی قەبارەو لە ڕووی دەورو کاریگەرییانو لە ڕووی پلەو پایەو ڕێزەوە، بەرزیی و نزمییان لە نێواندا هەیە، بۆ نموونە: خوای پەروەردگار فەرموویەتی: **﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ...﴾**[3]. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە،

---

[1] (البقرة 30).
[2] (الحجر 29).
[3] (التحريم 6).

خۆتانو ماڵو خێزانتان لە ئاگرێك بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی ئینسانو بەردە، چەند فریشتەیەکی لەسەرن زۆر زەبەلاحو پتەوونو توندو بەهێزن، (غِلاظ) کۆی (غليظ)ە، واتە: زبرو توندو زەبەلاح، (شِداد) یش کۆی (شديد)ە، واتە: بەهێزو تواناو زەبر دەست، ئنجا (جبـريل) کە لە سەر ڕای سەرجەم زانایان بە سەرۆکی فریشتەکان دادەنرێ، چونکە خوای پەروەردگار ئەوەندی باسی (جبـريل)ی کردوە، ئەوەندە باسی هیچ کام لە فریشتەکانی نەکردوە، وە هەر (جبـريل) لە لایەن خواوە (و حي) بۆ پێغەمبەران ﷺ هێناوە، جا دەربارەی (جبـريل) خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ۞ ذِي قُوَّةٍ عِنْدَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ ۞ مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ﴾[]، واتە: بێگومان قورئان قسەی ڕەوانەکراوێکی بەڕێزە - کە (جبـريل)ە - زۆر خاوەنی هێزو توانایە، لە لای خاوەن عەرش (واتە خوای بێوێنە) پلەو پایەو ڕێزی زۆری هەیەو زۆر گوێڕایەڵـیی بۆ دەکرێ لەوێ، (واتە: هیچ کەس لە قسەی دەرناچێ) وە زۆریش ئەمیندارو دەست پاکە، (واتە: خوای گەورە چی پێ بفەرمووێ ئەو بۆ پێغەمبەر ﷺ ی دێنێت بەبێ دەستکارییو زیادو کەم)، وە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (جبـريل) فەرموویەتی: ((رأيته مُنْهَبِطاً مِنَ السماءِ ساداً عِظَمُ خَلْقِهِ بين السَّماءِ والأرض))[يە]، واتە: (جبـريل)م بینی لە ئاسمان دەهاتە خوارێ زەبەلاحیو جەستەی نێوانی ئاسمانو زەوی پڕ کردبوو، (شوێنێك نەمابوو کە پڕی نەکات)، وە لە فەرموودەیەکی دیکەدا فەرموویەتی: جیبـريلم بینیوە کە (600) شەش سەد باڵـی هەبووە، هەر باڵێك لەو (600) باڵە تێکرای ئاسۆ (أفق)ی هەموو گرتبۆوە[سە].

---

(تر) (التكـوير - 21,19).

(يە) (رواه الترمذي)بسند صحيح، هەروەها لە(صحيح البخاري)یشدا بە هەمان مانا هاتوە.

() رواه الأمام أحمد عن عبدالله بن مسعود.

وە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی یەکێك لەو فریشتانەی کە ( عرش)ی خودا هەڵدەگرن، فەرموویەتی: ((أُذِنَ لي أنْ أُحدِّث عَن أحَدِ حَمَلَةِ العرش ما بين شَحْمَةِ أُذنِهِ وعاتقِهِ مسيرة سبعمائة عام))[تر]،واتە: مۆڵەتم دراوە با سی یەکێك لە هەڵگرانی عەرشی خوا بکەم، لە نێوان نەرمەی گوێی هەتا شانی رێگایی (700) حەوت سەد ساڵە! (کەواتە فریشتەکان هی زۆر گەورەیان هەیە).

## چوارەم: فریشتەکان هەموویان باڵدارن بەبێ هەڵاواردن:

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَاعِلِ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[یر]، واتە: ستایش بۆ خوای بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی، فریشتەکانی گێراون بە نوێنەر، خاوەنی باڵن دوو دووو سێ سێو چوار چوار باڵیان هەیە، وە ئەوەی بیەوێ لە دروستکراوی خۆیدا زیاد دەکات، چونکە بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، هەڵبەتە باڵی فریشتەکان بە دڵنیياییەوە وەکو باڵی باڵندە نیە، وەك چۆن جەستەشیان وەك هی دروستکراوەکانی دیکە نیە، ئەوەتە (جبریل) (علیه السلام) شەش سەد (600) باڵی هەیەو هەر بۆیەش ئەو بەرێزە هێندە خێرایە لە کەمتر لە چرکەیەکدا لە سەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە یەک سەر (وحي) بۆ پێغەمبەر ﷺ هێناوەو جاری وا بووە پر سیارێك لە پێغەمبەر کراوەو

---

(تر) رواه أبو داود.
(یر) ( فاطر 1) .

نەیزانیوە، یەکسەر (جبـریل) لە خواوە هاتوەو هەواڵی بۆی هێناوە، دیارە باڵـی ئەوان شتێکی تایبەتەو هەر خوا دەیزانێ چۆنە.

## پێنجەم: فریشتەکان زۆر جـوانـن:

خوای پەروەردگار دەربارەی (جبـریل) دەفەرموێ: ﴿ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى ۞ ذو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى﴾(تر)، واتە: کەسێك (وحي) فێری پێغەمبەر ﷺ کردوە، کە زۆر بەهێزە، وە دیمەنێکی زۆر جوانی هەیە، (عبدالله) ی کوری (عباس) خوایان لـێ رازی بێت، دەربارەی (ذومِرَّة) فەرموویەتی: (ذو مَنْظَرٍ حَسَنٍ) خاوەنی دیمەنێکی زۆر جوانە، وە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە ناوی (دُحْيَة الكَلْبـي) پیاوێکی زۆر جوان بوو، جا (جبـریل) بە زۆری لە شێوەی ئەودا دەهات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، واتە: ئەگەر خۆی هێنابایە سەر وێنەی ئینسان لە شێوەی (دُحْيَة الكَلْبـي)دا خۆی پیشان دەدا، چونکە پیاوێکی زۆر جوانو لەبەرچاو بوو، کەواتە فریشتەکان لە ئەسڵدا وێنەیان جوانە، وە سەرجەم خەڵك بە گشتی فریشتەکان بە جوان دەزانن، وە بە پێچەوانەوە شەیطانەکان بە ناشیرینو دزێوو ناقولا دەزانن، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (یوسف)دا، دەربارەی ئەو ئافرەتانەی کە لە ماڵی (عزیز)ی میسر کۆببوونەوە لە دەوری هاوسەری (عزیز) کە (یوسف)ی هێنابوو بۆ نێوانیانو ڕازاندبوویەوە، فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا بَشَراً إِنْ هَذا إِلاَّ مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾(تى)، واتە: ئافرەتەکان کاتێك (یوسف)یان

---

(تر) ( النجم 5 ، 6) .
(یی) ( یوسف 31) .

بینی (کە میوەو چەقۆیان لە پێش بوو، جوانی یوسف سەرسامی کردن)و لە ئەنجامدا دەستی خۆیانیان بڕی، (چونکە لە جیاتی م یوە چەقۆکانیان بە دەستی خۆیان دا دەهێنا) وە گوتیان: پاکی بۆ خوا کە هیچ کەمو کوورِ یەکی هەبێ (مادام ئینسانێکی هێندە جوانی دروست کردوە) ئەمە ئینسان ن یە، بەڵکو ئەمە هەر فریشتەیەکی بەڕێزە.

دیارە ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەیە کە فریشتەکان لە ئینسان جوانترن، ئنجا بەڵگەی ئەوەش کە شەی طا نەکان زۆر نا شیرینن، ئەوە یە کە خوا (عزّوجل) دەربارەی بەری درەختی (زقوم) دەفەرمووێ: ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُؤُوسُ الشَّيَاطِينِ﴾[تر]، واتە: میوەی درەختی زەققوم دەڵێی سەری شەیطانەکانە، هەڵبەتە کەس سەری شەیطانەکانی نەبینوە، بەڵام لە بیرو خەیاڵی هەموو خەڵکیدا شەیطان شتێکی ناشیرنو ناقۆڵا و دزێوە.

## شەشەم: فریشتەکان لایەنی (جینسی)یان نیەو نە نێرنو نە مێ:

وەك خوای پەروەردگار بەرپەر چی ئەوا نەی داوە تەوە کە گوتوویا نە: فریشتەکان کچی خوانو فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثًا أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ﴾[یر]، وا تە: ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای بە بەزەیین (وبەس خەریکی بەندا یەتین) بە مێینەیان دانان، ئایا دروستکرانی فریشتەکانیان بینیوە (تاوەکو بزانن مێن

---

(تر) ( الصافات 65).

(یر) ( الزخرف – 19).

یان نێرن؟!) بێگومان ئەو شاهیدیی بە درۆیەیان ( کە لە بارەی فریشتەکانەوە دەیدەن) دەنووسرێ‌و لێشیان دەپرسرێتەوە.

## حەوتەم: فریشتەکان خواردن‌و خواردنەوەو ماندووبوون‌و خەویان نیە:

وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ﴾[]، مانای ئەم ئایەتە بە تۆزێك ڕوونکردنەوەوە ئاوایە: کۆمەڵێك فریشتە چوون بۆ لای ئیبـراهیم ﴿علیه السلام﴾ ئەویش کە پیاوێکی زۆر سەخی‌و ناندەر بوو، گۆلکێکی بۆ سەر بڕین‌و بۆی سوور کردنەوەو لە پێشی دانان[ب]، جا کە سەیری کردن دەستی بۆ درێژ ناکەن پێی شتێکی نائاسایی بوو، پێی وا بوو کە ئەوانە مادام نان ناخۆن‌و نمەکی ناکەن دیارە بە تەمای کارێکی خراپن، نەیزانی کە ئەوانە فریشتەن، چونکە ئەوانە لە شێوەی ئینسانەدا هاتبوون، بۆیە ئیبراهیم (علیه السلام) ترسی بۆ پەیدا بوو، ئنجا کە فریشتەکان هەستیان بەوە کرد، پێیان گوت: مەترسە ئێمە ڕەوانە کراوین بۆ لای گەلی (لوط) کە لەنێویان بەرین. ئەوە لەبارەی خواردن‌و خواردنەوە نەبوونیانەوە، وە خوای بێوێنە دەربارەی ماندوونەبوونی فریشتەکان فەرموویەتی: ﴿فَالَّذِينَ عِنْدَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُمْ لا يَسْأَمُونَ﴾[]، واتە: ئەوانەی لە خزمەت پەروەردگارت دان شەو ورۆژ بە پاکی دەگرن‌و ماندووش نابن. دەربارەی

---

(تر) ( هـود  70) .

(ب) وەك فەرموویەتی: ﴿فَمَا لَبِثَ أَنْ جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾ (هود -69)، واتە: چی وای پێنەوەخرا کە گۆلکێکی سوور کراوەی بۆ هێنان.

() ( فصلت  38 ) .

نەبوونی خەوو ئیـ سراحەتیش فەرموو یەتی: ﴿يُ سَبِّحُونَ اللَّ يْلَ وَالنَّ هَارَ لَا يَفْتُرُونَ﴾[تر]، واتە: شەو و ڕۆژ خوا بە پاك دەگرن بەبێ وەستانو پشوودان!

## هەشتەم: جێگاو ڕێگای فریشتەكان بە زۆری لە ئاسمانە:

لە زۆربەی ئایەتەكاندا ئەوە بە ڕاشكاویی باسكراوە كە شوێنو جێ گاو ڕێگای فریشتەكان لە ئاسمانە، بۆ وێنە خوای گەورە فەرموو یەتی: ﴿تَ كَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْ فَوْقِهِنَّ وَالْمَلَائِكَةُ يُ سَبِّحُونَ بِحَ مْدِ رَبِّ هِمْ﴾[یر]، وا تە: ئاسمانەكان خەریكن لەلای سەرەوەڕا لەت ببن، وە فریشتەكانیش هەمیشە خوا بە پاك دەگرنو ستایشی دەكەن، دیارە ئاسمانەكان بۆیە لە سەرەوەڕا خەری كە لەت (شق) ببن، چونكە خوای بەرزو بێوێنە لە سەرەوەی درو ستكراوەكانی خۆیەوەیەتی، یا لەبەرئەوەی كە فریشتەكان ئاسمانیان زۆر قەرەباڵغو قورس كردووەو خەریكە لەژێر فشاری قورسایی فریشتەكاندا لەت ببێ، تو یژەرەوانی قورئان ئەو دوو ڕایەیان هێناون بۆ لێكدانەوەی ئەم ئایەتە، ئن جا لە هەر شوێنێك باسی هاتنی فریشتەكان كرابێ، باسی هاتنە خوار ( نزول) یان كراوە، وەك قورئان دەفەرمووێ: ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَ بِّكَ﴾[]، وا تە: بە فەرمانی پەروەردگارت نەبێ نایینەخوارێ، یان دەفەرمووێ: ﴿تَ نَزَّلُ الْمَلَائِ كَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ﴾[]، واتە: فریشتەكان لەگەڵ (جبـریل)دا بە مۆڵەتی پەروەردگاریان دێنە خوارێ بۆ ئەنجامدانی هەموو كار یك كە پێیان سپێرراوە، ئەگەرنا شوێنی ئەسڵیان هەر ئاسما نەو ئە گەر بۆ كاری

---

(تر) ( الأنبياء  20 ).
(یر) ( الشورى  5 ).
() ( مريم  64 ) .
() ( القدر - 4 ) .

پێویستو بە فەرمانی خوا نەبێ نایەنە خوارێ، دیارە جگە لەو فریشتانەی کە کاریان لەسەر زەوی پێ سپێردراوە، وەك دوایی باسی دەکەین.

## نۆیەم: ژمارەی فریشتەکان:

بێگومان هیچ کەس ئەوە نازانێو خوای کاربەجێ بۆ خۆی بڕیویەتەوە وەك فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلاَّ هُوَ﴾(تر)، واتە: وە بێجگە لە خۆی هیچ کەس ژمارەی سەربازەکانی پەروەردگارت نازانێ! وە پێغەمبەر ﷺ بۆ زۆری ژمارەی فریشتەکان، دەربارەی (البيت المعمور)کە لە ئاسمانی حەوتەمەو ئیبراهیم (عليه السلام)یش لەوێیە فەرموویەتی: ﴿... ففتح لنا فأذا أنا بأبراهيم ﷺ مُسْنِداً ظهره الى البيت المعمور وإذا هو يَدْخُلُه كل يومٍ سبعون الف ملك لايعودون اليه﴾(یر)، واتە: دەرگامان بۆ کرایەوە ئیبراهیم (علیه السلام) پشتی وە (البيت المعمور) دابوو کە هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە دەهاتنە نێوی و، هیچ کامیان جارێکی دی کە دوو بارەی ناکاتەوە (بەڵکو حەفتا هەزاری دی کە دێت دوای ئەوان)، وە دەربارەی جڵەو راکێشەکانی دۆزەخ، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ((يؤتى بجهنم يومئذ لها سبعون ألْف زِمامٍ مع كلِّ زِمامٍ سبعون ألْف مَلَكٍ))(سم)، واتە: ڕۆژی دوایی دۆزەخ دەهێنرێ حەفتا هەزار جڵەوی هەیە، هەر جڵەوێك حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵ دایە، هەروەها هەر لەوبارەوە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((إِني أرى ما لا ترون وأسْمَعُ ما لا تَسْمعون أطَّتِ السماء وحَقَّ لها أنْ تأطَّ

(تر) (المدثر 31).
(یر) متفق عليه.
(سم) رواه مسلم.

ما فيها موضع أرْبع أصابع الا عليه مَلَكٌ ساجِدٌ))[تر]، وا تە: ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن، وە من شتێ وا دەبیستم کە ئ ێوە نایبیی ستن، ئا سمان دەنگی لێهات لە ژێرباری قورسدا، وە جێگای خۆیەتی دەنگی لێ ب ێت، چونکە هیچ شوێنی چوار پەنجەیەك نیە لە ئاسما نێ، مە گەر فری شتەیەك کڕنووشی تێدا بردوە (بۆ خوای پەروەردگار)، وا تە: ئا سمان یەکجار زۆر قەرەباڵغە بە فریشتەکانو لە هەموو شوێنێکی ئەم ئاسمانەدا هەن، لەبەرئەوە کەس ژمارەی فریشتەکان نازانێ جگە لە خوای بەدیهێنەر.

## دەیەم: لە کاتی قیامەتدا دەگونجێ فریشتەکانیش بمرن!

خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ إِلاّ مَنْ شَاءَ اللهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾[ير]، واتە: فوو بە کەڕەنا (صور)دا کرا، یەکسەر هەرچی لە ئاسما نەکانو زەو یدا هە یە، هەموو مردن، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ نەمرێ، پاشان جارێکی دی فووی پێدا کرایەوە هەموویان هەڵسانەوەو تەماشایان دەکرد، دیسان خوای بێهاوتا دەفەرمووێ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاّ وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾[]، وا تە: هەموو شتێك لەنێودەچێ جگە لە ڕوو (ذات)ی وی، وە حوکمڕانی تەنیا هی ویەو بۆ لای ویش دەگێڕڕێنەوە، ئاشکرایە کە وشەی (شيء)یش هەموو شتێك دەگرێتەوە فریشتەو غەیری فریشتەش، بەڵام لە ڕاستیدا مردنی فری شتەکان لە ڕۆژی دواییدا شتێکی مسۆگەر نیە، چونکە ئا یەتی (68)ی (الز مر)

(تر) رواه الأمام أحمد و الترمذي و أبن ماجه عن أبي ذر.
(ير) ( الزمــر 68 ).
() ( القصص 88 ).

هەڵاواردن (إستثناء)ی تێدایەو، ئایەتی (88)ی (القصص)یش دەگونجێ وەك ئایەتی (26)ی (الرحمن) مەبەست پێی تەنها خەڵكی سەر زەوی بێت لە ئادەمیزادو جن.

## یازدەهەم: فریشتەكان یەكجار چاك و پاك و بەڕێزن:

وەك خوای بێوێنە لە وەسفیاندا فەرموویەتی: ﴿لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[ⓣ]، واتە: سەرپێچی خوا ناكەن لە هەر شتێكدا فەرمانیان پێ بكات، وە هەر ئەمرێكیان پێ بكرێ ئەنجامی دەدەن.

وە خوای كاربەجێ باسی هێنانی (وحي) دەكات كە فریشتەكان دەیهێنن دەفەرمووێ: ﴿بِأَيْدِي سَفَرَةٍ ۞ كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾[ⓨ]، واتە: ئەم قورئانە چەند نوێنەر (سفیر)ێك دەیهێنن زۆر بەڕێزو زۆر چاكەكارن. وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((الذي يقرأ القرآن وهو ماهر به مع السفرة الكرام البررة))[ⓜ]، واتە: ئەو كەسەی قورئان دەخوێنێ و تێیشیدا كارامەیە لەگەڵ فریشتە بەڕێزە چاكەكارەكانە (واتە دەچێتە پلەی ئەوانەوە)، وە فریشتەكان شەرم و شكۆ (حیاء)یان هەیە، وەك لە فەرموودەیەكدا هاتوە كە ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ ڕاكشابوو، ڕانی پیرۆزی بەدەرەوە بوو، هەركام لە (ئەبوبەكرو عومەر) (خوا لێیان ڕازی بێت) بە دوای یەكتردا هاتن بۆ خزمەتی، بەڵام ڕانی دانەپۆشی و خۆی تێك نەهێنا، دوای ئەوان (عوسمان) (خوا لێی ڕازی بێت) هات، یەكسەر خۆی گورج كردەوەو ڕانی داپۆشی، (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێت) گوتی: (ئەبوبەكرو عومەر) هاتن، ڕانت دانەپۆشی، بەڵام (عوسمان) هات

(ⓣ) (التحريم 6).
(ⓨ) (عبس - 15،16).
(ⓜ) رواه البخاري و مسلم و أصحاب السنن عن عائشة (رضي الله عنها).

یەکسەر ڕانت داپۆشی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ألا أستحي من رجل تستحي منه الملئكة))[ت]، واتە: ئایا من شەرم لە پیاوێك نەکەم کە فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن؟!

## دوازدەیەم: فریشتەکان دەتوانن بچنە سەر شێوەو دیمەنی جیاجیا، جگە لە شتی پیس‌و نزم وەکو سەگ‌و بەراز:

وەك کە خوای بێهاوەڵ لە باسی بەسەرهاتی (مریم)دا فەرموویەتی: ﴿إِذ إنتَبَذَت مِنْ أَهْلِهَا مَكَاناً شَرْقِيّاً ۞ فَاتَّخَذَتْ مِنْ دُونِهِمْ حِجَاباً فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيّاً﴾[ث]، واتە: کاتێك مەریەم شوێنێکی لە لای ڕۆژ هەڵاتی کەس‌و کاریەوە گرت‌و پەردەیەکی بۆ خۆی گرتەوە، (کە دیارە خەریکی خۆ شوردن‌و خۆ پاککردنەوە بووە)، ئێمە ڕووحی خۆمان (جبریل)مان ناردە لای‌و خۆی بردە سەر شێوەی پیاوێکی تێرو تەواو (کە فووی بە یەخەی کراسەکەیدا کردو ڕووحی عیسای چووە بەر)، هەروەها لە بەسەرهاتی (ئیبراهیم)و (لوط) (سەلامی خوایان لەسەر بێ)، خوای بەرزو مەزن باس دەکات، کە کۆمەڵێك فریشتە لەسەر شێوەی چەند کەسێك دەچن بۆ لای هەر کام لە (ئیبراهیم) (علیه السلام)و(لوط) (علیه السلام) کە بە پێی سیاقی بەسەرهاتەکەو ڕواڵەتی ئایەتەکان چوونەتە سەر شێوەی چەند گەنجێکی

---

(ت) رواه مسلم عن عائشة(رضي الله عنها)، بڕوانە صحيح مسلم،ص (1307)، ژمارە (2401).

(ث) ( مريم - 16، 17 ).

جوان[تر]، وە لە فەرموودەدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ (جبریل)ی لەسەر شێوەی (دحیة الکلبـي)دا بینیوە جاری وا بووە هاوەڵان وایانزانیوە هەر (دُحیة)یەو (جبـریل) نیە[یر]!

## سێزدەهەم: فریشتەکان زۆر خێراو گورج و گۆڵـن:

بۆ وێنەی (جبـریل) بە زۆر کەمتر لە چرکەیەك لە ئاسمانی حەوتەمەوە هاتوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، کە لە سەر هەندێ ڕووداوو بە سەرهات (وحي)ی خوای بۆ هێناوە، وەك (عائشة) (خوا لێی رازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵـێ: (پاکی بۆ ئەو خوایەی کە هەموو شتێك دەبیستێ)، ئەوە دەربارەی ئەو ژنە بوو بە ناوی (خَوْلَة) کە مێردەکەی (ظِهار)ی لـێکردبوو، ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و سکاڵای حاڵـی خۆی لەلای کرد، (عائیشە) دەڵـێ: ئەوەندە لەسەرخۆو بە بێدەنگی قسەی لەگەڵ پێغەمبەر دەکرد، کە منیش لێی حاڵـی نەدەبووم، بەڵام خوای بیسەر (عزّوجل) لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە بیستیو (جبـریل) یەکسەر هاتو سەرەتای سوورەتی (المجادلة)ی هێنا کە حوکمی (ظهار) ڕوون دەکاتەوە[سز].

## چواردەیەم: فریشتەکان نیازی نێو دڵی ئینسانیش دەزانن:

---

(تر) ( هـود ﴿ 83، 17) .

(یر) پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (( ورأیت جبریل فأذا أقرب من رأیت بِهِ شَبَهاً دُحْیَهَ )) بڕوانە (صحیح مسلم) ص 104. ژمارە: 271.

(سز) بڕوانە (صحیح البخاري)، (ظِهار)یش ئەوەیەکە پیاو بەژنەکەی بڵێ: (أنتِ عليَّ كَظَهرِ أُبي).

وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ۞ كِرَاماً كَاتِبِينَ ۞ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾[تر]، واتە: وە بێگومان چەند پارێزەرێكتان بە سەرەوەن، زۆر بەرێزن‌و نووسەرن، هەرچی ئێوە بیكەن ئەوان دەیزانن.

وە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرزو مەزن فەرموو یەتی: ((اذا همَّ عبدي بحسنةٍ فلَمْ يَعْمَلْها فاكتبوها له حسنةً، فإنْ عَمِلَ ها فاكتبو ها عَشْراً))[یر]، واتە: (خوای پەنهانبین بە فریشتەكانی فەرمووە:) ئەگەر بەندەی من ویستی چاكەیەك بكات بەڵام نەیكرد، چاكەیەكی بۆ بنوو سن، ئە گەر كردی دە چاكەی بۆ بنووسن، كەوا تە فری شتەكان نـ یێو د ڵـی ئین سانیش دەخوێننەوە بە فەرمانی خوا.

## پازدەیەم: فریشتەكان كاروباری یەكجار رێك‌و پێكیان هەیە:

بەڵێ هیچ نارێكیەك لە ئیش‌وكاری فریشتەكاندا نیە، بەڵام نارێكی لە ئیشی ئینسان دا هەیە لەبەر ئەوەی كە حەواڵەی عەقڵ‌و ویستی خۆی كراوە، هەروەها نارێكی لە ئیش‌وكاری جند (جِنّ)دا هەیە، لەبەر ئەوەی ئەوانیش حەواڵەی ویستی خۆیان كراون، بەڵام ئیش‌و كاری زی ندەوەران[سم]، و ڕووەك‌و هەتا بێ‌گیانان (جمادات)یش نارێكی تێدا نیەو هی چیان لەو یا سایانەی لانادەن كە خوا بۆی داناون، هەڵبەتە فریشتەكانیش كە جۆرە دروستكراوێكی دیكەی خوای پەروەردگارن هەرچەندە خاوەنی ویستی خۆیانن، بەڵام كۆنترۆڵـی ویستی ڕاستەوخۆی خوای پەروەردگارن، بۆیە نارێكی لە ئیش‌وكاریاندا نـ یە،

(تر) (الأنفطار 10، 11، 12).

(یر) (رواه البخاري و مسلم).

(سم) لە ڕاستیدا بێجگە لە مرۆڤ هیچ شتێك گیان (روح)ی نیە و ڕووح تایبەتە بە مرۆڤەوە، بۆیە (گیانلەبەر) بۆ غەیری مرۆڤ هەڵەیەو غەیری مرۆڤ زیندەوەرە.

چونکە هەر ئیشێك زیاتر پەیوەندی بە خواوە بێت ڕێکتر دەبێت‌و ئەگەر بە تەواوی پەیوەندی بە خواوە بێت بێ‌گومان هەرگیز هەڵەی تێدا نابێت، خوای مەزن دەربارەی ڕێك‌وپێکی ئیش‌وکاری فریشتەکان فەرموویەتی: ﴿وَمَا مِنَّا إِلاَّ لَهُ مَقَامٌ مَعْلُومٌ ۞ وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ ۞ وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ﴾[ت]، واتە دەڵێن: ئێمە هیچ کامێکمان نیە مەگەر پایەو شوێنێکی دیاریکراوی هەیە (هەر کەسە پلەو پایەو شوێنی خۆی دەزانێ) وە ئێمە زۆر بەڕێزو جوان دەوەستین، وە ئێمە هەمیشە (پەروەردگاری خۆمان) بە پاك دەگرین، وە پێغەمبەریش ﷺ کاتێك کە هاوەڵانی بەڕێزی بۆ نوێژ ڕیز دەکرد، دەیفەرموو: ((ألا تَصفّون كما تَصِفُّ الملائكةُ عند ربِّها!))[ی]، واتە: ئایا ڕیز نابن، وەکو چۆن فریشتەکان لە خزمەتی پەروەردگاری خۆیان ڕیز دەبن!

## شازدەیەم: فریشتەکان هەتا لەسەر شێوەی ئەسڵی خۆیان بن نابینرێن:

بەڵێ مرۆڤ لەم ژیانە دنیایی‌یەدا توانای بینینی فریشتەکانی نیە، وەك چۆن توانای بینینی جند (جِنّ)یشی نیە لە سەر شکڵ‌و شێوەی ئەصلیی خۆیان، بەڵام پێغەمبەری خوا محمد ﷺ وەك موعجیزەیەك دوو جار (جبریل)ی لەسەر شێوەی خۆی بینوە، لە سەرەتای پێغەمبەرایەتیدا دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك وەحی پچڕاو دوایی هاتەوە، وە جاری دووەمیش لە کاتی شەوڕۆو بەرزبوونەوە (الأسراء والمعراج)دا، وەك لە (صحيح البخاري)دا

(ت) (الصافات - 164، 166).

(ی) رواه مسلم و أصحاب السنن.

هاتووەو ئەم ئایەتانەی سەرەتای (النجم)یش باس دەکەن: ﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى ۞ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى ۞ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى ۞ إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى ۞ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى ۞ ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى ۞ وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَى ۞ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى ۞ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى ۞ فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى ۞ مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى ۞ أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى ۞ وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى ۞ عِندَ



(ت) (النجم: 1 -15).

بەڕێـــزان!

خوای كاربەجێ لە قورئاندا، وە پێغەمبەری خوا لە فەرموودەكانیدا هەواڵیان پێ داوین كە فریشتەكان كاروبارو ئیشیان یەكجار زۆرن، ئەوە هیچ كە هەمیشە سەرگەرمی طاعەتو عیبادەتی خوان، خوا بە پاك دەگرنو سوپاسو ستایشی دەكەن، زیكرو یادی دەكەنو سەجدەو ڕكووعی بۆ دەبەن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش خوای مەزن كارو باری ئەم بوون (وجود)ەشی بە فریشتەكان سپاردوە، ناڵێین هەر هەموو شتێك لە بوونەوەردا بە فریشتەكان سپێردراوە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری كاروبارەكان بەوان سپێردراونو ئەوان سەرپەرشتی دەكەن.

(1) ئەوە كە فریشتەكان هەمیشە هەر سەرگەرمی گوێ ڕایەڵییو بەندایەتی خوان لە زۆر ئایەت دا هاتوە بۆ وێنە خوا دەفەرمووێ:

﴿يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لا يَفْتُرُونَ﴾[]، واتە: شەوو رۆژ خوا بە پاك دەگرن‌و ناوەستن‌و ماندوو نابن، وە دەفەرمویٚ: ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[]، واتە: لە پەروەردگاری خۆیان دەترسن لە سەروویانەوە، وە هەرچی پێیان بسپێردرێ ئەنجامی دەدەن، وە دەفەرمویٚ: ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾[]، واتە: ئەوانەی کە عەرشیان هەڵگرتوە وە ئەوانەش کە لە دەورنی، هەمیشە خوا بە پاك دەگرن‌و ستایشی دەکەن، وە هەر لەو بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿وَالْمَلائِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾[]، واتە: فریشتەکان هەمیشە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن‌و ستایشی دەکەن.

(2) پێشتر ئەوەمان باسکرد کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو رۆژێ حەفتا هەزار فریشتە دەچنە نێو (البيت المعمور)و هیچ کامیان بۆ جارێکی دیکە ناگەڕێنەوەو دووبارەی ناکانەوە، (البيت المعمور)یش وەکو چۆن موسڵمانان دەچن تەوافی (الكعبة) دەکەن، وە خوای مەزنیش ئەو (البيت المعمور)ەی لە ئاستی (كعبة) لە ئاسمانی حەوتەم بۆ فریشتەکانی داناوە کە هەمیشە تەوافی دەکەن وە بە دەوریدا دەخولێنەوە، ئەمە ڕای زۆرینەی زانایانە لە بارەی (البيت المعمور)ەوە کە لە سوورەتی (الطور)دا باسی کراوە وەك فەرموویەتی: ﴿وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ﴾[].

---

(تر) ( الأنبياء  20 ).
(ير) ( النحل  50 ).
() ( غافر  7 ).
() ( الشورى  5 ).
(له) ( الطور  4 ).

(3) ئیشێکی دیکەی فریشتەکان ئەوەیە کە کۆمەڵێك دیاریکراون بۆ گیان (روح) بە بەرداکردنی جەستەی ئینسان.

پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە دەفەرموێ: ((انَّ أحدكم يُجْمَع خَلْقُه في بَطْن أُمِّه أربعين يوماً نطفة، ثم يكون في ذلك عَلَقةً مثل ذلك، ثم يكون في ذلك مُضْغَةً مثل ذلك، ثم يُرْسَلُ الملَكَ فيَنْفُخُ فيه ويُؤمَرُ بأربع كلمات: يُكْتَبُ رِزقُهُ و أجَلُهُ وعَمَلُهُ و شَقيٌّ أو سعيد))[تر]، واتە: هەریەك لە ئێوە لە سکی دایکیدا چل رۆژ کۆدەبێتەوەو وەك تۆویلکە (نطفة) دەمێنێتەوە، پاشان ئەو ئەندازەیەش خوێنپارە (عَلَـقَةَ) دەبێ، ئنجا ئەو ئەندازەیەش زارجوو (مُضْغَةً) دەبێ (واتە: پارچە گۆشتی بچووك)، ئنجا خوای مەزن فریشتە دەنێرێو فوو (روح)ی بەبەردا دەکات، وە فەرمانیشی پێدەکات کە چوار شتان بنووسێ، رِزقەکەی، ئەجەلـی، کردەوەی و ئایا جێگای بەهەشت دەبێ یان دۆزەخ!

(4) کارێکی دیکەی فریشتەکان بریتیە لە پاسەوانی کردنو پاراستنی ئینسان، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿سَوَاءٌ مِنْكُمْ مَنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَنْ جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ۝ لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ﴾[یر]، واتە: ئەوانەتان کە قسەی ئاشکرا دەکەن، یان قسەی پەنهان، وە بەشەو خۆ پەنهان بکەن، یان بە رِۆژ بڕۆن بە رِێگادا، چەند فریشتەیەك هەن کە نۆرە دەکەن لەگەڵ یەکتر، لە پێشی

(تر) متفق عليه.
(یر) (الرعد 10،11).

یەو لە پشتی‌یەوە دەیپارێزن بە فەرمانی خوا، (تا ئەوکا تەی کە خوا مۆڵەتی مانەوەی داوە لە ژیانی دونیایدا)[تر].

(5) وە ئیشێکی دیکەی فریشتەکان ئەوەیە کە (وحي) دێنن بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەك پێشتر باسمان کرد، بە تایبەتی (ج بـریل) وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوّاً لِجِبـرِيل فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللهِ﴾[ير]، واتە: بڵێ: هەر کەسێك دوژمنی (ج بـریل) ب ێت، ئەوە بێ‌گومان ئەو وەحی بە فەرمانی خوا بۆ سەر دڵی تۆ دێنێ.
هۆی هاتنە خواری ئەم ئایەتە ئەوە بوو کە:

جوولەکەکان دەیانگوت: ئێمە بۆیە دژا یەتی (ج بـریل) دە کەین، چونکە ئەو (وحي) بۆ (محمد) دێنێ‌و هەموو نەتەوەکانیش بە در ێژایی مێژوو (جبـریل) هاتوە لە ن ێوی بردوون، بۆ یە ئی مان بە (مح مد) ناهێنین[سم]!

(6) وە ئیشێکی دیکەی فریشتەکان ئەوەیە کە ئینسان بەرەو چاکە هان دەدەن، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ما منكم مِنْ أحدٍ الاّ وَ قدْ وكِّلَ به قَرِيْنهُ من الجِنِّ و قَرينه مِنَ الملئكة، قالوا: وايّاك يا ر سول الله؟ قال: وإيّايَ ولكن الله أعانني عليه فأسْلَم فلا يَأْمُرني الاّ بِخَ يـرٍ))[شم]، واتە: هەر کام لە ئێوە حەتمەن هاودەمێکی لە گەڵ دا یە لە ( جن) وە

(تر) ئەم ئایە تە ما نای دیکە شیان هە یە ج گە لەوەی گو تمان، کورتە کەی ئەوە یە کە مەبەست لێرەدا پاراستنی فریشتەکانە بۆ کردەوەکانی ئینسان و تۆمارکردنیانە.

(ير) ( البقـرة □ 97 ).

(□) بڕوا نە: ( لُبابُ الذ قول في أ سباب ال نزول) ی (ال سیوطي) و (أ سباب ال نزول)ی (النَّيسابُوري).

(□) رواە مسلم عن ابن مسـعود.

هاودەمێکیش لە فریشتەکان، ((دیارە فریشتەکە فەرمانی بە چاکە پێ دەکاتو جندەکەش بەرەو خراپە هانی دەدات)) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تۆش هاودەمی (جن)ت لەگەڵ دایە؟، فەرمووی: بەڵێ بەڵام خوا یارمەتی داوم بە سەری داو مسوڵمان بووەو هەر هانی چاکەم دەدات.

(7) ئیشوکارێکی دیکەی فریشتەکان بریتییە لە پاراستنی کردەوەی ئینسانەکان، واتە: ژمارەیەك لە فریشتەکانی خوا، بە تایبەت بۆ ئەوە تەرخانکراون کە کردەوەکانی خەڵکی تۆمار بکەنو هەرچی ئینسانەکان بیکەنو بیڵێنو بە دڵیشیان دابێت ئەوان دەینووسن، وەك خوا (عزّوجل) فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ ۞ إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ ۞ مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاَّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾[1]، واتە: ئێمە ئینسانمان دروست کردووەو دەزانین چی بەدڵدا دێتو دەچێ، وە لە ڕەگی مەلی لێی نزیکترین، کاتێك کە دوو فریشتەکان لەلای ڕاستو چەپی دانیشتوونو ئامادەن، هەر قسەیەك لە دەمی ئەو ئینسانە دەربچێ، چاودێرێکی ئامادەی بە سەرەوەیەو یەکسەر تۆماری دەکات.

(8) وە کردەوەیەکی دیکەی فریشتەکان ئەوەیە کە گیانی ئینسان دەکێشن لە کاتێکدا کە خوای کاربەجێ مۆڵەتی ژیانی تەواوکرد. هەڵبەتە فریشتەی مەرگ (ملك الموت) بەگشتی سەرپەرشتی گیانکێشان دەکات، بەڵام فریشتەی زۆریشی لەبەردەستدان، وەك لە ئایەتەکاندا دەردەکەوێت، بۆ نموونە: خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُمْ مَلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي

[1] (ق - 16، 18).

**وُكِّلَ بِكُمْ**﴾[] ، واتە: بڵێ: ئەو فریشتەی مەرگە کە پێ تان را سپێرراوە، ئەو گیانتان دەکێشێ.

کەواتە: کە خوا لە شوێنێکدا فەرموو یەتی: بۆ خۆم گیا نەکان دەکێشم: ﴿**اللهُ يَتَوَفَّى الأَنْفُسَ**﴾[] ، وە لە شوێنێك فەرموویەتی: فریشتەی مەرگ ﴿مَلَكُ الْمَوْتِ﴾ گیانتان دەکێ شی، وە لە شوێنێکی دی کەش، فەرموویەتی: فریشتەکان گیانتان دەکێ شن: ﴿**حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لا يُفَرِّطُونَ**﴾[] ، پێویستە بزانین کە چۆنیەتی ئەنجامدانی گیانکێشان بەجۆرەیە: لە ئە سڵدا بە فەرمانی خوا یە،وە بەسەرپەرشتی فری شتەی مەرگ(مَلَكُ الْمَوْتِ)ە، وە جێ بەجێ کردن (تنفیذ)ەکەیشی لەلایەن فریشتەکانەوەیە!

(9) وەئیشێکی دیکەی فریشتەکان ئەوەیە کە لە کاتی سەرەمەرگدا موژدەی بەهەشت بە بابای ئیماندار دەدەن و دەڵێن دڵت خۆش بێت تۆ بەهە شتی، بەڵکو لە فەرموودەکاندا هاتوە کە بەهە شتی نی شان دەدەن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿**الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ**﴾[] ، بۆیە زۆر کەسی ئیماندار بی نراوە کە لە سەرەمەرگدا ڕووی خۆش بووەو بە زەردەخەنەوە مردووە، یان هەبووە لە سەرەمەرگدا بێ‌ئەوەی لە هۆشی خۆی بچێت و ئاگای لە خۆی نەمێنێ، گوتوویەتی (وعليكم السلام و رحمة الله) یاخود بەخێربێن سەرچاوم، یان

---

(٣٣) ( السجدة 11 ) .

(٣٤) ( الزمر - 42 ).

() ( الأنعام - 61 ).

() ( النحل - 32 ).

گوتوویەتی: ئەوە میوانم هاتن جێگایان بۆ ئامادە بکەن، ئنجا کەوتۆتە حاڵی خۆیو گیانی سپاردوە!

بەڵێ ئەوەی بەهەشتی بێت موژدەی بەهەشتو ڕەزامەندیی خوای پێدەدرێت، وە بە پێچەوانەشەوە ئەوەی کە ئەهلی گوناحو تاوانو کوفرە، فریشتەکان یەکسەر دۆزەخیان پێ نیشان دەدەنو هەڕەشەی تووڕەییو خەشمی خوایان لێ دەکەن بە سزاو ئازار لەو سەرەمەرگەدا، وە ئینسانی خراپو کافرو بێدین زۆر بە ئێشو ئازارو نارەحەتییەوە گیانی دەردەچێ، وە بە زۆریش وایە کە ئەوانە لە سەرەمەرگدا پەشیمان دەبنەوەو دەست دەکەن بە گریانو هاوارو ڕەنگو ڕوویان زۆر تێکدەچێت، بەڵام ئیمانداران ناترسن چونکە بەر چاویان زۆر ڕوونەو وەك گوتراوە: ئەوەی پاکە بێباکە!

(10) وە ئیشێکی دیکەی فریشتەکان ئەوەیە کە لە گۆڕ (قبر)دا لە ئینسان دەپرسنەوەو پرسیاری لێ دەکەن کە پەروەردگارت کێ بوو؟ پێغەمبەرت کێ بوو؟ دینت چی بوو؟ قیبلەت کوێ بوو؟ وە هەروەها ئەو جۆرە پرسیارانە، کردنی ئەو پرسیارانەش لەلایەن دوو فریشتەوە ئەنجام دەدرێت کە ناویان (نكير، منكر)ە، وەك لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە[تر].

(11) وە ئیشێکی دیکەیان ئەوەیە کە خوای زاڵو بەهێز لەنێوبردنی گەلانی کافرو سەرکەشی بەوان ئەنجام داوە، بۆ نموونە: گەلی (لوط) ( سەلامی

(تر) بۆ نموونە ئەمە یەکێك لەو فەرموودانەیە: ﴿إن العبد اذا وضعَ في قَبْرِه وتولّى عنه أصحابه إنه ليسمع قرع نعالهم قال: يأتيه ملكان فَيُقْعِدانِه فيقولان له: ماكنت تقول في هذا الرجل؟.. ﴾ متفق عليه، (صحيح مسلم) برقم(2780)والبخاري برقم(1374).

خوای لەسەر بێ) وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُوا أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ﴾[تر].

(12) هەروەها ئیشێکی دیکەیان ئەوەیە کە نەفرین (لعنة) لە کافرانو ستەمکارانو گوناهباران دەکەن، بۆ نموونە:-

أ ـ کەسانێك کە ئایەتەکانی خوا دەشارنەوەو بە خەڵکییان ڕاناگەیەنن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِنْ بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾[ير].

ب ـ کەسانێك کە لەسەر کوفر دەمرن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾[□].

ج ـ ژنێك کە بەناهەق لە مێردەکەی لالووتو تووڕە دەبێو هەر چەند مێردەکەی بانگی دەکات، بەڵام وەڵامی ناداتەوەو بەدەنگییەوە ناچێو لەگەڵی ئاشت نابێتەوە، لەسەر ئەوە فەرموودە هەیە کە هەتا بەیانی فریشتەکان نەفرینی لێ دەکەن[ش].

د ـ کەسێك کە چەکەکەی ئاڕاستەی برای مسوڵمانی دەکاتو دەیترسێنێ[له].

هـ ـ کەسێك کە جنێو بە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بدات (خوا لێیان ڕازی بێت)،و بە خراپە باسیان بکات، وەك پێغەمبەر ﷺ

(تر) (العنكبوت □ 31).
(ير) (البقـرة □ 159).
(□) (البقـرة □ 161).
(□) رواه البخاري ومسلم، البخاري: برقم: (5193)، و مسلم : برقم: (1436).
(له) رواه مسـلم عن أبي هريرة.

فەرموویەتی: ((مَنْ سبَّ أصحابي فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين))[ تز] ، واتە: هەركەسێك جنێو بە هاوەڵانم بدات لەعنەتی خواو فریشتانو تێكڕای خەڵكی لـێبێ.

و ـ كەسێك كە نەهێڵێ شەرعی خوا جێبەجێ بكرێ، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ قَتَلَ عَمْداً فَقَوَدُ يَدَيْه فمن حال بينه و بينه فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين))[يه] ، واتە: هەركەسێك یەكێك بە ئەنقەست بكوژێت، دەبێ بكوژرێتەوە، جا هەركەسێك كە نەهێڵێ بكوژرێتەوە لەعنەتی خواو فریشتەكانو تێكڕای خەڵكی لەسەر بێت.

ز ـ هەركەسێك كەسێكی تاوانبار پەنا بداتو بیحەوێنێتەوە، ئەو كەسەش فریشتەكان لەعنەتی لـێ دەكەن، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((مَنْ أحدَث حَدَثاً أو آوى مُحْدِثاً فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين))[سه] ، واتە: هەركەسێك كەتنو تاوانێك بكات، یان تاوانبارێك بحەوێنێتەوەو پەنای بدات، (نەهێڵێ سزای شەرعی بەسەردا بدرێت) لەعنەتی خواو فریشتەكانو تێكڕای خەڵكی لەسەر بێت.

(13) وە ئیشێكی دیكەی فریشتەكان ئەوەیە كە عەرشی خوای پەروەردگار هەڵدەگرن، وەك خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾[] ، واتە: ئەو فریشتانەی كە عەرشی خوا هەڵدەگرنو لەدەوروبەری عەرشن، پاكی بۆ خوا دەردەبڕنو ستایشی

(تز) رواه الطبراني عن ابن عباس بسند حسن.

(يه) رواه النسائي وأبو داود وابن ماجه بسند صحيح عن ابن عباس.

() رواه داود والنسائي و حاكم.

() ( غافر 7 ).

دەکەن. وە لە ڕۆژی دواییشدا هەر فریشتەکان (عرش)ی خوا هەڵدەگرن وەك دەفەرموێ: ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾[1]، واتە: لەو ڕۆژەدا هەشت لە فریشتەکان عەرشی خوا هەڵدەگرن.

(14) وەکارێکی دیکەی گەورەو گرینگی فریشتەکان بە گشتیو بە تایبەتی ئەوانەیان کە عەرشو بارەگای خوا هەڵدەگرنو دەوریان داوە ئەوەیە کە دوعای خێر بۆ ئیمانداران دەکەنو داوای لێبوردنیان بۆ لە خوای بەخشندە دەکەن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا...﴾[2]، وە فەرموویەتی: ﴿...وَالْمَلَائِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَنْ فِي الْأَرْضِ أَلَا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾[3].

(15) وە چیاکان فریشتەی تایبەتی خۆیان هەیە کە بە فریشتەی چیاکان (مَلَك الجبال) ناوی هاتوە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێك لە (طائف) گەڕامەوە فریشتەی چیاکان هات بۆ لام، فەرمووی تۆ چۆنت پێ چاکە من ئاوا ئەو خەڵکە خراپەی (طائف) لەنێو دەبەم[4].

(16) وە هەندێ لە فریشتەکان سەرپەرشتی بارانو ڕووەك دەکەن کە میکائیل (میکال) سەرپەرشتی ئەوجۆرە فریشتانە دەکات وەك (الطبراني) لە (عبدالله بن عباس)و ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە.

---

[1] ( الحاقــة 17 ).
[2] ( غـافـر 7 ).
[3] ( الشورى 5 ).
[4] رواه البخاري و مسـلم.

ئەمـانە ژمـارەیەك بوون لە ئیش‌وكارەكانی فریشتەكانی خوا ( سبحانە وتعالــی).

## ( خـالّـی چـوارەم ) :

# پێویسـتە هـەڵوێسـتمان لەگــەڵ فریشـــتەکان دا چـۆن بێـت؟!

هەر بە کورتی دەڵێین: پێویستە هەڵوێستی ئێمە لەگەڵ فریشتەکان خوای پەروەردگاردا ئەوەبێ کە ڕێزیان بگرین‌و شەرمیان لێبکەین چونکە فریشتەکانی خوا زۆر بەڕێزن‌و بە فەرمانی خوا هەموو شتێك دەزانن، وە

هەموو شتێكیش تۆمار دەكەنو دەنووسنو ئاگاداری هەموو شتێكی شن، وە بۆ خۆشیان زۆر چاكەكارنو بەهیچ جۆرێك بێفەرمانی خوا نا كەن! ئن جا ئینسان دەبێ دڵنیاو مسۆگەربێ كە بەلای كە مەوە هەمیشەو دا یم دوو فریشتەی لەگەڵدان، جگە لەوانەی كە دەیپارێزن لە پێشەوەو لە پ شتەوە را، بۆیە پێویستە رێز یان ب گرینو بێ فەرمانی خوا نە كەین، وە شەرمیان لـێبكەینو هیچ شتێك نەكەین كە ببێتە هۆی دووركەوتنەوەیان لێ مان، وەك لە فەرموودەدا هاتوە كە: فریشتەكان ناچنە ژوورێك سەگی لـێ ب ێت یان بتو پەیكەری لـێ بێت: ((إنَّ الملائكة لاتَدخُلُ بيْتاً فيه كلْبٌ أو صورة))[1].

لە خاڵـی شەشەمیشدا چەند ئیشو كارێكی دی كەی فری شتەكان كە پەیوەستن بە ئەهلـی ئیمان ڕوون دەكەینەوە.



(1) رواه البخاري.

# (خـاڵـی پێـنجـەم) :

# نـاوی ژمـارەیەك لە فریشـتەكان




هەڵبەتە وەك باسمان كرد ژمارەی فریشتەكان یەكجار زۆرەو تەنیا خوا خۆی دەزانێ چەندن وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلاَّ هُوَ﴾(تر)، ناوی فریشتەكانیش جگە لە هەندێكیان ئەوانی دی ئێمە پێیان ئاشنا نین، چونكە نە خوای بەرزو مەزن لە قورئانداو نە پێغەمبەر ﷺ لە سوننەتی

(تر) ( المدثـر  31).

خۆیدا روونیان نەکردۆتەوە، کەواتە بۆ ئێمە پەنهانە، بەڵام ژمارە یەکیان لە قورئانو سوننەتدا ناویان هاتوە کە ئەمانەن:

(1) (جبـریل) (علیه السلام) کە ناوی لە چەند شوێنێکی قورئاندا هاتوە، وە لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا ﷺ ناوی هاتوە، پێشتریش باسمان کرد کە (جبـریل) (سەلامی خوای لەسەر بێ)، پەیام هێنەری خوا یە بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وە سەرۆکی فریشتەکانیشە، لە فەرموودەیەکدا هاتوە دە ڵێ: کاتێك خوای پەروەردگار فەرمانێك دەردەکاتو فەرمایشتێك دەفەرموێ، هەرچی (الملأ الأعلى)یە بێدەنگ دەبێو لە پێش هەموویاندا (جبـریل) سەر بەرزدەکاتەوە، پا شان فریشتەکانی دی تاکو فەرمانەکەی خوای مەزن وەربگرن، ئنجا ئاسمان بە ئاسمان دێتە خوار، تا دەگاتە ئاسمانی یەکەمو جێ بەجێ دە کرێ، جا (جبریل) (سەلامی خوای لەسەر بێ) کە سەرۆکی فریشتەکانو پەیام هێنەری خوایە بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، هەم بە (جبریل) ناوی لە قورئاندا هاتوە وەك فەرموویەتی: ﴿قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوّاً لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللهِ...﴾[1]، هەم بە (الروح) وەك خوا فەرموویەتی: ﴿تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ﴾[2]، وە هەم بە (الروح الأمین) وەك فەرموویەتی: ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ.عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ﴾[3]، وە هەم بە (الروح القُدُس) وەك فەرموویەتی: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ...﴾[4]

(1) ( البقرة 98 ).
(2) ( القـدر 4 ).
(3) ( الشعراء 193 ).
(4) ( النمـل 102)

(2) (میکال) کە لە قورئاندا بە (میکال) هاتوەو لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ بە (میکائیل) هاتوە، خوای مەزن فەرموویەتی: **﴿مَنْ كَانَ عَدُوّاً لِلَّهِ وَمَلائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ﴾**[1]، واتە: هەرکەسێك دوژمنی خواو فریشتەکانیو پێغەمبەرانیو (جبریل)و (میکال) بێت، ئەوە بێگومان خواش دوژمنی کافرانە، وە (عبدالله)ی کوڕی (عباس) (خوا لێیان ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە (جبریل)ی فەرمووە: ((على أيِّ شيءٍ ميكائيل؟ قال: على النَّبات والقَطْرِ)) واتە: میکائیل چی پێسپێرراوە؟ (جبریل) وەڵامی دایەوە کە میکائیل سەرپەرشتی ڕووەكو سەرپەرشتی بارانو ئاو دەکات، بە تەعبیرێکی دی: سەرپەرشتی بژێوو ڕۆزی دەکات[2].

(3) (إسرافیل)، کە ئەویش تەرخانکراوە بۆ فووکردن بە کەڕەنا (صور)دا، کەڕەناش جەستەیەکی زۆر گەورەیەو لە هەندێك شوێنەوار (أثر)دا دەڵێ: بەقەدەر ژمارەی دروستکراوەکان کونی تێدان.

جا هەندێ لە زانایان دەڵێن: دووجار فووی پێدا دەکات، جارێکیان کە بوون (وجود) هەمووی بەسەر یەکدا تێکدەچێت لە ئەنجامی ئەو فووەدا، بۆ جاری دووەم کە فووی پێدا دەکات، هەموو ئەوانەی کە مردوون زیندوو دەبنەوە هەندێکی دیکەش لە زانایان دەڵێن: سێ جار فووی پێدا دەکات، بەڵام وا پێدەچێت کە دوو جارە کە ڕاستتر بێت، وەك لەو ئایەتەکەشدا وا دەردەکەوێت: **﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ﴾**[3]،

---

[1] (البقرة 98).

[2] رواه الطبراني.

[3] (الزمر 68).

باسی ئەو دوو فووانە دەكات، كە بە هی یەكەم هەموو كەس دە مرێ، تەنیا ئەو كەسانە نەبێ كە خوا بیەوێ نەمرن، وە بەهی دووەم هەموویان زیندوو دەبنەوەو هەڵدەستنەوە. پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی (إ سرافیل) فەرموویەتی: ((كیف أنْعَمُ وصاحِبُ القَرْنِ قد ٱلْتَقَم القرْنَ وحَنى جَبْهَ تَه وٱنتَظَر أنْ يؤذَنَ لَهُ))[تر]، واتە: چۆن لەزەت بكەمو پشوو بدەم لەكاتێكدا كە خاوەنی كەڕەنا (قرن) ((كە مەبەست (إ سرافیل)ە)) كەڕەنایە كەی بەدەمەوە گرتوەو نێو چاوانیشی بەسەردا نوشتاندۆتوە، چاوەڕوانی ئەوە دەكات كە هەركاتێك فەرمانی پێ بكرێت (لەلایەن خوای پەروەردگارەوە) یەكسەر فووی پێدا بكات!

وە پێغەمبەر ﷺ لە پاڕانەوەدا كە بۆ شەو نوێژ هەستاوە ناوی ئەم سێ فریشتەیەی هێناوە: (جبـریل، میكائیل، اسرافیل) وەك فەرموو یەتی: ((أللهم رب جبريل و ميكائيل واسرافيل انت تحكم بين ع بادك في ما كانوا فيه يختلفون، أهدني لما إخْتُلِفَ فيه من الحق بأذنه، إنك تَهْدى مِنْ تشاء الى صراط مستقيم﴾[یر]، واتە: ئەی خوایە پەروەردگاری جیبر یلو میكائیلو ئیسرافیل، تۆ دادوەریی لە نێوان بەندەكانتدا دەكەی لەوەی كە تێیدا كەوتوونەتە كێشەوە، هیدایەتم بدە بۆ ئەوەی كە كێ شەو مشتومڕی تێكەوتوە كە حەق بپێكم، بێگومان تۆ هەركەسێكت بوێ ڕێنمایی دەكەی بۆ ڕێگای ڕاست.

(4) (مالك)، كە دۆزەخەوانەو سەرپەرشتی ئاگری دۆزەخ دەكات، وەك خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ﴾[]،

---

(تر) رواه أحمد والترمذي، بڕوانە (السلسة الصحيحة) للألباني ژمارە (1079).

(یر) رواه مسلم.

() ( الزخرف  77 ).

واتە: دۆزەخییەکان بانگ یان کرد: ئەی (ما لك) با پەروەردگارت کۆتاییمان پێ بێنێت (با بمانمرێنێو رزگارمان بێت لەو سزاو ئێشو ئازارەی کە تێیداین) گوتی: بێگومان ئێوە دەبێ بمێننەوە.

(5) (رضوان)، کە بەهەشتەوانە، (إبن کثیر) گوتوویەتی: ((و خازن الجـنَّة مَلَكٌ يُقالُ له (رِضوان) جاء مُصَرّحاً به فـي بعض الأحاديث))(تر)، وا تە: ئەوەی کە سەرپەرشتی بەهەشت دەکات فریشتەیەکە بە ناوی (رضوان)، کە لە چەند فەرموودەیەکدا ناوی بە ڕوونی هاتوە.

ئەمجا بێگومان هیچ کام لە: (مالك) کە دۆزەخەوانەو (ر ضوان) کە بەهەشتەوانە، بە تەنیا سەرپەرشتی دۆزەخو بەهە شت نا کەن، بەڵکو (مالك) خۆیو (نۆزدە) فریشتەی لەگەڵدایە، یاخود بە خۆ یەوە نۆزدە فریشتەن، وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ ۞ لا تُبْقِي وَلا تَذَرُ ۞ لَوَّاحَةٌ لِلْبَشَرِ ۞ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ۞ وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلاَّ مَلائِكَةً﴾(یر)، واتە: کێ بەتۆی گوتوە کە (سقر) چیە؟ ((سەقەر یەکێکە لە ناوەکانی ئاگری دۆزەخ، یان پلەیەکە لە پلەکانی دۆزەخ)) هیچ شتێك ناهێڵێتەوەو لە هیچ شتێکیش وازناهێنـ ێت کە نەی سووتێنێ، هەر بڵێسەکەی تەواو پێستی دەمو چاوی ئینـ سان هە ڵدەگرێ، کە نۆزدە فری شتەی لە سەرن، وە ئەوا نەی کە بە سەر دۆزەخ ڕادە گەن هەر فریشتەمان داناون.

(6)و (7) شەشەمو حەوتەم: دوو فریشەی دیکە کە ناو یان لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، بریتین لە: (المنکرو النکیر)، کە ئەوانیش ئەو دوو فریشتەیەن کە تایبەتن بە پرسیار لێکردنی هەرکەسێك کە دەمرێو

(تر) البـداية والنهاية: بەرگی/ 1، لاپەڕە (53).
(یر) ( المدثر – 27 ، 31 ).

دەخرێتە گۆڕەوە. وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((اذا قُبِرَ المَيِّتُ، (أو قال احدكم) أتاه مَلَكانِ أسودان أزْرَقان، يقال لأحدهما المُنْ كرَ و الآ خر النّكير﴾[تر]، واتە: ئەگەر مردوو نێژرا، (یان فەرمووی: یەکێکتان نێژرا) دوو فریشتەی ڕەشی شین، یاخود چاویان شینە دێنە لای، کە یەکێکیان ناوی (منکر)ەو ئەوی دیکەیان ناوی (نکیر)ە.

(8)و (9) هەشتەمو نۆیەم: کە لە قورئاندا ناویان هاتوە، بریتین لە(هاروتو ماروت) وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُوا الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنْزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلا تَكْفُرْ﴾[بر]، واتە: وە جوولەکەکان کەوتنە شوێنی ئەو جادووەی کە لە سەردەمی سولەیماندا شەیطانەکان دەیانخوێندەوە، ((چونکە جوولەکەکان پێیان وابوو کە سولەیمان شەیطانی بۆ دەستەمۆ کراونو ئیشو کاری پێکردوون، ئەو جادوو (سحر)ەی زانیوە!)) جا خوا دەفەرموێ: بێگومان سولێمان کافر نەبووەو کوفری نەکردوە، بەڵکو شەیطانەکان کافر بوون کە خەڵکیان فێری جادوو دەکرد، وە ئەوەیان فێری خەڵك دەکرد کە بۆ دوو فریشتەکان: (هاروت)و (ماروت) لە (بابل) دابەزیبوو، کە بە فەرمانی خوا ئەو دوو فریشتەیە دابەزێنران بۆئەوەی خەڵك فێری جادوو (سحر) بکەن، بۆ تاقیکردنەوەی

(تر) الترمذي و ابن أبي عاصم لە کتێبی (السنة)دا هێناویانە، وە (الآجرّي) لە (الشريعة) هێناویەتی، وە (أبن حبان) لە (صحيح)ی خۆی داهێناویەتی، بڕوانە (معارج القبول) بەرگی (3) لاپەڕە (730، 731)، وە ئەو فەرموودەیە (حسن)ە.
(بر) (البقـرة 102).

خەڵك، وە ئەوانە هیچ کەسیان فێر نەدەکرد مەگەر لە پێ شەوە پێ یان دەگوت: ئێمە بۆ تاقیکردنەوەین، خۆت کافر مەکەو فێر مە بە!، د یارە فریشتەکان لەسەر شێوەی ئینسان بوون‌و لە شوێنێك بوون، هەر کەسێك ویستبێتی فێری جادوو ببێت چووە بۆ لایان، بەڵام لە پێشەوە فریشتەکان پێیان گووتون: ئێمە فریشتەین‌و خوا ناردوینی بۆ تاقیکردنەوەی خەڵك جا خۆت کافر مەکەو جادو فێر مەبە، بەڵام ئەگەر هەر سوور بوو بێ لەسەر ئەوەی کە فێر ببێ، فێریان کردوەو خۆی کافر کردوە!.

(10) یەکێکی دیکەش لە فریشتە پایە بەرزەکان فریشەی مەرگ (مە لك الموت)ە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُمْ مَلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ...﴾[]، کە هەندێ لە زانایان بە (عِزْرائیل) یان ناو هێ ناوە[یر]و گیانکێ شانی درو ستکراوەکانی بەدە ستە بەهاوکاری زۆر یێك لە فریشتەکان، بەڵام شایانی باسە کە ناوی (عزرائیل) بۆ (مە لك ا لموت)وە ناوی (عَزازیل) بۆ (إبلیس) کە هەندێك دەڵێن ناوی (عزازیل)ە، ئەم دوو ناوانە نە لە قورئان‌و نە لە سوننەتدا نەهاتوون بەڵکو لە ئەهلی کیتاب وەرگیراون، بۆیە ئێمە ناتوانین نە بڵێین وایە نە بڵێ یـن واذ یە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((اذا حدَّثكم أهل الكتاب فلا تـ صدِّقوهم ولا تكذِّبوهم))[]، واتە: ئەگەر خاوەن کتێبە پێشووەکان شتێکیان بۆ باسکردن نە بڵێـن ڕاست دەکەن نە بڵ یـن درۆدە کەن! د یارە لـ یرەدا مەبەست ئەو شتانەیە کە جوولەکەو نە صرانییەکان با سیان دە کەن‌و لەگەڵ قورئان‌و سوننەت لە لایەك‌و عەقڵ‌و زاذ ست‌و واقیـعیش لە

(تر) ( السجدة  11 ).

(یر) ئەوانیش لە کتێبەکانی (أهل الکتـاب)یان وەرگرتوە.

() رواه مسـلم.

لایەکی دیکەوە تێك ناگیرێن، ئەگەرنا هەر شتێك هەڵەیی یە کەی دەرکەوت پێویستە رەت بکرێتەوە.

هەروەها وشەی (رقیب و عتید)یش کە لە سوورەتی (ق)دا هاتوون، هەندێك لە زانایان دەڵێن: ناوی ئەو دوو فریشتانەن کە لە سەر لای راستو چەپی ئینسانن‌و کردەوە چاكو خراپەکانی ئینسان دەنووسن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ ۞ مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾[1]، بەڵام ئەو رایە لاوازە، بەڵکو (رقیبو عتید) سیفەتی ئەو دوو فریشتانەیە، چونکە (رقیب) واتە: چاودێرو (عتید)یش واتە: ئامادە، ئەو دوو فریشتانەش هەمیشە چاودێرو ئامادەن بەسەر ئینسانەوە.

ئەوانەی باسمان کردن ناوی ئەو فریشتانە بوون کە ناویان لە قورئان‌و سوننەتدا هاتوەو زانراوەو رەنگە هەندێك ناوی دیکەش هەبن کە من ئێستا لە یادم نین.



[1] (ق) (ق - 17،18).

## ( خاڵی شەشەم ) :

# هەڵوێستی فریشتەکانو ڕەفتاریان لەگەڵ بڕواداراندا



بەڕێزان!

خوای کاربەجێ سروشتی ژیانی دنیای وا داناوە کە ئەگەر ئینسان ب یەوێ بەرەو خراپە بچێ، بتوانێو بوارو دەرفەتی هەبێ، وە ئەگەر بیەوێ بەرەو چاکە

بچێ دیسان بتوانێو بوارو دەرفەتی هەبێ، جا ئە گەر بەرەو خرا پە بۆ بچێ شەیطانەکان یارمەتی دەدەن، وە ئەگەر بەرەو چاکەش بۆ بچێ فری شتەکان یارمەتی دەدەن.

خوای بەرزو مەزن دەربارەی ئەوە کە شەیطانەکان دۆستو نزیکی کافرانن دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ﴾[1]، واتە: ئێمە شەیطانەکانمان کردوە بە دۆستی ئەوانەی کە ئیمان ناهێنن (واتە: هاو کارو دۆستیانن‌و شتیان فێر دەکەن).

ئنجا دەربارەی ئەوەش کە فریشتەکان دۆستی بڕوادارانن، خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلائِكَةُ﴾[2]، واتە: ئەوانەی کە دەڵێن پەروەدگارمان خوا یە، وە لە سەر ئەو ئیما نەش ڕاوەستاوو دامەزراون، فریشتەکان دادەبەزن بۆ لایان...

جا چ لێرەدا مەبەست پێی کاتی سەرە مەرگ بێت، وە چ مەبەست پێی هەرکاتێکی دیکە بێت، گرنگ ئەوە یە ئینسانی ئیما ندار فری شتەی لەگەڵدایەو شتی باشی فێر دەکات.

کەواتە کە جاری وایە بیرت بەلای شتێکی باشدا دەچێت‌و شتێکی با شت دەکەوێتەوە بیر، ئەوە بزانەکە فریشتەیە دەیخاتە نێو دڵ‌و مێ شکتەوە، وە کە جاری وایە بیرت بەلای شتێکی خراپ دا دەچێت، بزانە کە ئەوەش بە زۆری فیتــی شەیطانە دەیخاتە دڵ‌و مێشکتەوە.

جا بابزانین کە فریشتەکان ڕەفتارو هەڵس‌وکەوتیان لە گەڵ ئیماندارا ندا چۆنە؟!:

---

[1] ( الأعــراف 27 ).
[2] ( فصلت 30 ).

1 ـ فرێ شتەکان ئیما ندارانیان خۆش دەو یت: وەك پێغەمە بەر ﷺ فەرموویەتی: ((ان الله تبارك و تعالـى اذا أحبَّ عَبْداً نادى ج بـريل إنَّ الله قَدْ أحَبَّ فُلاناً فأحِبَّه، فيحبُّه جبـريل، ثم يُنادي جبـريل في السماء انَّ الله قد أحبَّ فلاناً فأحِبُّوه، فَيُحِبُّه أهلُ ال سماء ويُوْ ضَعُ له الق بولُ في الأرض))[تن]، واتە: هەرکاتێك خوای پایەدارو بەرز یەکێك لە بە ندەکانی خۆی خۆشویست، بانگی جیبریل دەکات، کە من فلان کە سم خۆش دەوێت، تۆش خۆشت بوێت، جا جیبـریلیش ئەو بەندەیەی خوای خۆش دەوێت، ئنجا جیبریل بانگی فریشتەکان دەکات کە خوا فلان بەندە یەی خۆش دەوێت، ئێوەش خۆشتان بوێت، فریشتەکانیش هەموویان خۆ شیان دەوێت، پاشان ڕەزامەندیی و قبوولـی بۆ دەخرێتە سەر زەو یش (وا تە: ئەوەی کە لەسەر زەویشە لە فریشتەکان و ئیما ندارانی ج ندو ئینسان ئەوانیش خۆشیان دەوێت، هەر کەسە بە ئەندازەی ئەو ئی مان و تەقواو مسوڵمانەتی یەی کە هەیەتی).

2 ـ ڕێ پێشاندان و دڵ و زمان بەرەو حەق وەرچەرخاندن و ڕا ست کردن: وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((مَنْ سألَ القَضاءَ وُكِّل الى نَفْسهِ ومَنْ أُجْ بِرِ عليه يُنَزِّلُ اللهَ عليه مَلَكاً فَيُسَدِّدُهُ))[یە]، واتە: هەر کە سێك بۆ خۆی داوای دادوەریی بکات ئەوە حەواڵەی خۆی دەکرێ، بەڵام هەر کە سێك داوای لـێ بکرێت و فشاری لـێ بکرێت، خوا فریشتەیەکی بۆ دەنێرێ تە خوارو دڵ و زمانی ڕاست دەکات و بەرەو حەق وەری دەچەرخێنێ.

ئنجا ئەوە نەك هەر بۆ دادوەریی (الق ضاء)، بەڵکو هەموو جۆرە بەرپرسیاری یەك، ئەگەر مسوڵمانان داوات لـێ بکەن و پێت بسپێرن ئەوە

(تن) رواه البخاري و مسلم عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

(یە) رواه الترمذي و أبن ماجه.

لەلایەن خواوە یارمەتی دەدرێی لەسەری، بەڵام کە خۆت داوای بکەی، حەواڵەی خۆت دەکرێی، وەك لە فەرموودەی دیکەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووەو (بخاري‌و مسلم) گێڕاویانەتەوە.

3 ـ داوای لێبوردن کردن بۆ بڕواداران‌و سەڵاوات لەسەر دانیان:

أ ـ وەك خوای مەزن لەوبارەوە فەرمووویەتی: ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَ مَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾(تر)، واتە: ئەوانەی کە عەرشی خوا هەڵدەگرن‌و ئەوانەش کە لە دەورەیان، خوا بەپاك دەگرن‌و ستایشی دەکەن، وە بۆ ئەوانەی کە بڕوادارن داوای لێبوردن دەکەن. وە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾(یر)، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە خۆی‌و فریشتەکانی صەڵاوەت لەسەرتان لێ دەدەن، بۆ ئەوەی لە تاریکاییەکان دەرتانبێنن بەرەو ڕۆشنایی، (صلاة)یش لێرەدا واتە: ئەی خوا بەزەییت بە فلان کەس دابێت، وەزعی چاك بکەی‌و لێی ببووری‌و پلەی بەرزبکەیەوە.

دیارە مانای (صلاة) ناردنیش لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە، لە خواوە بۆ سەر ئێمە، ئەوەیە کە خوا بۆ خۆی بەزەیی‌یە کە دەنێرێ‌و پلە بەرزکردنەوەکە دەنێرێ، هی فریشتەکانیش ئەوەیە کە لە خوا داوای دەکەن بۆ ئیمانداران، هی ئێمەش ئەوەیە کە لە خوا داوا دەکەین پلەی پێغەمبەر ﷺ بەرز بکاتەوەو مەدح‌و سەنای بکات.

ب ـ هەروەها فریشتەکان سەڵەوات لە کەسێك دەدەن کە چاکە فێری خەڵك بکات، هەرکەسێك قورئان‌و سوننەت‌و چاکەی دین‌و دونیایان

(تر) ( غافر – 7 ).

(یر) ( الأحزاب – 43 ).

فێر بكات، فریشتەكان دوعای بۆ دەكەن، وەك پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: ((ان الله وملئكته حتى النَّملة في جُحْرِها وحتَّى الحُوت في البَحْرِ لَيُصَلُّون على مُعَلِّم الناسِ الخَيْر))[تر]، واتە: بێگومان خواو فریشتەكانو تەنانەت مێرووله له شاره مێروولەی خۆیدا، وه ماسی له دەریادا، دوعا دەكەن بۆ كەسێك كه خێرو چاكە فێری خەڵك دەكات.

ج ـ دیسان فریشتەكان دووعا بۆ كەسێك دەكەن كه دەچێتە مزگەوتەكان بۆ نوێژ، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: ((إنَّ الملئكة تُصَلِّي على الذي يأتي المسجد للصلاة فتقول: أللَّهُمّ صَلِّ عليه أللّهم ارْحَمْهُ، ما لَمْ يُؤْذِ فيه وما لَمْ يُحْدِثْ فيه))[یر]، واتە: فریشتەكان سەڵەوات لەسەر كەسێك دەدەن كه دەچێتە مزگەوت بۆ نوێژ، دەڵێن: خوایە سەلاواتی لێ بدە، خوایە بەزەییت پێی دابێت، بەمەرجێك له مزگەوت ئازاری كەس نەدات و، هەتا بەدەست نوێژەوە بێت.

د ـ وە فریشتەكان سەڵەوات دەدەنو دووعا دەكەن بۆ كەسانێك كه له ڕیزی پێشەوەی نوێژدا ڕادەوەستن، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ان الله وملئكته يُصَلُّون على الصف الأول))[سر]، واتە: خواو فریشتەكانی سەڵەوات لەسەر ڕیزی پێشەوە دەدەن.

هـ ـ هەروەها خواو فریشتەكانی سەڵەوات دەدەن له سەر كەسانێك كه ڕیزێك نەگەیەنراوە، بیگەیەنن، یان بۆشایی یەك له ڕیزێكدا هەیە پڕی بكەنەوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((إنَّ الله تعالى وَملئكته يُصَلُّون على الذين يَصِلُونَ الصُّفوف ومَنْ سَدَّ فُرْجَةً رَفَعَهُ الله

(تر) رواه الطبراني والترمذي باسناد صحيح عن أبي أمامه.
(یر) رواه مسلم.
(سر) رواه أحمد و أبو داود و أبن ماجه عن البراء وهو صحيح.

بِها دَرَجَةً))[٤٣]، واتە: خوای مەزنو فریشتەکانی سەڵەوات دەدەن لەسەر کەسانێك کە ڕیزەکان دەگەیەننە یەك، وە هەرکەسێك کە بۆشاییو کەلێنێك پڕبکاتەوە، خوای مەزن پلەیەك بەرزی دەکاتەوە.

و ـ هەروەها خواو فریشتەکانی سەڵەوات دەدەن لە سەر کە سانێك کە پارشێو دە کەن، وەك پێغەمـ بەر ﷺ دە فەرمویّ: ﴿ان الله تـ عالی و ملائکته یُصَلُّون علی المتَسَحِّرِین﴾[٤٤].

ز ـ دیسان فریشتەکان سەڵەوات دەدەنو دووعا دەکەن بۆ هەرکەسێك کە سەردانی برایەکی مسوڵمانی، یان خوشکێکی مسوڵمانی دەکات کە نەخۆشە، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: ((ما من امريء مـ سلمٍ یـ عود مسلماً الا ابْتَعَث الله سبعين الف مَلَكٍ یُـ صَلُّون علـ يه في أي ساعاتِ النّهار كان حتَّی یُمسْي وفي أيِّ ساعاتِ الليل كان حـ تّی یُـ صْبِح))[٤٥]، واتە: هەر مسوڵمانێك سەردانی مسوڵمانێك بکات لەبەر نەخۆشکەوتنی، خوا حەفتا هەزار فریشتە دەنێریّ، دووعای بۆ دەکەن لە هەر سەعاتێکی ڕۆژدا بێت تا دەبێتە ئێوارە، وە لە هەر سەعاتێکی شەودا بـ ێت تا دەبێتە بەیانی.

4 ـ گوتنی (آمین) لەکاتی دوو عای مـ سوڵماناندا: وەك پێغەمـ بەر ﷺ دەفەرمویّ: ((اذا أمَنَّ الأمامُ فأمِّنوا فأنَّ مَنْ وافَق تأْمِينَ الملائکة غُفِرَ لَه ما تقدَّمُ مِنْ ذَنْبِه))﴾[٤٦]، واتە: هەرکاتێك پێش نو ێژ (إ مام) ئامینی کرد، ئێوەش لێی دوا مەکەونو لە گەڵ ئەودا ئامین بـ ڵێن، چونکە

---

(٤٣) رواه أحمد وابن ماجه و الحکم بسند حسن عن عائشة (رضي الله عنها).

(٤٤) رواه الطبراني وابن حبان بسند حسن عن ابن عمر (رضي الله عنهما).

(٤٥) رواه ابن حبان بسند صحيح.

(٤٦) رواه البخاري و مسلم.

هەرکەسێك گوتنی ئامینەکەی لەگەڵ هی فریشتەکاندا یەك بکەوێتەوە، خوا لە گوناهی ڕابردووی دەبووریێ.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((دَعْوَةُ المَرْأ مُستجابَةٌ لأخيه بِظَهْرِ الغَيْبِ عند رأسه مَلَكٌ يقولُ: اللَّهُم وَلَهُ بِمِثْلِه)) [تر]، کەواتە هەرکەسێك لە کاتێکی نادیارو پەنهاندا دوعا بۆ مسولّمانێك بکات، فریشتەکانیش ئامینی بۆ دەڵێن.

5 ـ بەشداریی‌کردنی فریشتەکان لە کۆڕی زانستو کۆڕی زیکرو فیکردا: وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ لِلّهِ تبارك و تعالى ملائكة يطوفون في الطّرق يَلْتَمسون أهل الذكر فأذا وَجدوا قوماً يذكرون الله تعالى تنادَوْا: هَلُمُّوا الى حاجتكم، قال: فَيَحُفُّونَهُم بِأجْنِحتِهم الى السَّماءِ الدُّنيا)) [یر]، واتە: خوای باڵاو بەرز چەند فریشتەیەکی هەن تەرخانی کردوون بۆ گەڕان لە زەویدا بۆ ئەوەی بزانن کێ زیکری خوا دەکات، جا هەر کاتێك کۆڕو دانیشتنێك ببینن کە یادی خوا دەکەن (وە باسی حەڵاڵو حەرام دەکەنو خەریکی لێکۆڵینەوەی زانیاری شەرعیینو قورئانو سوننەت دەتوێژنەوە، کە ئەوەش هەر کۆڕی زیکرە) بێ‌گومان فریشتەکان بانگی یەکتر دەکەن کە وەرن ئەوەی لێی دەگەڕان دۆزیمانەوە، وە بە باڵەکانیان دەوریان دەدەن تاکو سنووری ئاسمانی یەکەم.

6 ـ تۆمارکردنی ناوی ئەو کەسانەی کە دەچن بۆ نوێژی جومعە: وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((اذا كان يوم الجمعة كان على كل باب منْ أبواب المسجد ملائكة يكتبون الأوَّل فالأوَّل، فأذا جَلَس الأمامُ طَوَواْ

(تر) رواه ابن ماجه عن أبي الدرداء (رضي الله عنه).

(یر) رواه البخاري و مسلم عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

صُحُفَهُمْ وجاءوا يستمعون الذِّكر))(تۆ)، واتە: لە ڕۆژی جومعەدا لە پێش هەر دەرگایەکی مزگەوت فریشتە هەن، ئەو کەسانەی دێن بۆ مزگەوت کامەیان پێشتر دێت ناوی تۆمار دەکەن، هەتا کە ئیمام هات‌و لە سەر مینبەر دانیشت، ئەوانیش تۆمارەکانیان دەپێچنەوەو گوێ دەگرن بۆ ئەو وتارەو ئەو زیکرو قسە خێرانەی دەکرێن.

7 ـ هاتنە خوارەوەی فریشتەکان لەکاتی قورئان خوێندنی ئینسانی مسوڵماندا: هەرکاتێك ئینسانی مسوڵمان قورئانی خوێند، هەتا زیاتر بە دڵ‌و بیر لێ‌کردنەوەو ترس‌و سامەوە بیخوێنێ، وە بە ڕەچاوکردنی مەرجەکانی قورئان خوێندنەوە بیخوێنێ، بێ‌گومان فریشتەکان زیاتر دەوری دەدەن، وەك لە فەرموودەیەکدا هاتوە، دەڵێ: جارێکیان (أُسَيْد بن حُضَيْر) کە یەکێکە لە هاوەڵە بەڕێزەکان، ئەسپەکەشی لای خۆی بەستبۆوە، کوڕێکی بچووکیشی هەبوو بە ناوی (يَحْيى)و لە نزیك ئەو شوێنە ڕاکشابوو، خۆی دەڵێ: قورئانم دەخوێند لەوکاتەدا ئەسپەکەم ڕاپەری، منیش سەرنجمدا هیچ شتێك دیار نەبوو، دیسان دەستم بە خوێندن کردەوە، دوو سێ جار ئەسپەکەم ڕاپەڕییەوە، دوایی سەرم بەرزکردەوە، بینینم چەند شتێك وەك چرا لە ئاسمانەوە لە ئاستی سەرم وەستا بوون، دەڵێ: منیش هەر بەردەوام بووم لەسەر خوێندنەکەم، بەڵام مەترسی ئەوەم هەبوو کە نەبادا ئەسپەکە زیان بە کوڕەکەم بگەیەنێ، دوایی بۆ پێغەمبەری دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ یش پێی دەفەرموێ: ئەی ئوسەیدی کوڕی حوضەیر بخوێنە، بخوێنە، ئەوە فریشتەکانی خوا بوون، هاتوون گوێیان لێ گرتووی(یر).

(تۆ) رواه البخاري عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

(یر) رواه البخاري ومسلم عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه)، البخاري برقم (5018) و مسلم برقم: 796.

8 ـ گەیاندنی سەلامی مسولْمانان بە پێغەمبەر ﷺ: وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: ((انَّ لله ملائكة سيّاحين يُبلِّغوني عن أُمَّتي السَّلام))(تر)، واتە: خوا چەند فریشتەیەکی گەڕۆکی هەن، سەلامی ئۆمەتەکەم بە من دەگەیەنن، (هەرکەسێك سەلامم بۆ بنێرێ پێم دەگەیەنن).

9 ـ هاوکاری کردنی مسولْمانان لەکاتی جەنگو جیهاددا: خوای بەرزو مەزن لە چەند شوێنێك دا ئامـاژەی بەوە کردوە، بۆ وێنە فەرمـوو یەتی: ﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾(یر)، واتە: کاتێك بە کوڵ لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە ئەویش وەڵامی دانەوە کە من پشتی ئێوە دەگرمو هاوکاریتان دەکەم بە هۆی هەزار لە فریشتەکانم، کە بە دوای یەکتـردا دێن.

وە فریشتەکان لە جەنگی (بەدر)دا بەشداریان کردوە، وە نازانین کە لە چەند جەنگی دیکەشدا بەشداریان کردوە، بەڵام لە هەر جەنگێکدا کە مسولْمانان بە ڕاستی بۆ خوایان بووبێو بۆ خوا بیکەن لە ئێستاو داهاتووشدا، بە ئەندازەی ئیخلاصو تەقواو پابەندبوونیان بە شەرعەوە، فریشتەکان بەشدارییان تێداکردوەو دەیکەن، ئەوەش ڕای تێکڕای زانایانە کە بەشداریی‌و هاوکاریی فریشتەکان تەنیا تایبەت نەبووە بە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ.

(10) لە سەرەمەرگدا موژدەی خۆش بە مسولْمانان دەدەن: وە خوای بەرزەیی فەموویەتی: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلائِكَةُ أَلاَّ تَخَافُوا وَلا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ۞ نَحْنُ

(تر) رواه النسائي عن ابن مسعود رضي الله عنه.
(یر) ( الأنفـال – 9 ).

أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ...﴾(ت)، واتە: بێگومان ئەوانەی کە گوتوویانە پەروەردگارمان خوایە وە لەسەر ئەوە ڕاوەستاوو بەردەوامیش بوون، فریشتەکان دادەبەزنە سەریان و پێیان دەڵێن- کە مەترسن و پەژارەتان نەبێ، وە موژدەتان لێبێ و دڵخۆش بن بەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێ دەدرا ئێمە دۆست و پشتیوانتانین لە ژیانی دنیاو لە دوارۆژیشــدا...

11 ـ بەشداریی جەنازەی مسوڵمان دەکەن: مسوڵمان کە دەمرێ، بە ئەندازەی ئەوەی کە ئیمان و تەقوای هەیە، فریشتەکانیش بەشداری جەنازەکەی دەکەن، وەك پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (سعد بن مُعاذ) کە یەکێکە لە هاوەڵە گەورەکانی پێغەمبەر (خوا لێی ڕازی بێت)، فەرموویەتی: ((هذا الّذي تحرَّك له العرْشُ وفُتِحَتْ له أبواب السماء وشهِدَه سبعون ألفاً مِنَ الملائكة لَقَدْ ضُمَّ ضَمَّةً ثم فُرِجَ عنه))(یر)، واتە: ئەم (پیاو)ە عەرشی خوا بۆی لەرزی (بۆ مردنەکەی) وە دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرانەوە، وە حەفتاهەزار لە فریشتەکان ئامادەی جەنازەکەی بوون، لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕەکەی لێی هاتەوە یەك و گوشی، بەڵام دوایی زوو بەریدا.

واتە (گۆڕە وشار) بۆ هەموو کەسێك هەیە، بەڵام هەندێ لە زانایان دەڵێن: جگە لە شەهیدانی ڕێی خوا، چونکە هەندێ فەرموودە، لەسەر ئەوە هەن کە ئەوان گۆڕەو شار نادرێن.

(تر) (فصلت – 30،31).
(یر) رواه النسائي عن أبن عمر بسندٍ صحيح (رضي الله عنهما).

بەڵام دیارە ئەوەی کە ئیماندارو چاکەکار بێت بەسووکی گۆڕەو شار دەدەرێ، ئەوەش کە کافر بێ وەزعی زۆر خراپە، هەم لە گۆڕەو شاردان وە هەم لە سزاو ئازاری دیکەی گۆڕو جیهانی بەرزەخو قیامەت دا.

12 ـ سێبەر کردنیان بە باڵەکانیان لە ئینسانی شەهید: (جابر بن عبدالله الأنصاري) (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێك بابم شەهید بوو، لە جەنگی (ئوحود)دا، جەنازەکەیان درێژ کردبوو، منیش هەموو جارێ لەسەر دەمو چاویم هەڵدەدایەوەو تەماشام دەکردو دەگریام، ئەوانەی لە دەورم بوون، دەیانگووت: مەگری، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو و نەیدەگوت مەگری، وە فاطمەی پوورم، خوشکی بابم دەگریا، ئنجا پێغەمبەریش فەرمووی: ((تبكين أو لا تبكين مازالت الملائكة تُظِلُّه بِأجْنِحَتها حتّى رَفَعْتُموه))(۱)، واتە: بگری یان نەگری، هەتا جەنازەکەتان بەرزکردەوە فریشتەکان بە باڵی خۆیان سێبەریان لێ کردبوو.



(۱) رواه البخاري عن جابر بن عبدالله الأنصاري (رضي الله عنهما).

# ( خاڵـی حـەوتـەم ) :

# ئایـا ئینســان گـەورەترە، یان فریشــتە؟!



که دەگوترێ ئینسان گەورەترە یان فریشتە، ئینسانی کافرو گوناحبارو دەغەڵو لاڕێ، ناگرێتەوەو ئەمانەی لێ هەڵاوێردراون، چونکە دەربارەی ئەوان خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿أُولَئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ﴾[1]، واتە: ئەوانە

(1) ( البِّینــة 6 ) .

خراپتــرین گیاندارن، وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللهِ الَّذِينَ كَ فَرُوا فَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾[ ]، واتە: بێگومان خراپترین زیندەوەر ئەوانەن کە بێبڕوان‌و بڕوا ناهێنن. کەواتە: چینی بێبڕوا ئەوە هیچ، بەڵام ئایا ئینسانی مسوڵمان‌و ئیماندار گەورەترە، یاخود فریشتە؟.

زانایان م شت‌ومڕو ڕاج یایی یان هە یە لەوەدا، بەڵام با سەیری بەڵگەکانیان بکەین: ئەوانەیان کە دەڵێن: ئینسانی مسوڵمان لە فری شتە گەورەترە کە منیش ڕای ئەمانم پێ ڕاست ترە ئەم بەڵگانەیان هێناونەوە:

(1) سەجدە بردنی هەموو فریشتەکان بۆ (ئادەم) کە بابی مرۆڤەکانە.

(2) کاتێك کە خوای کاربەجێ بە فریشتەکان‌و بە ئیبلیسی فەرموو: سەجدە بۆ ئادەم بەرن، ئیبلیس گوتی: ﴿أَرَأَيْتَكَ هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ﴾[ ]، واتە: ئایا ئەمە دەبینی کە بەسەر مندا بەرزت کردۆتەوەو ڕێزت لــێ‌گرتوە!.

جا دیارە ئیبلیسیش پێش ئەوەی ئەو بێفەرمانی یە ب کات لە ر یزی فریشتان بووە، کەواتە کە گوتوویەتی: ﴿كَرَّمْتَ عَ لَيَّ﴾ د یارە بە سەر ئەوانەش کە لەگەڵیاندا بووە کە فریشتەکانن، بەسەر وانیشدا هەر ڕێزی لــێ‌گرتوەو بەرزی کردۆتەوە!

(3) کاتێك کە خوای پەروەردگار بە ئیبلیس دەفەرمووێ: ﴿يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾[ ]، واتە: ئەی ئیبلیس چ شتێك ڕێگەی لــێ گرتی کە سەجدە بەری بۆ کەسێك کە بە دوو دەستی خۆم خوڵقاندوومە؟! بەڵام بە فریشتەکانی نەفەرمووە: بە دوو دەستی خۆم خوڵقاندوومن! جا

(تر) (الأنفــال [ ] 55).
(یر) (الأسـراء [ ] 62).
( ) (ص - 75).

ئەو دوو دەستە، چ مەبەست پێ یان دوو سیفەتی خوای مەزن بێت، بەوجۆرە کە لە خوا دەوەشێنەوە، وەك زۆر لە زانایان دەڵێن، وە چ مەبەست پێیان ئەوەبێت کە: بە شێوەیەکی تایبەتی خوڵقاندوومە، کە هەندێکیان وای تەفسیر دەکەن، هەرکامێکیان بێت، دیارە تایبەتمەندییەك لە دروستکردنی ئادەمدا هەیە، کە لە فرێ شتەو لە دروستکراوەکانی دیکەدا نیە.

(4) خوای پەروەردگار بە (ئادەم)ی فەرمووە (خليفة) وەك دەفەرموێ: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾[] ، واتە: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم. ئەو ڕاو بۆچوونەش کە دەڵێ: مەبەست جێنشینی (جن)ە، یان جێنشینی شتێکی دیکەیە، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، چونکە ئەگەر ئینسان جێنشینی (جن) بوایە دەبوو (جن) لەسەر زەوی نەمابان، بەلام (جن) هەر هەنو ئێمەش هەر هەین لەسەر زەوی، کەواتە ئێمە جێنشینی ئەوان نین، بەڵکو ئێمە جێنشینی خوای مەزنین، بۆ ئەوەی کە شەریعەتی خوا لەسەر زەوی خوا جێبەجێ بکەین[یر].

(5) ئادەم زانیاری (علم)ێکی پێ بووە، کە فریشتەکان پێیان نەبووە. وەك لە ئایەتەکانی سوورەتی (البقرة)دا هاتووە، وە خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ!﴾[]، واتە: ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن یەکسانن؟

---

(تر) ( البقـرة [] 30 ).

(یر) لە چەند کتێبێکمدا بە درێژی باسی چۆنیەتی و بەڵگەی جێنشین بوونی ئادەمو وەچەکەیم کردوە بۆ خوای بەرزو بێوێنە، بڕوانە: ( چەند مەسەلەیەکی ناوی سەردەم) . مافی مرۆڤـ ..

([]) ( الزمـر – 9 ).

کەواتە مادام ئادەم زانیاری یەکی بووە، کە فریشتەکان نیانە، دەبێ لەگەڵ واندا نەچێتە تەرازووەوە!.

(6) طاعەتی ئینسان بە ئیرادەی خۆیەتی، بەڵام طاعەتی فریشتەکان بەبێ ئیرادەی خۆیانە، واتە ئەوان هیچ زەحمەتیان نیە، بەڵام ئینسان دەبێ خۆی زەحمەت بدات‌و پێ لە ئارەزووەکانی خۆی بنێت‌و کۆسپ‌و پەرچ ببرێت، ئەو جار دەتوانێ خوا لە خۆی ڕازی بکات.

(7) (بشـــر بن شخاف) دەڵێ: ڕۆژێکی جومعە لە مزگەوت دانیشتبووین، (عبدالله بن سلام)یش (خوا لێی ڕازی بێ) کە لەلامان دانیشتبوو گوتی: ((إِنَّ أعْظَم أيام الدُّنيا يوم الجُمعة فيه خُلِقَ آدَمُ، وفيه تَقومُ الساعة، وإِنَّ أكْرَمَ خليقة الله على الله أبو القاسِمِ ﷺ))، واتە: گەورەترین ڕۆژی دونیا ڕۆژی جومعەیە، کە (ئادەم)ی تێدا دروست کراوەو هەر لەو ڕۆژە شدا دونیا کۆتایی پێدێت، وە گەورەترین‌و بەڕێزترین درو ستکراوی خوا لای خوا (أبو القاسم)ە (محمد) - سەڵات‌و سەلامی خوای لەسەر بێ-.

دەڵێ: منیش گوتم: (يرحمك الله فأيْن الملائكة) واتە: خوا رە حمت پێ بکات، چۆن دەڵێـــی: گەورەترین دروستکراوی خوا پێغەمبەرە ﷺ، ئەدی فریشتەکان لە کوێن؟! ((قال: فَنَظَر اليَّ وضحِكَ وقال يا ابْنَ أخي هَلْ تدري ما الملائكة؟! أنّما الملائكة خَلْقٌ كَخَلْقِ السماء والأرض والرِّياح والسَّحاب وسائر الخَلْقِ الذي لا يعصي الله شَيْئاً))[تر]، دەڵێ: ئەویش سەیری کردم‌و پێکەنی‌و گوتی: برازای خۆم دەزانی فریشتەکانی خوا

(تر) رواه ابن ماجه عن أبن عمر، وصححه الحكم و وافقه الذهبي.

چۆنن؟ فریشتەکان وەك ئاسمانو زەویو باوەڕو دروستکراوەکانی دیکەی خوان، کە لە فەرمانەکانی خوادەرناچن.

دیارە ئەو زانایانەش کە دەڵێن فریشتەکان گەورەترن، چەند بەڵگەیەك دەهێننەوە، بەڵام بەڕاستی بەڵگەکانیان بەهێز نین، لەوانە: دەڵێن: خوای بەرزو مەزن لەبارەی فریشتەکانەوە فەرموویەتی: ﴿بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ﴾[1]، واتە: بەڵکو ئەوان بەندەی ڕێز لێگیراوی خوان، وە فەرموویەتی: ﴿لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ﴾[2]، واتە: سەرپێچی لە فەرمانی خوا ناکەن، هەروەها بە نوێنەری بەڕێزو چاکەکاری پێناسەی کردوون: ﴿بِأَيْدِي سَفَرَةٍ. كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾[3]، وە فەرموویەتی: ﴿لَنْ يَسْتَنْكِفَ الْمَسِيحُ أَنْ يَكُونَ عَبْداً لِلَّهِ وَلا الْمَلائِكَةُ الْمُقَرَّبُونَ﴾[4]، واتە: نە مەسیح (عیسای کوڕی مریەم) - سەلامی خوای لێبێ- خۆی بەزل دەگرێ، کە بەندەی خوا بێو خوا بپەرستێ، وە نە فریشتە بەڕێزەکانیش، ئەوانەی کە زۆر لە خوا نزیکن.

جا دەڵێن: لێرەدا فریشتە لە خوا نزیکەکان، خراونە سەرووی (عیسا)وە - سەلامی خوای لێبێ-، کەواتە لەو بەرزترو بەڕێزترن!

بەڵام وەکو گوتم زیاتر ڕاوبۆچوونی یەکەم بەهێزترە ئەو ڕایەی کە دەڵێ مسوڵمانان بەگشتی لە فریشتەکان بەگشتی گەورەترن، وە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لە فریشتە تایبەتییەکانی وەك (جبريل، ميكائيل، إسرافيل)و ئەوانی دیکە کە ناودارن، گەورەترن، هەر خواش زاناو کاربەجێیە.

---

[1] ( الأنبياء - 26 ).
[2] ( التحريم - 6 ).
[3] ( عبس - 15،16 ) .
[4] ( النساء - 172 ).

# (خاڵی هەشتەم):

## کورتە پێناسەیەکی جند (جِنّ)و شەیطان

وشەی (جن) لە زمانی عەرەبیدا واتە: شێردراوە، پەنهان، ( جَنّ عليه اللَّيْلُ) واتە: شەوگار دایپۆشی، (جنين) کۆرپە، بۆیە ئەم ناوەی لێ نراوە، چونکە لە مندالّدانی دایکیدا پەنهانە، شێتیش بۆیە پێی دەگوترێ (مجنون)،

چونکە عەقڵی داپۆشراوە، (جَنانْ)یش واتە: دڵ، چونکە پەنهانە، (جَنّة)ش باغە، چونکە باغ چڕوپڕەو شت دادەپۆشێ.

وشەی (شیطان)یش لە وشەی (شَطَنْ)ەوە هاتوە، کە بە گوریسێکی درێژ دەگوترێ، وە دەگوترێ: (بِئْرٌ شَطونٌ) واتە: بنەکەی زۆر قووڵە، وە دەگوترێ (شَطَنَ) واتە: (بَعُدَ) دوورکەوتەوە، (وأشْطَنَهُ) واتە: (أبْعَدَهُ) دووری خستەوە، (شیطان)یش (فَیْعال)ە لە (شطن، أي، بَعُدَ) واتە: زۆر لە خوا دوور[تر].

ئێستاش دوای ئەم پێناسە زمانەوانییە با لە چەند خاڵێکی گوشراودا باسی (جن) بە گشتیو (شیطان) بە تایبەت بکەین:

(1) ماددەی دروستکردنی (جن): پێشتر باسمان کرد کە (جن) لە ئاگر دروست بوون، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ مِنْ نَارِ السَّمُومِ﴾[یر]، واتە: پێش ئینسان (جن)مان لە ئاگرێکی سووتێنەر، دروست کردبوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە (جن) پێش ئینسان دروست بوون.

(2) جند (جِنّ) بۆچی دروست بوون؟!

لە وەڵام دا دەڵێیـن:

ئینسان بۆچی دروست بووە، بێگومان جندیش هەر بۆ ئەو مەبەستە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[]، واتە: وە جندو مرۆڤم بەس بۆ ئەوە دروست کردوون کە بەندایەتی من بکەنو بمپەرستن.

---

(تر) لسان العرب: بەرگی (7) لاپەڕە (120،121) .
(یر) ( الحجر 27 ).
() ( الذاریات 56 ).

(3) جۆرەکانی جند: پێغەمبەر ﷺ دە فەرمویٚ: ((ا لجن ثلا ثة أ صناف، فَصنْفٌ يطيــرُ في الهواء، و صنْفٌ حَ يـَّاتٌ و كِلابٌ، و صِنْفٌ يَحِ لُّون و يَظْعَنون))[تر]، واتە: (جن) سیٚ بەشــن، بەشێکیان بە هەوادا دەفڕن ﴿کە پێیان دەڵێن: (الجن الطيّار)﴾ وە بەشێکیان مارو ســەگن (وا تە: دە چنە سەر شێوەی مارو سەگ) ((وەك لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە کە گەنجێکی هاوەڵ (صحابي) مارێکیان لەنێو ماڵدا دە بیٚو هاو سەرەکەی لەبەر مارەکە ناوێرێت بچێتــەوە ژووریٚ، گەنجەکە کە دەچێتەوەو مارە کە دەبینێت یەکسەر ڕمێکی لــیٚدەدات، مارەکەش خۆی پ ێدا دەداتو ڕاوی (أبو سعيد الخــدري) دەڵیٚ نەمانزانی کە ئایا گەنجەکە لەپێ شدا گ یانی دەرچوو، یاخود مارەکە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکامێکتان ماری لە ماڵی خۆیدا بینی، با سیٚ ڕۆژان دەنگی بدات، نەبادا جند بێت، جا ئەگەر هەر دەرنەچوو ئەوە شەیطانەو پاش دەنگدران خوێنی دەکەوێ تە سەرخۆیو ئەگەر کوشتی شی زەرەری لــیٚ نادات))[یر]،بەشێکی شیان ئەوانەن کە وەك ئینسان دەژینو دەڕۆنو دەچنو بار دە خەنو گەرمێنو کوێستان دەکەن.

(4) بەڵگەی هەبوونی جند (جن):

هەڵبەتە ئەوەی بڕوای بە هەبوونی (جن) نەبیٚ پ ێی کــافر دە بیٚ، لەبەر ئەوەی کە سوورەتێکی قورئان بە ناوی (ا لجن)ەو با سی ( جن) دەکات، کە لە سەرەتای سوورەتەکەوە دەفەرمویٚ: ﴿**قُلْ أُو حِيَ إِ لَيَّ أَ نَّهُ**

---

(تر) رواه الطبراني و الحاكم و البيهقي بإســناد صحيح.

(یر) بڕوانە: (صحيح مسلم) ص ( 1228، 1229)، ژمارە: (2236).

**استَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ﴾**[ت]، واتە: ((ئەی (محمد) ﷺ)) بڵێ: هەواڵم پێدراوەو (وحي)م بۆ کراوە، کە کۆمەڵێك لە (جن) گوێیان (لە قورئان خوێندن) گرت.

هەروەها خوا فەرموویەتی: **﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَراً مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِمْ مُنْذِرِينَ﴾**[ث]، واتە: وە یادبکەوە کاتێك کۆمەڵێك لە (جن) مان بۆ لای تۆ نارد، گوێیان لە قورئان دەگرت، جا کاتێك هاتن بە یەکتریان گوت: بێدەنگ بن (با گوێمان لە قورئانەکە بێت) وەکاتێك تەواوبوو، گەڕانەوە بۆ لای قەومەکەیان بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکەنەوە.

(5) وە هیچ پێغەمبەرێك لە جند نەهاتوە، ڕای سەرجەم یان لانی کەم زۆربەی هەرە زۆری زانایان وایە کە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) تەنیا لە ئینسان بوون، وە ئەو پێغەمبەرانەی کە لە ئینسانەکان هاتوون جند (جن)یش موکەللەف بوون کە بە دوایان بکەونو دینی خوای پەروەردگاریان لێ وەربگرن، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: **﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى...﴾**[ج].

(6) (ئیبلیس) کێیە؟!

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: **﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ﴾**[ح]، واتە: وە یاد بکەوە کاتێك

---

(ت) ( الجـن 1 ).
(ث) ( الأحقـاف 29 ).
(ج) ( يوسف - 109 ).
(ح) ( الكهـف 50 ).

بە فریشتەکانمان فەرموو کڕنووش بۆ ئادەم بەرن، یەک سەر هەموویان کڕنووشیان برد جگە لە ئیبلیس، ئەو لە جندان بوو بۆیە لە فەرمانی خوا دەرچوو. کەواتە (إبلیس) لە (جن)ە، جا ئایا بابی (جن)ە؟ وەك چۆن ئادەم بابی ئینسانەکانە، یاخود هەر یەکێکە لە (جن)؟! زانایان لەوبارەوە دوو ڕایان هەیە، بەلاّم زۆربەیان ڕایان وایە کە (إبلیس) وەك چۆن ئادەم بابی مرۆڤایەتی‌یە، ئەویش بابی تێکڕای جند (جن)ە، د یارە هەر ئەم ڕایەش لە ڕاستی‌یەوە نزیکەو (أبن تیمیة)ش هەر ڕای وایە[تر].

(7) جندیش خواردن‌و خۆراکیان هەیە:

وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((اذا أكل أحدكُمْ فَلْيأكُلْ بيمينه، واذا شَرِبَ فَلْيَشْرَبَ بيمينه، فأنَّ الشيطان يأكُلُ بِشمالِهِ وَيشرَبُ بِ شِمالِهِ))[یر]، واتە: ئەگەر یەکێکتان خواردنێکی خوارد، با بەدەستی ڕاست بیخوات، وە ئەگەر شتێکی خواردەوە، با بەدەستی ڕاست بیخواتەوە، چونکە شەیـطان بەدەستی چەپ دەخوات‌و بەدەستی چەپیش دەخوا تەوە، وە فەرموودەی دیکە زۆرن کە جند خواردن‌و خۆراك دەخۆن.

جا کافرەکانیان شتی پیسیش دەخۆن، بەلاّم ئیماندارەکانیان تەنیا شتی پاك دەخۆن، من خۆم پرسیارم لـێ‌کردوون[سر]، کە ئەگەر (بـ سم الله) کرا ئێوە چی دەکەن؟ گوتیان ئەگەر (بسم الله) بکەن، ئێمە با شتر دە توانین لەگەڵ ئێوەدا بخۆین، و زەرەرتان لـێ نادەین، بەلاّم ئەگەر (بسم الله) نەکەن شەیطانەکان لەگەڵتان دەخۆن‌و لێشی کەم دەکات‌و زەرەریشتان لـێ دەدەن!

(تر) مجموع الفتاوی: بەرگی (4) ، لاپەڕە (235 و 346).

(یر) رواه مسلم عن أبن عمر (رضي الله عنهما).

(سر) وا تە: لە م سوڵمانەکانیان و بە شێوەیەکی ناڕا ستەوخۆ و لە ڕێی برا یەکی مسوڵمانەوە.

(8) ئایا جند زاوزێ یان هەیە؟!

بەڵێ جند وەك فریشتە نین، زاووزێ یان هەیەو لەو ڕووەوە وەك ئینسانن، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای بێوێنەومەزن باسی حۆری یەکانی بەهەشت دەکات، دەفەرموێ: ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنْسٌ قَبْلَهُمْ وَلا جَانٌّ﴾[تر]، واتە: هیچ کەس پێش ئەو پیاوە بەهەشتی یانە نەچۆتە لای ئەو حۆری یانە نە لە ئینسان و نە لە جند، (واتە: بۆ جووت بوونو ڕابواردن).

کەواتە: جندیش زاووزێیان هەیە نەك هەر ئەوەندە بەڵکو (ابن تیمیة)و ژمارەیەك لە زانایان دەڵێن: (وقد يتناكح الأنس والجن ويولد بينهما وَلدٌ وهذا كثيرٌ معروفٌ) واتە: جاری وا هەیە پیاوێکی ئینسانو ژنێکی (جن)، یاخود بە پێچەوانەوە بەیەکەوە جووت دەبن، وە جاری وا هەیە کە منداڵیشیان لە نێواندا پەیدا دەبێ، وە ئەوەش زۆرەو شتێکی زانراوە.

بەڵام بەزۆری وایە ئەوانەی شێت دەبنو دەکەونە حاڵەتی نائاساییەوە لەگەڵیان تێکەڵ دەبن، بەڵام کە ئەگەر منداڵیان لە نێواندا پەیدابێ وا پێدەچێ کە وەك جند پەنهان دەربچنو وەك ئێمە بینراو دەرنەچن[یر].

(9) شەیطانەکان گوێ لە قسەی فریشتەکان دەگرن:

وەك خوای بەرزو مەزن لەسەر زمانی (جن) فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَساً شَدِيداً وَشُهُباً﴾[ ]، واتە: ئێمە تەماشای

---

(تر) (الرحمن 56).

(یر) مجموع الفتاوی: بەرگی (19)، لاپەڕە (39) دیارە ئەم مەسەلەیە لە قورئان و سوننەتدا نەهاتووە ناشڵێم مەحاڵە و ناگونجێ بەڵام زۆرم بە عەقڵەوە نانووسێ، مەبەستم (منداڵ لە نێوان جند و مرۆڤدا پەیدابوونە)!

ئاسمانمان کردو گەڕاین دیتمان پڕبووە لە پاسەوانو ئیشک چی زۆر تو ند لەگەڵ پریشکە ئاگری بەتیـن **﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَا عِدَ لِل سَّمْعِ فَ مَنْ يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَاباً رَصَداً﴾**[بر]، واتە: وە ئێ مە لە مەوپێش چەند شوێنێکی گوێگرتنمان لە ئاسماندا هەبوو، بەڵام هەرکەسێك ئێستا گوێ هەڵخات پریشکە ئاگری ئامادەکراو چاوەڕێیەتی.

پوختەی مەبەستی ئەم ئایەتانەش ئەوەیەکە: پێش وە حی بۆ هاتنی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ شەیطانەکان زیاتر دەیانتوانی گوێ لە دە نگو باسی فریشتەکان بگرن لە ئاسمانەکاندا، بەڵام دوای هاتنی پێغەم بەر ﷺ، ئێ شکەگرتنی فری شتەکان لە ئا سمان زۆر تو ندترکراو ت یـر بارانەکەش هەر زیاتر کرا، بۆ ئەوەی کە قسەی فاڵچی (کاهن)ەکان بواری نەمێنیو خەڵك لە (وحي) نەکەوێتە گومانەوە.

(10) جندەکان دەتوانن بچنە سەر شێوەو وێنەی ئینسانو ئاژەڵو تەنا نەت سـەگو ماریش: وەك پێشتر با سمان کردو لە جەن گـی (بەدر)ی شدا شەیطان لەسەر شێوەی کابرایەکدا هات بۆ لای کافرەکانو گوتی: **﴿ إِ نِّي جَارٌ لَكُمْ﴾**[]، واتە: من هاوکارتانم، بەڵام کە زا نی تێ شکان هەڵاتو ڕایکرد.

(11) جند دەتوانن خوت خوتەو خەیاڵات بخەنە نێو دڵـی ئینسانەوە:

---

(تر) ( الجـن  8 ).
(بر) ( الجـن  9 ).
() ( الأنفـال  48 ).

وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إنَّ الشَّيطان يَجْرِي مِن ابنِ آدم مَجْرى الدَّم))(١٣)، واتە: لە جەستەی ئینساندا خوێن بە کویدا بتوانێ بجوولێ، شەیطانیش دەتوانێ بەویدا بڕوات و بێت. من لەوبارەوە شەوە لێم پرسیون دەڵێن: دەتوانین ئەوەندە خۆمان بچووك بکەینەوە کە بە چاو نەبینرێین!، واتە دەتوانن خۆیان بە هەموو شێوەیەك بگۆڕن و وەك ئێمە نین کە قاڵب بەستووبن و هەر وەك خۆیان بن.

(12) شەیطان دەسەڵاتی بەسەر ئیمانداراندا نیە: وەك خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلاَّ مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ﴾(١٤)، واتە: بەندەکانی من تۆ دەسەڵاتت بە سەردا نین، مەگەر سەرگەردانانێك خۆیان شوێنت بکەون.

وە لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هاتوە کە بە (عمر بن الخطاب)ی (خوا لێی ڕازی بێ) فەرمووە: ((والذي نفسي بيده ما لقيك الشَّيطان قطّ سالكاً فجّاً الاّ سلك فَجّاً غَيْر فَجِّك))(١٥)، واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە! هەرگیز شەیطان لە ڕێیەکدا تووشت نەبووە مەگەر ڕێی گۆڕیوە و بە ڕێیەکی دیکەی غەیری ڕێی تۆدا ڕۆیشتوە.

(13) وە جند جاری وایە دەتوانێ بچێتە نێو جەستەی ئینسانەوە:

وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ﴾(١٦)، واتە: ئەوانەی کە سوود (ربا) دەخۆن، ڕۆژی قیامەت هەڵناستنەوە تەنیا وەك ئەو کەسانە نەبێ کە

---

(١٣) رواه البخاري و مسلم عن أنس (رضي الله عنه).

(١٤) ( الحجر 42 ).

(١٥) متفق عليه عن سعد أبي وقاص، البخاري برقم: (3294)، ومسلم برقم: (2396).

(١٦) ( البقرة 275 ).

شەیطان دەستیان لـێدەوەشێنێ (و دەچێتە نێو جە ستەیانەوە)، وە (إ بن تیمیة) دەربارەی جند چوونە نێو جەستەی مرۆڤـ دەڵێ: (هو ثابت باتفاق أهل السنة والجماعة)[٣٥]، واتە: ئەوە شتێكی چەسپاوە بە یەك دەنگی زانایانی ئەهلی سوونەتو جەماعەت.

ئەمەش كورتە پێناسەیەكی (جن)و (شیطان) بوو، خوای پەروەردگار لە فێڵو تەڵەكەی ئەوان چەپاڵەمان بداتو بمانپارێزێت.

لێرەشدا كۆتایی بە بەندی یەكەم دێنینو دەچینە سەر بەندی دووەم.

وصلى الله على سيِّدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلَّم



(٣٥) مجمع الفتاوى: بەرگی (24)، لاپەڕە (236).

# ئـەم بەنـــدە

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەندە دووەمە کە لە دەرسی ژ ماره (39) پێک هاتوه با سی پا یەی سێیەمی ئیمان دەکات لە پێنچ پایە گرنگەکانی، کە بریتیە لە ئی مان به کتێبەکانی خوا (تبارك‌و تعالـی)و سەرجەم لە سێ خاڵان پێکدێ کە ئە مە ناوو نیشانەکانیانە:

خاڵـی یەکەم: بڕوا هەبوون بە کتێبەکانی خوا (عزّوجل) یەکێکە لە پ ێنچ پایەکانی ئیمان.
خاڵـی دووەم: کتێبەکانی خوا چەندن‌و چۆنن؟!
خاڵـی سێیەم: ئامانجی نێررانی کتێبەکانی خوا (سبحانه‌و تعالـی).

دیارە ئێمە زۆر بە پوختی‌و گوشراویی لێرەدا باسی کتێبەکانی خوای به بەزەیی‌و هیدایەتدەرمان کردوە، ئەگەرنا لێکۆلی نەوە لەبارەی کتێ بەکانی خواوە بابەتێکی یەکجار گەورە گرنگەو پێویستی بە زنجیرە باسێکی قووڵ‌و چڕ دەکات! جا ئایا دەبێ پاش باسکردنی خوا (سبحانه‌و تعالـی) چ شتێك لە باسکردنی وتەو فەرمایشتە بەرزو بێوێنەکانی گەورەترو گرنگتر بێت!!

شایانی باسیشە کە ئێمە سوپاس‌و ستایش بۆ خوا لە کتێ بی (الأ سلام یتجلّی فی ک تاب الله)دا چەند باس‌و خوا سێکی چرو پر مان لەبارەی

## (خاڵی یەکەم):

# بڕوا هەبوون بە کتێبەکانی خوا

# یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیمان:

پێشتر ئەو فەرموودەیەمان هێنا کە بە فەرموودەی (جبـریل) ناسراوەو لەو فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی (جبـریل)دا کە پرسیاری دەر بارەی ئیمان کرد، فەرمووی: ((أنْ تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الاخر، وتؤمن بالقدرخيره وشره))[ت]، وەك دەبینین یەکێك لە پایەکانی ئیمان، ئیمان بە کتێبەکانە، هەروەها ئایە تەکانی ژ مارە (177)و (285)ی سوورەتی (البقرة)و ئایەتی ژ مارە (136)ی سوورەتی (النِّ ساء) مان لە با سی فریشتەکاندا هێنا، کە باسی ئیمان بە کتێبەکانی خوا یان تێدا یە. وە لە سوورەتی (البقرة)دا لە ئایەتەکانی ژ مارە (136، 137، 138)دا خوای بێهەوەڵ دەفەرموێ: ﴿قُولُوا آمَنَّا بِاللهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُ نْزِلَ إِ لَى إِ بْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النبـيونَ مِنْ رَبِّهِمْ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ۞ فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنْتُمْ بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوْا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ۞ صِبْغَةَ اللهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ﴾، واتە: ئ ێوە ( ئەی پێغەمبەرو ئیمانداران) بڵێن: ئیمانمان هێناوە بە خوا، وە ئیما نمان بەوەش هێناوەکە نێرراوەتە سەرمان (کە قورئانە) وە بەوەی کە ن ێرراوە بۆ سەر ئیبـراهیمو ئیـ سماعیلو ئیـ سحاقو یەعقووب، وە ئەوەی بۆ نەوەکانی یەعقوویش نێرراوە (الأسباط) ((واتە: یو سفو برا یەکانی)) وە ئیما نمان هێناوە بەوەی کە دراوە بە مووساو بە عیسا کە (تەورات)و (ئینج یل)ن، وە ئیمانمان بە هەموو ئەو (کت ێب و ڕێنمایی)ا نە هێ ناوە کە دراون بە پێغەمبەران لەلا یەن پەروەردگاریا نەوە، ج یاوازی ناخەی نە ن ێوان هیچ

(ت) رواه مسلم عن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه)، برقم (8)، والبخاري، برقم (50).

کامیانەوە، وە ئێمە بۆی گەردن کەچین جا ئەگەر ئیمانیان هێنا، وەك ئەوەی کە ئێوە ئیمانتان پێی هێناوە، ئەوە ڕێگای ڕاستیان گرتوە، ئەگەر پشتیشیان تێکرد، بێگومان ئەوە دیارە کە لە دووبەرەکایەتی دان (لەگەڵ خواو دینی خواو پێغەمبەرانی خوادا) وە خوا بەسە بۆ تۆ دژ بەوان، بێگومان خوا بیسەرەو زانایە. (ئەو هیدایەتەی کە لەو کتێبو بەرنامانەی خوادایە) ڕەنگی خوایە (کە دەروونو دەرو وردو درشتی ژیانو گوزەرانی بەندەکانی خۆی پێ ڕەنگ دەکات) جا ئایا ڕەنگی کێ لە هی خوا چاکترە؟! وە ئێمە بەندەی خواینو هەر ئەو دەپەرستین.

لە شوێنێکی دیکەش خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەر ﷺ دە فەرموێ: ﴿وَقُلْ آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ﴾[1]، واتە: وە بڵێ: من هەر کتێبێك کە خوا ناردوویەتە خوارێ، ئیمانم پێی هەیە. کەواتە کتێبەکانی خوا، ئەوا نەن کە خوای پەروەردگار بە (جبـریل)دا بۆ پێغەمبەرانی خۆی ناردوونو تەنیا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)یش کتێبو بەرنامەی خوایان بۆ هاتوەو جگە لە پێغەمبەران، خوای کاربەجێ (و حي)و پەیامی خۆی بۆ هیچ کەسێکی دی نەناردوەو بەرنامەو کتێبی بۆ نەناردوە، وە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەندێکیان تەنیا پێغەمبەر (نبـي) بوون، واتە: خاوەنی کتێبو بەرنامەی سەربەخۆ (مستقل) نەبوونو هەر لەسەر کتێبو بەرنامەی پێغەمبەرێکی پێش خۆ یان ڕۆیشتوونو، هەندێکیشیان و ێرای پێغەمبەرایەتی (نبوة) سیفەتی ڕەوانەکراو (رسول)یشیان بووەو خاوەنی کتێبو بەرنامەی سەربەخۆ بوون، بەڵام هیچ پێغەمبەرێك بێ (و حي)و پەیامی خوا نەبووەو سەرجەم پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا (علیهم من الله

---

[1] (الشورى 15).

أفضل الصلوات وأتم التسليمات وأعظم البر كات)، خوای بەرزو بێوێنە پەیام‌و فەرمایشتی تایبەتی خۆی بۆ ناردوون[تر].

لەم ئایەتانەی پێشووشدا وا دەردەکەوێ کە ئەو کتێبانەی بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) نێرراون جیاوازی‌یان لە نێوانیاندا نییەو هەموویان جێگەی ڕێزو حورمەتن، چونکە هەموویان وشە (كلمة)ی خوان‌و هەموویان ڕێنموویی‌و ئاراستەی خوایان تێدایە، جا لەو ڕووەوە کە فەرموودەو کتێبی خوان‌و بۆ پێغەمبەرانی خوا (عليهم الصلاة والسلام) نێرراون ئێمە جیاوازی یان ناخەینە نێوان‌و بەیەك چاو تەماشایان دەکەین لە ئەسڵی کتێبی خوا بوونیاندا.

بەڵام لە چەند ڕووێکی دیکەوە جیاوازن:

یەکەم: کە قورئان کۆتایی هەموو کتێبەو بەرنامەکانی خوایەو چاودێرە بەسەر هەموویانەوە وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ...﴾[یر].

دووەم: کە خوای پارێزەر (حَفيظ) قورئانی پاراستوەو بە خەڵکی نە سپاردوە، وەك کتێبەکانی پێشووی، وەك خوای کاربەجێ دەربارەی ئەوە کە خۆی قورئان دەپارێزێ دەفەرمووێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾[]، واتە: ئێمە خۆمان زیکر (قورئان)مان ناردۆتە خوارێ‌و هەرخۆشمان پارێزەرینی، وە لەوبارەوە کە پاراستنی کتێبەکانی دیکەی بە ئینسانەکان سپاردوە، فەرموویەتی: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدىً وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ

(تر) لە بەندی سێیەم دا کە تەرخان کراوە بۆ توێژینەوە لە بارەی پێغەمبەرانەوە، زیاتر ئەو مەسەلەیە ڕوون دەکەینەوە.
(یر) ( المائدة 48 ).
() ( الحجر 9 ).

الذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُوا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ وَكَانُوا عَلَيْهِ شُهَدَاءَ ﴾(ت)، واتە: ئێمە تەوراتمان نارد بۆ خواری رێنمایی و رووناکی تێدابوو، پێغەمبەرانێك کە بۆ خوا ملکەچ بوون حوکمیان پێدەکرد بەسەر جووەکاندا، هەروەها پێشەواو زانایانی ـ جوولەکە ـ ش (حوکمیان پێدەکرد) لە سۆنگەی ئەوەوە کە پارێزگاریی لێکردنی کتێبی خوایان پێ سپێررابوو وە بەسەریشیەوە چاودێر بوون.

سێیەم: کە بێجگە لە قورئان، بە شەر هیچ کتێبێکی دیکەی خوای لەبەردەست دانیەو نەماوە کە لێی دڵنیاو مسۆگەر بین نەگۆڕراوەو دەستکاریی نەکراوە، وەك واقیعی قورئان لەلایەك و سەرجەم کتێبە ئاسمانییەکانی دیکەش شایەدن و خوای پەنهانبینیش لەبارەی قورئانەوە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ. لا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلا مِنْ خَلْفِهِ تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾(ث)، وە دەربارەی گۆڕران و دەستکاریی کرانی هەرکام لە تەوراتی جوولەکەو ئینجیلی نەصرانییەکانیش فەرمووییەتی: ﴿وَلَقَدْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيباً وَقَالَ اللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصَّلاةَ وَآتَيْتُمُ الزَّكَاةَ وَآمَنْتُمْ بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً لَأُكَفِّرَنَّ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ فَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ ۞ فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ وَنَسُوا حَظّاً مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ وَلا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَى خَائِنَةٍ مِنْهُمْ إِلاَّ قَلِيلاً مِنْهُمْ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ۞ وَمِنَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَى أَخَذْنَا مِيثَاقَهُمْ فَنَسُوا حَظّاً مِمَّا

(ت) (المائدة 44).
(ث) (فصلت 41،42).

ذُكِّرُوا بِهِ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ اللَّهُ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ﴾[1].

چوارەم: کە قورئان بۆ هەموو بەشەرە بە درێژایی زەمانو بە پانایی زەمین، بەڵام کتێبەکانی دیکە هەرکامێکیان بۆ کاتو شوێنو کۆمەڵگاو ژینگەیەکی دیاریکراو نێرراون، هەربۆیەش خوای کاربەجێ لە کاتێکدا کە بۆ خۆی قورئانی پاراستوە، کتێبەکانی دیکە چونکە بە شێوەیەکی کاتی (مؤقت) هاتوون بە جۆرێکی دیکە مامەڵەی لەگەڵ کردوون.

چۆنیەتی ئیمان هێنان بە کتێبەکانی خواش، لەم چەند وشەیەدا کورت دەکەینەوە دەڵێین: ((ئیمان بە کتێبەکانی خوا (عزّوجل) ئەوەیە کە ئینسان بە عەقڵو دڵ بزانێو قەناعەتی تەواوی هەبێ بەوە کە خوای کاربەجێ بەدرێژایی مێژووی بەشەر لەسەر زەوی چەند کتێبێکی ڕەوا نەکردوون بۆ ڕێنمایی ئینسانەکانو ڕێکخستنی ژیانو گوزەرانیان وە بەزمان دان بەو ڕاستییەدا بێنێو بە کردەوەش بە کتێبی کۆتاییانەوە پابەند بێتو بەر لەوەش لە ناخی دڵییەوە ڕێنماییو یاساکانی سەرجەم قبووڵ بکات)).



[1] ( المائدة - 12،13،14 ).

بێگومان کتێبەکانی خوا ئەو بەرنامانەن کە خوای پەروەردگار لە هەر چاخو ڕۆژگارێکدا بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)دا ڕەوانەی کردوون بۆ خەڵك تاکو خەڵکی ڕێنمایی بکەنو چاکیان بکەنو خوایان پێ بناسێننو فێری بەندایەتی‌یان بکەن، وە ژیانو گوزەرانی دونیایان ڕێك بخەن بە شێوەیەك کە جێگەی ڕەزامەندیی خوا بێت.

شایانی باسیشەکە کتێبەکانی خوا (عزَّو جّل) لە هەر قۆناغێکی ژیانی بەشەرداو لە هەر چاخو سەردەمێکداو لە هەر کۆمەڵگایەکدا، بە پێی پێداویستی ئەو خەڵکەو ئەو قۆناغو کۆمەڵگایە نێرراون، بۆ نموونە: لە سەردەمی (نووح)دا (سەلامی خوای لەسەر بێ) کە ئەو کاتە بەشەر ژیانی وا گەشەی نەکردبووو کۆمەڵگا وا بەرەو پێش نە چووبووو ژیانێکی سادەی هەبوو، ئەگەر سەرنجی فەرمایشتەکانی (نووح) بدەین لەگەڵ قەومەکەیدا، دەبینین کە زیاتر لایەنی ئیمانو عەقیدەییو شتی بنچینەیی باس دەکاتو زۆر نەچۆتە نێو بوارەکانی سیاسەتو ئابووریو کۆمەڵایەتیو وردەکارییەکانیانەوە. ئنجا پێ بەپێ پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) تا ژیانی ئینسان زیاتر بەرەو پێش چووەو تا کۆمەڵگا زیاتر گەشەی کردوەو تا ژیانی ئینسان لە ڕووی مادییو کۆمەڵایەتیو سیاسییەوە ئاڵۆزتربووەو چڕوپڕتر بووە، بەرنامەو شەریعەتەکانی خواش کە ناردوونی وردەکارییو یاسای زیاترو فراوانتریان تێدا بووە، بە تایبەت (تەوراة) کە بۆ مووسا پێغەمبەر (علیهم الصلاة والسلام) نێرراوە، گەلێك لە یاساکانی خوای کاربەجێی تێدابوون، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى

وَنُورٌ﴾()، وە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى وَهَارُونَ الْفُرْقَانَ وَضِيَاءً وَذِكْراً لِلْمُتَّقِينَ﴾()، چونکە خوای زاناو شارەزا پاش دەربازبوونی بەنی ئیسرائیل بە سەرکردایەتی مووسا ﴿علیه السلام﴾ لە چەنگالی فیرعەونو دوای ئەوەی ئازادبوونو توانیان لەسەر پێی خۆیان بوەستن، تەوراتی نارد تاکو ژیانیان رێك بخات، بۆیەش تەورات گەلێك یاسای جۆراو جۆری گرتووە لە خۆی لە هەموو بوارەکاندا کە بێگومان جگە لە قورئان، لە هەموو کتێبەکانی دیکە زیاتر دەستوورو یاساو رێنمایی خوای پەروەردگاری تێدان، چونکە ئەوکاتە کۆمەڵگاکان زیاتر بەرەوپێش چوونو گەیشتوونە ئەوەی کە پێداویستییان بە چارەسەری وردترو زیاتر بووە، چونکە کێشەو گیروگرفتی زیاتریان هاتۆتە رێ، وە کتێبەکانی خوا (جل جلالە) ژمارەیان زانراو نییە، هەر چەندە لە هەندێ شوێنەوار()(أثر)دا هاتوە کە خوای پەروەردگار (104) سەدو چوار نامەی ناردوە، بەڵام زۆر جێگەی متمانە نیەو ئەو کتێبانەی کە ناویان لە قورئاندا هاتوە ئەمانەن:

## یەکەم : نامەکان (صُحُف)ی ئیبراهیمو مووسا :

---

(تر) ( المائدة 44 ).

(یر) ( الأنبیاء 48 ).

() شوێنەوار (أثـر) لە زاراوی فەرمووده ناسان (مُحَدِّثین) دا و پێرای سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ قسەو بیروڕای هاوەڵان و شوێنکەوتووان (الأصحاب و التابعین)یش دەگرێتەوە.

وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَذَا لَفِي الصُّحُفِ الأُولَى ۞ صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى﴾[]، واتە: ئائەمە لە نامە پێشووەکاندا هەیە، ئەو نامانەی کە بۆ ئیبراهیمو مووسا (علیهما الصلاة والسلام) نێرراون.

دیارە مووسا (علیه السلام) (تەورات)یشی دراوەتێ، جا ئایا ئەو نامانە (صحف)ە هەر مەبەست پێیان تەوراتە، یاخود شتێکی دیکە شی پێدراوە جگە لە تەورات بە ناوی نامەکان (صحف)؟! واپێ دەچێ کە مەبەست لە نامەکان (صحف) هەر تەورات بێت، بەلاّم دیارە ئیبراهیم چەند نامەیەکی بۆ هاتوون، لە چەند لاپەڕەیەك دا وەك خوای زانا (عزّو جل) هەوا لّی پێداوین.

## دووەم: تەورات ( التوراة ):-

وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدىً وَنُورٌ﴾[]، واتە: ئێمە تەوراتمان ناردۆتە خوارێ کە ڕێنمایی‌و ڕۆشنایی تێدایە.

## سێیەم: زەبوور ( الزبور ):-

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَآتَيْنَا دَاوُدَ زَبُوراً﴾[]، واتە: وە زەبوورمان‌دا بە داوود.

## چوارەم: ئینجیل ( الأنجیل ):-

---

(تر) ( الأعلى 18،19 )
(یر) ( المائدة 44 ).
() ( النساء 163 ).

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ﴾[تر]، واتە: وە بە شوێنیاندا (واتە هەموو ساو پێغەمبەرانی دی کە لە دوای وی هاتوون) عیسای کوڕی مەریەممان نارد، ئەوەی پێش خۆی ـ کە تەوراتە ـ بە ڕاستزانی، وە ئینجیلیشمان پێ بەخشی.

**پێنجـەم: کتێب ( الکتـاب ):-**

کە بە (قرآن)و (فرقان)و (ذکر)یش ناونراوە بۆ پێغەمبەری کۆتایی (محمد) هاتوە، وە فەرموویەتی: ﴿نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾[یر]، واتە: خوا کتێبی بە حەق ناردوە بۆ تۆ، ئەوەی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ. ئنجا وەك پێشتریش گوتمان بێجگە لە قورئان هەموو کتێبەکانی دیکەی خوای بەبەزەیی، هەروەکو بێجگە لە (محمد) ﷺ هەموو پێغەمبەرانی دیکەی خوا (علیهم الصلاة والسلام) تەنیا بۆ کۆمەڵێکی دیاری کراو و لە شوێنێکی دیاریکراوداو بۆ کاتێکی دیاریکراو نێرراون، بەڵێ هەم پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وە هەم ئەو کتێبو بەرنامانەش کە لە خواوە بۆیان هاتوون، بۆ کۆمەڵێکی دیاری کراو بوون، لە کاتو قۆناغێکی دیاری کراوداو لە ژینگەو شوێنێکی دیاری کراودا، واتە: هەم لە ڕووی کاتو ڕۆژگارەوەو هەم لە ڕووی جوگرافیاو شوێنەوەو هەم لە ڕووی خەڵكو کۆمەڵەوە، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و ئەو کتێبانەی کە بۆیان هاتوون، سنوور داربوون ـ دیارە جگە لەوەی کە بۆ ئادەمو نووح (علیهما الصلاة والسلام) هاتوون چونکە ئەوکاتە بەشەر هەر ئەوە ندە بوون کە ئەوانی بۆ ڕەوانە کراون ـ بەڵام دوایی کە بەشەر بڵاوبۆتەوە بە زەوی

---

(تر) ( المائـدة 46 ).
(یر) ( آل عمران 3 ) .

داو بووە بە کۆمەڵ کۆمەڵو تیرە تیرەو گەل گەل، هەر گەلو کۆ مەڵێك پێغەمبەرێکی بۆ لا ڕەوانەکراوە کە تایبەت بووە بە خۆیەوە، وەك خوا دەفەرمویّ: ﴿وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلاَّ خَلا فِيهَا نَذِيرٌ﴾[تر]، واتە: هیچ کۆمەڵێك نەبووە حەتمەن ئاگادارکەرەوەیەکیان لە نێودا ڕەوانە کراوە.

بەڵام پێغەمبەری کۆتایی (محمد) ﷺ کە گەورەو سەروەری پێغەمبەرانە، وە قورئان کە گەورەی کتێبەکانی خوایە، هەم پێغەمبەر خۆی وە هەم قورئان کە کتێبو بەرنامەکەیەتی، بۆ هەموو بەشەر هاتوون، لە درێژایی زەمان داو بە پانایی زەمین، وەك خوا (عزّوجل) دەفەرمویّ: ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ ۞ لِمَنْ شَاءَ مِنكُمْ أَنْ يَسْتَقِيمَ﴾[یر]، واتە: ئەم قورئانە یادو بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانیەکان، بۆ هەرکەسێك کە بیەویّ ڕاست بێت. وە دەربارەی پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً﴾[]، واتە: تۆمان نەناردوە مەگەر کە بۆ تێکڕای خەڵکی تر سێنەرو مژدەدەر بی، بەڵێ لە دوای قورئان کتێبی دی نایەت، وە لە دوای پێغەمبەر (محمد)یش ﷺ هیچ پێغەمبەرێکی دیکە ڕەوانە ناکرێت، بە (محمد) ﷺ دەرگای پێغەمبەرایەتی داخراوە، وە بە قورئانیش دەرگای هیدایەتی تایبەتیو کتێبەکانی خوای بەخشەر پێوەدراوە، بەڵێ خوای بەبەزەیی وەك خەون (رؤيا)و خوریە (الهام) هەندیّ جار شت پیشانی هەندیّ خەڵك دەدات، بەڵام وەك (وحي)و کتێبو پەیامی خوا، ئەوە دەرگا داخراوە، چونکە قورئان دوایین نوسخەی هیدایەتی خوایەو هیچ کەلێنی نەهێشتۆتەوە تاکو پێویست بیّ کتێبێکی دیکەی خوا پڕی بکاتەوە. هەڵبەتە خوای بەرزو باڵادەست دەیتوانی

---

(تر) ( فاطر 24 ).
(یر) ( التكوير: 27، 28) .
() ( سبأ 28 ).

کتێبەکانی پێشووش بە تێرو تەواویی‌و دەست لێ نەدراویی بهێڵێ تەوەو کیفایەتی تێکڕای خەڵك بکەن، وە دەیتوانی هەر لە ئادەمەوە کتێبێك بنێرێت‌و بۆ هەموو بەشەر بشێ، وە بیشی پارێزێ لە گۆڕران‌و دەستکاریی کران، بەڵام حیکمەتی خوا وابووە کە بۆ هەر قۆناغ‌و چاخێك‌و بۆ هەر کۆمەڵگایەك کتێبێك بنێرێت، وە پێغەمبەرێکی تایبەت بنێرێت، تا ئەوکاتەی کە مرۆڤایەتی دەگاتە قۆناغی کامڵ بوون، ئەوکاتە دوایین پێغەمبەری خۆی بنێرێ بە دوایین بەرنامەو شەریعەتی خۆیەوە، کە بەرنامەو شەریعەتێکە بۆشایی ناهێڵێتەوە لە ژیانی ئینسانداو وەڵامی هەموو پرسیارەکان‌و چارەسەری هەموو کێشەکانی پێیە.

قورئان کە هاتوە هەموو کتێبەکانی پێش خۆی نەسخ کردۆتەوە، چونکە کتێب‌و بەرنامەکانی پێشتر بۆ قۆناغێکی دیاریکراو هاتوون‌و دوایی قۆناغەکە بەسەر چووە، ئنجا لە سۆنگەی ئەوەشەوە کە بۆ قۆناغ‌و کات‌و شوێن‌و کۆمەڵگایەکی دیاریکراو هاتوون، خوای کاربەجێ نەیپاراستوون لە دەستکاریی کران‌و گۆڕران[تێ]، هەروەها دە شیتوانی، وەك چۆن خۆی بۆ

---

(تێ) جارێك لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو لە (بەغدا) لەگەڵ کابرا یەکی نەصرانی لێمان بوو بە موناقەشە، ئەو گوتی: ئێوە خۆتان تووشی قسەی پێچەوانەو دژ (تناقض) دەکەن، گوتم: بۆچی؟ گوتی: ئێوە لە لایەکەوە دەڵێن: (لانُفَرِّقُ بين أحدٍ مِنْ رُسُلِهِ) کەچی ئەو کتێبە پێشووانەی کە بۆ موو ساو عیسا نێرراون، جیاوازییان دەخەنە نێوان لەگەڵ قورئان، ئێوە تەنیا دان بەو کتێبەدا دەنێن کە بۆ پێغەمبەری خۆتان هاتوە!، گوتم: نەخێر ئێمە دان بە ئەسڵی هەموویاندا دەنێین کە لە خواوەیە، بەڵام چونکە ئێمە بەڵگەی (نەقلیی)مان هەیە کە ئەو کتێبانەی دیکە هەموویان گۆڕران، ئێمە وەك مسوڵمان وێڕای بڕوابوونمان بە ئەسڵەکەیان بڕوامان بە گۆڕرانیشیان هەیە! ئەویش گوتی: ئاخر ئێمە نکوولیی لەوە دەکەین کە کتێبەکانمان گۆڕرابن، منیش گوتم: ئێمە نەك هەر بەڵگەی (نەقلیی) بەڵکو بەڵگەی (عەقلیی)شمان بەدەستەوەیە * هەروەها سەرەتا کە منداڵ دەچێتە قوتابخانە، لە قۆناغی سەرەتاییدا شتی زۆر سادەی فێر دەکرێ، وەك ڕەنگەکان و پیتەکان و وێنەکان و ژمارە سەرەتاییەکان و ... هتد،

بەڵام ئا یا کاتێك کە دەگا تە قۆنا غەکانی نێوە ندیو ئا مادەیی، وە قۆ ناغی زاذ کۆو خوێندنی باڵاو پسپۆریی و شتی دیکەی زۆر جیاواز دەخوێنێ، دەگو نجێ بگوترێ: بۆ چی کتێ بە سەرەتاییەکان لەبەردە ست دا نین و ناخوێنرێن؟! ئەدی ئەوانیش هەر دانەنراون بۆ فێربوونی زانین و کەڵك وەرگرتن؟! جا بێگومان هەرکەسێك لەو قۆنا غەدا ئەو پرسیارەی لێبکرێ، لە وەڵا مدا دە ڵێ:.... کا کە جا ئەوە کاتی خۆی بوو، من ئەوکاتی سادە بووم و منداڵ بووم و لە قەدەر ئەو کا تە هەر ئەوە ندە فێردە بووم، بەڵام ئێستا ماقووڵ نیە، بگەڕێمەوە سەر بەرنامەی ئەو کاتی، ئێستا من پێویستیم بە شتی دیکە هەیە، ئینجا پێم گوت: بەشەر کاتی خۆی سادەبووە، بۆیە ئەو کتێبانەش کە بۆی نێرران، بۆ هەرکات و قۆناغ و کۆمەڵگایەك لە قەدەر خۆی بووە، ئەگەر نا دیارە خوای مەزن زانیاری بێ سنووری هەیەو لە توانای دا هەبووە کە کتێبەکانی زۆر بە وردە کایی بنێرێ تە خوارێ، بەڵام بە شەر لە توا نای دا نەبووە کە هەزمیان بکات و ژیانە کەی پێوی ستی پێ یان نەبووە، ئەو ساکە وەك ئێ ستا لە ڕووی سیا سی و ئابووریو کۆمەڵا یەتی و تەکنەلۆجیاوە ژیان پەرەی نە سەندبوو، ئێستا کە دونیا هەمووی وەك شارێك بگرە گوندێکی لێهاتوە، دیارە ئەوکاتە وانەبووە، ئیذجا کە ژیان سادەتر بووە، پێوی ستی بە بەرنا مەی سادەتریش بووەو ئە گەر خوا عزّو جل بەرنا مەی ئی سلام (قورئان)ی بۆ ناردبان، نەیاندەزانی چۆنی جێبەجێ بکەن و پیادە بکەن.

ئینجا پێم گوت: کە ئێمە دەڵێین: قورئان دەفەرموێ کتێبەکانی پێشوو گۆڕاون، ئێمە وێڕای هەواڵدان (إخبار)ی قورئان کە ڕاستترین سەرەچاوەی هەواڵە، بەڵگەی دیکەشمان هە یە ئەویش ئەوە یە کە ئەو کتێبا نە زۆر شتی وا یان تێدا یە بەهیچ ڕەنگ ێك لە گەڵ عەقڵدا ناگو نجێ، تێیا ندا هەر چی گو ناحی گەورەو پیس و خرا پە پاڵدراوە تە لای پێغەم بەران، (ع لیهم ال صلاة وال سلام) وە سەربارەش ذ ێوە ئەف سانەی وا تان لەو کتێبانەدا پیدا کردوە کە لەگەڵ زانیاریو عەقڵو واقیعی ژیاندا ناگونجێ!

ئێ مە لە ئە سڵی باوەڕبوون بە کتێ بەکانی خواو پێغەم بەرانی خوا هیچ جیاوازی ناکەین، بەڵام لە گەورەیی و پلەوپایەیاندا وەك باسکرا جیاوازی هەیە.

* دیارە لێوردبوونەوەی خودی ئەو کتێبانەش مرۆڤ دەگەیەنێتە قەناعەتی سەدا سەد (100/100) کە ئەو کتێبا نە سەرجەم گۆڕران و شێوێنراون وەك خوای پەنهانزان هەواڵی پێداوین، شایانی باسیشە کە من توێژینەوە یەکی با شم لەوبارەوە لە کتێ بی (الأسلام يتجلى في كتاب الله)دا کردوە.

پاراستنی قورئان بەڵێنی داوە: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾[1]، واتە: ئێمە قورئانمان ناردوە، وە بۆ خۆشمان دەیپارێزین، دەشیتوانی پاراستنی تەوراتو زەبوورو ئینجیلو کتێبەکانی دیکەش بەخۆی بسپێرێ، بەڵام بە پێویستی نەزانیوە، چونکە بۆ کاتو قۆناغێکی دیاریکراو بوون، بەڵام قورئان چونکە بۆ هەمیشەیە، ئەوەتا ئێستا تەوراتو ئینجیل دەستکاری کراون، بەڵام قورئان دەتوانێ هەڵەکانیان ڕاست بکاتەوە، بەڵام کە خوا نەکردە قورئان دەستکاریی کرابایە بێگومان بەشەر سەری لــێ دەشێواو ئەوکاتە هێدایەتو (وحي)یەکی ڕاستو پارێزراو (معصوم)ی لەبەردەستدا نەدەبوو، (وحي)یەکی ڕاستو بێ چەندو چوون کە مسۆگەرو دڵنیا بین هەڵەی تێدا نییە، وە نەشدەگونجا ڕاست بکرێتەوە!



[1] (الحجر 9).

بەڕێـــزان!

بە پێویستی دەزانم بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە کە ئا یا ئا مانجو مەبە ستی نێررانە خوارەوەی کتێبەکانی خوای بە بەزەییو کار بەجێ چیە؟! سەرەتا سەرنجی چەند ئایەتێکی بەپێز بدەین کە ڕا ستەوخۆو بە ڕوو نی با سی حیکمەتو ئامانجی نێررانە خوارەوەی قور ئان دە کەن، پا شانیش سەرنجی کۆمەڵە ئایەتێکی دیکە دەدەین لە سوورەتی (المائدة) کە بە گ شتی با سی کتێبەکانی خوا دەکەنو بە تایبەت (تەوراتو ئینجیلو قورئان):

## یەکەم: ئامانجی نێـررانە خواری قورئـان:

خوای بەرزو بێوێنە لە زۆر ئایەتاندا باسی حیکمەتو ئامانجی ناردنە خواری قورئان بەڕێزی کردوە، بۆ نموونە:

(1) ﴿حم ۞ تَنْزِيلٌ مِنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ۞ كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ۞ بَشِيراً وَنَذِيراً فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لا يَسْمَعُونَ﴾[1]، واتە: حاء، میم، ناردنە خوارەوەی ( ئەم کتێ بە) لەلا یەن ( خوای) بە بەزەیی بەخشندەوەیە، کتێبێکە ئایەتەکانی ڕوون کراونەوە قورئانێکی عەرەبییە بۆ کەسانێك کە دەزانن. موژدەدەرو ترسێنەرە. بەڵام زۆر بەیان پ شتیان هەڵکرد بۆیە نابیستن. کەواتە: حیک مەتو ئا مانجی نێررا نی قور ئان ئەوەیە کە خوای خاوەن بەزەییو بەخشش لە ڕووی بەزەییو کە ڕە مى خۆیەوە ویستوویەتی بەهۆی قورئانەوە بەندەکانی زاناو شـــارەزا ب کاتو

[1] (فصلت 1 -4).

مـوژدەی ڕەزامـەندیـــی خۆیو بەهەشـــت بـە چاكەكاران بداتو ترسو بیمو هەڕەشەش پێشانی خراپەكاران بدات.

(2) ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ لِلنَّاسِ بِالْحَقِّ فَمَنِ اهْتَدَى فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِوَكِيلٍ﴾[ ]، واتە: كتێبمان بە هەق ناردۆتە سەرتۆ بۆ خەڵكی، جا هەركەسێك ڕێی ڕاستی گرت ئەوە بۆ خۆیەتیو هەركەسێكیش سەرگەردان بوو ئەوە زیانی گومڕایی بوونەكەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، وە تۆ (ئەی موحەممەد!) بەسەریانەوە چاودێرنی، كەواتە: قورئان بۆیە نێرراوەتە خوارێ تاكو هەقو ڕاستی لە خەڵكی بگەیەنێ ـ لە هەموو ڕوویێكەوە ـ وە بۆ ئەوەی بە نەدەكانی خوا (عزّو جل) ڕێی ڕاستو ڕێك بگرنو لە سەرگەردانیی ڕێ لـێ ونبوون پارێزراو بن!

(3) ﴿إِن هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ. لِمَنْ شَاءَ مِنكُمْ أَنْ يَ ستَقِيمَ﴾[*]، واتە: ئەم (قورئان)ە جگە لە بیرخەرەوە ـ ی سەرجەم ڕاستییەكان ـ بۆ تێكڕای جیهانی یان شتێكی دیكە نیە، بۆ هەركەسێك لە ئێوە كە بیەوێ ڕاستو ڕێك بێ. كەواتە: قورئان بۆیە نێرراوەتە خوار كە بیـرخەرەوەو بەرچاو ڕۆشن كەرەوەی تێكڕای مرۆڤایەتی بێت، وە دەستیان بگرێو ڕێی ژیانێكی ڕاستو ڕەوانو بێگرێو گوڵیان پیشان بدات!

(4) ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَ شِّرُ الْ مُؤْمِنِينَ ا لَذِينَ يَعْمَ لُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْراً كَبِيراً﴾[ ]، واتە: بێگومان ئەم قورئانە ڕێنـمایی

---

(تر) ( الزمـر 41 ).

(یر) ( التكویـر 28- 27 ).

( ) ( الأسـراء 9 ).

(خەڵكی) دەكات بەرەو ڕاستترین ڕێباز وە موژدە بە ئیماندارانێك دەدات كە كردەوە چاكەكان دەكەن، كە پاداشتێكی گەورەیان هەیە.

(5) ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾[1]، واتە: ئەی خەڵكینە بە تەئكید لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگاریتان بۆ هاتوە وە چارەسەر بۆ ئەو (دەردو نەخۆشیی)ەی كە لە سینەكان دایە، وە ڕێنمایی‌و بەزەیی بۆ بڕواداران. بەڵێ: قورئان ڕێنماییكەرو ڕێ پیشاندەری مرۆڤە ـ بە تاك‌و خێزان‌و كۆمەڵگاوە ـ بۆ ڕاستترین ڕێبازو چاكترین‌و پاكترین شێوە ژیان‌و گوزەران، هەروەها كتێبی بەرزو بەپێزو پیرۆزی خوا ئامۆژگاری پەروەردگاره (عزّوجل) بۆ بەندەكانی‌و شیفاو چارە سەری دەردو نەخۆشییەكانیان‌و ڕێ پیشاندەریانەو مایەی دابەزینی بەبەزەیی‌و سۆزی خوای خاوەن بەزەییە بۆ سەریان لە دنیاو دوارۆژدا.

(6) ﴿الر كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾[2]، واتە: ئەلیف، لام، ڕا، ئەم (قورئان)ە كتێبێكە بۆ لای تۆمان ناردۆتە خوارێ تاكو خەڵكی بە یارمەتی پەروەردگاریان لە تاریكییەكانەوە دەربێنی‌و بەرەو ڕووناكییان بێنێ بەرەو ڕێبازی (خوای) زاڵی ستایشكراو. كەواتە: ئامانج‌و حیكمەتی هاتنە خوارەوەی قورئان دەربازكردن‌و قوتاركردنی خەڵكییە لە هەموو جۆرەكانی تاریكی چ لە ڕووی فیكرو عەقیدەوە، چ لەڕووی كۆمەڵایەتییەوە، چ لە ڕووی خووڕەوشتەوە، چ لە ڕووی حوكم‌و سیاسەتەوە... هتد، بەرەو

[1] ( یونس – 57 ).
[2] ( إبراهيم 1 ).

ڕووناكی هیدایەت‌و شەریعەتی خوای كار بەجێ‌و بە بەزەیی‌و داد گەر (سبحانەو تعالـی).

(لا) ﴿أَفَغَيْرَ اللهِ أَبْتَغِي حَكَماً وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلاً وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِنْ رَبِّكَ بِالْحَقِّ فَلا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ۞ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقاً وَعَدْلاً لا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾[تر]،

واتە: ئایا جگە لە خوا دادوەرو حوكمڕانێكی دیكە بخوازم لە كاتێكدا كە ئەو كتێبەی بۆ لای ناردوون زۆر ڕوونە (و هەموو بەرنامەكانی ژیانی تێدا خراونەڕوو)؟! بێگومان ئەوانەش كە كتێبمان پێداون ـ لە پێش ئێوەدا ـ دەزانن كە هەقە، وە لە پەروەردگارتەوە هاتۆتەخوارێ، بۆیە بە هیچ جۆرێك لە دوودڵان مەبە (لەبارەی ڕاست‌و ڕەوا یی قورئانەوە)، وە وشەی پەروەردگارت لە ڕاستیی‌و دادگەرییدا تەواوی كردوە، (بۆیە) گۆڕەر بۆ وشەكانی نیە وە ئەو بیسەرو زانایە .

كەواتە: كتێبی كۆتایی خوا قورئانی مەزن‌و بەرزو بەڕێزو كار بەجێ‌و ڕوون‌و زاڵ[یر]، بۆ ئەوە دا بەزێنراوە ـ وەك سەرجەم كتێب‌و فەرمایشتەكانی دیكەی خوا (عزّوجل) ـ كە بەرنامەو ڕێبازی ژین بێت‌و سەرەنجام بەهۆی گێڕانی قورئانەوە بە بەرنامەی ژین، تەنها خواش بەرنامە دانەرو دادوەر (مشرِّع و حكم) بێت! ئێستاش با سەرنجی دە

---

(تر) (الأنعام - 114،115).

(یر) قورئان بە (عظیم) و (عَلي) و (كریم) و (مبین) و (عزیز) وەسف كراوە. وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعاً مِنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ﴾ (الحجر ـ87)، ﴿وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾ (الزخرف ـ4)، ﴿الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَقُرْآنٍ مُبِينٍ﴾ (الحجر ـ1)، ﴿...وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ﴾ (فصلت ـ41).

ئایەت لە سوورەتی (المائدة) بدەین تاکو زۆرباش بۆمان ڕوون بێتەوە کە ئامانجی نێررانە خواری سەرجەم کتێبەکانی خوای پەروەردگار تبارك و تعالی بە تایبەت تەورات و ئینجیل و قورئان کە بۆ (موو ساو عیساو موحەممەد) ﴿صلی الله تعالی علیهم وسلم﴾ هاتوون، چی بووە؟!

**دووەم: ئامانجی نێررانە خواری کتێبەکانی خوا بەگشتی:**

خوای پاك و تاك (سبحانه وتعالی) فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لا يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ مِنَ الَّذِينَ قَالُوا آمَنَّا بِأَفْوَاهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِنْ قُلُوبُهُمْ وَمِنَ الَّذِينَ هَادُوا سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِنْ بَعْدِ مَوَاضِعِهِ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَذَا فَخُذُوهُ وَإِنْ لَمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا وَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَنْ تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً أُولَئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ۞ سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِنْ تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَنْ يَضُرُّوكَ شَيْئاً وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ۞ وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِنْدَهُمُ التَّوْرَاةُ فِيهَا حُكْمُ اللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ. إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدىً وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُوا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ وَكَانُوا عَلَيْهِ شُهَدَاءَ فَلا تَخْشَوُا النَّاسَ وَاخْشَوْنِ وَلا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ۞ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالْأَنْفَ بِالْأَنْفِ وَالْأُذُنَ بِالْأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَنْ تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ۞ وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ فِيهِ هُدىً وَنُورٌ وَمُصَدِّقاً

لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَهُدىً وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ ۞ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ الْإِنْجِيلِ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فِيهِ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ. وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ لِكل جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاءَ اللهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِنْ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ إِلَى اللهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ۞ وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللهُ إِلَيْكَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللهُ أَنْ يُصِيبَهُمْ بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيراً مِنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ ۞ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾[1].

شایانی باسە کە ئەم دە (لالا) ئایەتە بە گشتی دا بەش دە بن بۆ سێ دەستەو کۆمەڵو هەرچەندە هەموویان بە گشتی باسی بابەتێك دەکەن، بەڵام هەرکام لەو سێ دەستەو کۆمەڵەش باسی لایەنێکی ئەو بابەتە دەکەن.

## کـۆمەڵــی یەکــەم :

کە سێ ئایەتی یەکەمن (لالا،لالا،لالا)و بە کورتی مانایە کەیان ئاوا یە: (ئەی رەوانەکراو! ﴿(کە مەبە ست (محمد)ە﴾ ﷺ با دڵ تەنگت نەکات (هەڵوێستی) ئەوانەی کە خێرایی دەکەن لە کوفردا لەوا نەی کە بەزار گوتوویانە ئیمانمان هێناوە بەڵام دڵیان ئیمانی نەهێناوە، وە لە جوولەکەکان، زۆر گوێ بۆ درۆ دەگرن، گوێ بۆ کەسانێکی دیکە دەگرن کە نەهاتوو نە لات وشەکانی ـ ی خوا ـ پاش دانرانیان لە جێی خۆیاندا دەگۆڕنو لا دەدەن!

(1) ( المائدة 41 - 50 ).

دەڵێن: ئەگەر ئەم بڕیارەتان بۆ درا ئەوە وەری بگرن، بەڵام ئەگەر ئەو نەبوو وەری مەگرن‌و وریابن! هەرکەسێکیش خوا بیەوێ تووشی بەڵای بکات تۆ هیچت بۆی لە دەست نایەت لە لایەن خواوە، ئەوانەش کەسانێکن کە خوا نەیویستوە دڵیان پاك بکاتەوە، لە دنیادا شەرمەزاریی یان هەیەو لە دوارۆژیشدا ئازارێکی گەورەیان هەیە. (ئەوانە) زۆر گوێ بۆ درۆ دەگرن‌و زۆریش حەرام دەخۆن، جا هەرکات هاتنەلات (سەرپشك بەو) دادوەریی‌یان لە نێواندا بکە یان پشت گوێیان بخە! جا ئەگەر پشتگوێیان بخەی ئەوە هیچ زیانت لێنادەن‌و ئەگەر حوکمیشت لە نێوان دا کردن، ئەوە بە دادگەریی دادوەریی بکە، بێگومان خوا دادگەرانی خۆش دەوێت.

توێژەرەوانی قورئان لەبارەی هۆی هاتنەخوار ( سبب نزول)ی ئەم سێ ئایەتە چەند بەسەرهاتێکیان باس کردوە بەتایبەت (الطبري)و (القرطبي): کە دووانیان هەم لە ڕووی سەنەدەوە بەهێزن‌و هەم لە ڕووی عەقڵی یەوە لەگەڵ نێوەڕۆکی ئایەتەکاندا گونجاون‌و ئێمەش هەردووکیان دێنین تاکو چەمك‌و واتای ئایەتەکان لەبەرچاومان ڕۆشنتربێت:

### (١) بەسەرهاتی ژن‌و پیاوێکی جوولەکە کە زینایان کردوە:

ئەم بەسەرهاتە هەرکام لە (بخاري ومسلم ومالك وترمذي وأبوداود وإبن ماجە وأحمد)[١] بە چەند شێوەیەك هێناویانە، ئەمە یەکێکیانە:

((پیاوێکی خەڵکی (فەدەك) زینای کردبوو، جا خەڵکی فەدەك نامەیان نارد بۆ کەسانێکی جوولەکە لە مەدینە کە لەوبارەوە پرسیار لە موحەممەد

[١] بڕوانە: (تفسير الطبري) ج (6) (248- 253)، وە (القرطبي) ج6 ص (١١١ -١١١).

بکەن، جا ئەگەر فەرمانی پێکردن بە جەڵدە لێدان وەریگرن، بەڵام ئەگەر فەرمانی پێکردن بە بەردباران کردن وەریمەگرن، ئەوانیش پرسیاریان لێ کرد، ئەویش (ابن صوريا)ی کە زانایان بوو وە یەك چاویش بوو، بانگ کردو پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((أنشدك الله كيف تجِدون حَدَّ الزّاني في كتابكم؟)) واتە: بەناوی خوا لێت دەپرسم سزای زینا لە کتێبەکەتاندا چیە؟! ئەویش گوتی: مادام بە ناوی خوا داوات لێم کرد (پێت بڵێم بە ناچاری پێت دەڵێم)[تر]: ئێمە لە تەوراتدا دەبینین: کە ڕوانین (ی ئارەزوومەندانە)[2] زینایەو دەست لە ملکردن زینایەو ماچکردن زینایە، جا هەرکات چوارکەس شایەدی یاندا کە چووکی پیاوەکەیان لەگەڵـی ئافرەتەکەدا بینیوە وەك کلـ چێوك لە کلداندا، ئەوە بەردباران کردن پێویست بووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (هو ذاك) ئەوە وایە[3].

وە ئەمەش یەکی دیکەیە لەو ڕیوایەتـــانە:

((کابرایەکی جوولەکەیان بەلای پێغەمبەردا ﷺ هێنا کە ڕووی ڕەش کرابووو قەمچی لێدرابوو، ئەویش بانگی کردنو فەرمووی: ئایا لە کتێبەکەتاندا سزای زینا ئاوایە؟!

گوتیان: بەڵێ، جایەکێ لە زانایانیانی بانگ کردو فەرمووی: بەناوی ئەو خوایە لێت دەپرسم کە تەوراتی بۆ مووسا دابەزاندوە، ئایا سزای زینا لە کتێبەکەتاندا ئاوایە؟! گوتی: نەء، وە ئەگەر ئاوا داوات لێنەکردبامایە پێم نەدەگوتی، بەڵکو بەردباران کردنە، بەڵام چونکە زینا لەنێو ناودارەکانماندا

(تر) و (2) ئەوەی نێوان کە وانەکان خۆم زیادم کردوە بۆ ڕوونتربوونەوە ماناکەی..

(3) بڕوانە: تفسير (القرطبي) (ج6 ، 156)، بە ژمارە (2685)، کە گوتوویەتی: (و في غير الصَّحيحين عن الشعبي عن جابر بن عبدالله).

زۆر بوو جا کاتێك پایەدارێکمان زینای کردبایە وازمان لێ دێنا و ئەگەر بێهێزێکیش بووایە سزامان دەدا، گوتمان: وەرن با لەسەر شتێك رێك بکەوین کەلە سەر پایەدارو بێ پایەی جێبەجێ بکەین، ئیدی ڕووڕەش کردنو قەمچی لێدانمان لە جێی بەردباران کردن دانا! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((أللهم إني أول مَنْ أحْيا أمركَ إذ أماتُوه) خوا یە! من یەکەمین کەسم فەرمانی تۆم ژیاندەوە دوای ئەوەی مرا ندبوویان، ئنجا فەرمانی کردو بەردباران کرا ...))[تر].

**(لا) بەسەرهاتی خوێن دانی هەردوو تیرەی (بنو النضیرو بنو قریظة)ی جوولەکە:**

((بەنوو نەضیرو بەنوو قورەیظە هەبوون، وە بەنوو نەضیر بالاًدەستتر بوون لە بەنوو قوریظە بۆیە هەرکات پیاوێکی (بَنُو قريظة) پیاوێکی (بنو النضیر)ی کوشتبایە پێی دەکوژرایەوە، بەلاًم ئەگەر پیاوێکی (بنو النضیر) پیاوێکی (بنو قریظة)ی کوشتبایە سەد وەسق خورمای لە خوێندا دەدرا، جا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانەکرا پیاوێکی (بنو النضیر) پیاوێکی (بنو قریظة)ی کوشت، گوتیان: تەسلیممان بکەن تاکو بیکوژین، گوتیان: پێغەمبەر ﷺ مان لە نێوان دا بێ، ئیدی (وان حکمت فاحکم بینهم بالقسط) هاتە خوارێ ... ))[یر].

کەواتە ئێستا دەتوانین بڵێین:

پوختەی مەبەستی ئەو سێ ئایەتە ئەوەیە کە خوای کاربەجێ ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا (محمد) ﷺ دەکات کە بەهۆی دژایەتیکردنی دەغەڵو

---

(تر) رواه مسلم، (القرطبي) ج6 ص (156)، ژمارە: (2687).

(یر) رواه النسائي و أبو داود عن أبن عباس، (القرطبي) ج6 ص (160).

جووله‌كه‌كان (المنافقون واليهود)ەوە دڵتەنگ نەبێ، كە دەیانەوێ بە فرتو فێڵو تەڵەكەبازیی حوكمی شەرعی پێ بگۆڕنو ئەوەی كە خوا لە كتێبەكانی خۆیدا ناردوویەتە خوارێ حوكمی پێ نەكرێ!

هەروەها خوای دادگەر پێغەمبەری خۆی لەوەدا سەرپشك كردوە كە ئەگەر ئەهلی كیتاب كێشە نێوخۆیی یەكانی خۆیانیان هێنا یە لا حوكم یان لە بەیندا بكات یان وازیان لێ بێنێ، بەڵام هەركات دادوەر یی كرد نی لە نێوانیاندا هەڵبژارد ئەوە پێویستە دادگەرانەو بەوجۆرە كە كتێ بی خوا فەرموویەتی حوكم بكات. بەڵام لێرەدا بە پێوی ستی دەزانم هەڵوە ستە لە بەرانبەر سێ مەسەلەدا بكەین:

أ ـ ئەو قسەیەی زانای جوولەكەكان كە لە هەندێك ڕیوایەتدا بە ( صوريا) ناوبراوە كە دەڵێ: ((... فكنّا اذا أ خذنا ال شريف ترك ناه، واذا أ خذنا الضّعيف أقَمْنا عليه الحدَّ) ئەمە بناغەی تێك چوونی كۆمەڵگا یە. وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەسەرهاتی دزیی كردنی ئافرە تە مەخزوومیی یەكەدا فەرموویەتی: ((إنما أهلك من كان قبلكم أنَّ هم اذا سرق فيهم الشريف تركوه واذا سرق فيهم الضّعيف أقاموا عليه ا لحدَّ))[تر]، وا تە: بێگومان ئەوەی گەلانی پێش ئێوەی فەوتاند ئەوەبوو كە ئەگەر ناودار ێك دزیی كردبایە وازیان لێدەهێنا بەڵام ئە گەر بابا یەكی بێهێز دز یی كردبایە سزایان دەدا!

بەڵێ یەكێك لە هۆ كارە كاری گەرەكانی تێك چوونی كۆ مەڵگاكان جێبەجێكردنی یاسایە بەسەر خەڵكی بێدەسەڵاتداو بواردنی خەڵكی دەسەڵاتدارە.

---

(تر) رواه البخاري.

ب ـ ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمووی: ((أللهم إني أوَّلُ من أحيا أمرك بعد إذ أماتوهُ)) ئەی خوایە! من یەکەمین کەسم کە فەرمانی تۆم ژیاندەوە پاش ئەوەی مراندبوویان! ئەم فەرمایشتە ئەوە دەگەیەنێ کە جێبەجێکردنی حوکمو فەرمانەکانی کتێبی خوا مانای زیندوویێتی یەتیو پشتگوێ خستنو کار پێ نەکردنیشیان مانای مراندنو نەمانیەتی!

ج ـ هەردوو تیرەی جوولەکە: (بنو النضير و بنو قريظة) کە بەحیساب پابەندبوونە بەو کتێبی خۆیان، تەوراتەوە، بەڵام لەسەر بناغەی بەرزییو نزمیی هێزەکانیان (بنو النضير) دوو قاتی (بنو قريظة) خوێنیان وەرگرتوە! کە لە ڕاستیدا ئەم جیاوازیەش لە جێبەجێکردنی یاسادا هۆکارێکی دیکەی وێرانبوونی وڵاتو کۆمەڵگایە، ئەم حاڵەتەش ئەوە دەگەیەنێ کە لە جیاتی یاساو شەریعەت هێزو دەسەڵات سەروەرو باڵادەستە! بەڵام دوای هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ و بڵاوبوونەوەی ئیسلام، یەکسەر خەڵکی زانیویەتی کە لە هەرجێیەك کتێبو شەریعەتی پێغەمبەری کۆتایی دەستەڵاتی هەبێو دەستی بڕوات ڕێی ئەو (بانێکەو دوو هەوایە) نادات، هەربۆیەش (بنو قريظة) کە پێش ئیسلام ملیان بۆ زوڵمو ستەمی (بنو النضير) ڕاکێشاوە پاش هاتنی ئیسلامو موحەممەد ﷺ غیـرەتیان جووڵاوەو سکاڵای خۆیان لە لای پێغەمبەری خوا کردوەو ئەویش ئەو تەرازووە لاسەنگەی ڕاست کردۆتەوە!

ئێستاش بابچینە سەر ڕوونکردنەوەی چەمكو واتای کۆمەڵەی دووەم لەو دە ئایەتە:

## کـۆمـەڵی دووەم :

که چوار ئایەتی نێوه ڕا ست (لالا,لالا,لالا,لالا) مانا کەیان به کورتی ئاوایە:

((ئێمه تەوراتمان نارده خوارێ ڕێن ماییو ڕوو ناکی ت ێدابوو، ئەو پێغەمبەرانەی بۆ خوا ملکەچ بووبوونو مشوورخۆرانو زانایانی (جووله که) حوکمیان پێ بەسەر جوولەکەکاندا دەکرد، له سۆنگەی ئەوەوه که پارا ستنی کتێبی خوایان پێ سپێرابوو وه چاودێریش بوون بەسەریەوه، (پێیان گوترا) له خەڵکی مەترسنو لەمن بترسن وه به ئایەتەکانم نرخێ کی کەم مەکڕن، وه هەرکەسێك بەوەی که خوا ناردوویەته خوارێ حوکم نەکات ئەوانەن کافران. وه تێیدا لەسەریان نووسیبوومان که نەفس به نەفسەو چاو بەچاوەو لووت به لووتەو گوێ به گوێیەو ددان به ددانەو برینەکانیش تۆ ڵەیان هه یه، بەڵام هەرکەسێك بیکاته خێر (و بابای کەتنکەر ببەخ شێ) ئەوه بۆی دەبێ تـه مایەی سڕانەوەی گوناهەکانی، هەرکه سێکیش بەوه حوکمی نەکرد که ناردوومانەته خوارێ ئەوه ئەوانەن ستەمکاران. وه به شوێنیاندا عی سای کوڕی مەریەممان نارد که ئەو تەوراتەی پێش وی هاتبوو بەڕاستی دەزا نی، وه ئینجیلیشمان پێدا، ڕێنماییو ڕووناکی تێدابوو، وه ئەو تەوراتەی له پێشیەوه بوو بەڕاستی دەزانی. وه ڕێنماییو ئامۆژگاری بوو بۆ پارێزکاران. (وه پێ مان گوتن) با ئەهلی ئینجیل ئەوەی که خوا تێیدا ناردوویه ته خوارێ حوکمی پێبکەن، وه هەرکەسێك حوکم بەوه نەکات که خوا ناردوویەته خوارێ ـ ئەو ئەوانەن لارێ بووان)).

شایانی باسه که بابەتی ئەم چوار ئایەتەش هەمان بابەتی سێ ئا یەتی پێشوویه، هەربۆیەش توێژەرەوانی قورئان ئەم ئایەتانەشیان پەیوەست کردوه به هەمان ئەو بەسەر هاتانەوه که له تەفسیری سێ ئایەتی پێشوودا وەك هۆی هاتنه خوار (سبب النزول) باسمان کردن.

لەبەردەم ئەم ئایەتانەشدا چەند هەڵوەستەیەك بە پێویست دەزانم:

أـ خوای كاربەجێ لە پێناسەی هەركام لە تەورات‌و ئینجیلدا ڕایگەیاندووە كە:

(لا) ڕێنمایی‌و ڕووناكی تێدایە: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدىً﴾، ﴿وَآتَيْنَاهُ الإِنْجِيلَ فِيهِ هُدىً وَنُورٌ﴾.

(لا) پێویستە بكرێتە بەرنامەی ژیان‌و حوكمی پێ بكرێ: ﴿يَحْكُمُ بِهَا النبيونَ الذِينَ أَسْلَمُوا﴾، ﴿وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ الإِنْجِيلِ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فِيهِ﴾.

كەوا تە: كتێ بەكانی خوا ڕێن مایی‌و ڕێنیـ شاندان‌و ڕۆ شنایی‌و ڕووناكیین بۆ خەڵكی‌و بۆیە نێرراونە خوار كە خەڵكی لەبەر ڕۆشنایی یاندا بەڕێوەبچێ‌و ژ یان‌و گوزەرانی خۆی ڕ ێك بخات. وە لە سەر مشوورخۆرانی ئەهلـی ئیمان‌و زاناو پێشەوایانیان پێویستە كە حوكم بە كتێبی خواو شەریعەتی خوا بكەن‌و ئەو یاسایانەی كە تێیا ندان پیادەیان بكەن.

ب ـ خوای بەرزو مەزن لە باسی حوكم پێكرد نی تەورا تدا فەرموو یەتی: ﴿يَحْكُمُ بِهَا النبيونَ الذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُوا مِنْ كِتَابِ اللهِ وَكَانُوا عَلَيْهِ شُهَدَاءَ﴾ جا ئەم ڕستە قورئانی یە چەند ڕاستییەكی گرنگی لـێ وەردەگیرێن:

(●) مشوورخۆران‌و زا ناو پێ شەوایانیش كە جێگر یی پێغەمـ بەرانن (عليهم السلام) وەك وان حوكم پێكردنی كتێبی خوایان لەسەر فەرزە، هەربۆیەش خوای كاربەجێ لە یەك سیاقداو یەك بە دوای یەكدا باسی كردوون!

(●) كۆمەڵگای مسوڵمان وەك چۆن پـەكی لە سەر زا ناو پێ شەوایان كەوتوە، بەهەمان شێوەش پێویستی بە مـ شوورخۆر سیا ستمەدارانیش هەیە، بەڵێ وێڕای (أحبار) (ربّانیون)یش پێوی ستن، تو ێژەروانیش،

(أحبار)یان بە زانایان (علماء)و (ربّانیون)ی شیان بە مە شوورخۆرو سیاسەتمەداران لێك داوەتەوە، بۆ نموونە (طبري) گوتوویەتی: (الربّانیون، جمع ربّاني وهم العلماء الحكماء البصراء بسیاسة الناس وتدبیر أمورهم والقیام بمصالحهم ... والأحبار هم العلماء ... فأنهم جمع الحبْر، وهو العالم المُحْكِمُ للشيء ...)[ت]، بەلام هەرکام لە مشوورخۆران‌و پێشەوایان پێویستە بەپێی ڕێنمایی کتێبی خواو لەبەر ڕۆشنایی‌یەکەیدا پێشەوایەتی مەسولمانان بکەن‌و مەشووری کاروباریان بخۆن!

ج ـ خوای زاناو توانا کەسانێك کە حوکم بەوە ناکەن کە ناردوویەتە خوار بەسێ جۆرە وەسف پێناسە دەکات کە بریتین لە: (کفرو ظلم و فسق). ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ .. الظَّالِمُونَ .. الْفَاسِقُونَ﴾ .

جا من وای بۆ دەچم کە حیکمەتی ڕیزکرانی ئەو سێ وەسفە بۆ کەسانی لادەرو وازهێنەر لە حوکمی بەرنامەی خوا (تبارك‌و تعالی) ئەوەیە کە لادان لە کتێب‌و بەرنامەی خوا سێ ڕووی هەن:

ڕوویەکی عەقیدەیی‌و فیکریی.
ڕوویەکی دەستووریی‌و مافیی (حقوقي).
ڕوویەکی ئەخلاقیی‌و مەعنەویی.
کەواتە: کەسێك کە حوکم بە کتێب‌و بەرنامەی خوا ناکات:
لەڕووی عەقیدەیی‌و فیکریی‌یەوە دووچاری بێبڕوایی (کفر) بووە.
لە ڕووی دەستووریی‌و مافیی‌یەوە دووچاری ستەم (ظلم) بووە.

---

(ت) بڕوانە: (تفسیر الطبري) ج (6) ص (لالالا)، وە بڕوانە: (تفسیر القرطبي) ج(ل) ص (لالالا ، لالالا).

لە ڕووی ئەخلاقییو مەعنەویشیەوە دووچاری لادان (فسق) بووە.

د ـ توێژەرەوانی قورئان لە بارەی ڕستەی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ قسەو باسی زۆریان کردوون کە من هەوڵ دەدەم لە چەند بڕگەیەکدا ئاماژەیان پێ بکەمو چیشم لە نێوانیاندا پێ پەسند یان پەسند تربوو دیاری دەکەم:

(لا) لەوبارەوە کە ئایا ئەم ڕستەیەو هەردوو ڕستەکەی دوابیش:
﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ و ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ أُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ .

دەربارەی کێ هاتوونە خوارێ؟ زانایان چەند ڕایەکیان هەیە:

یەك: لەبارەی جوولەکەکانەوە هاتوونە خوارێ.

دوو: لەبارەی جوولەکەو نەصرانییو مسوڵمانانو.. هەرکەسێکی دیکەوە هاتوونە خوارێ کە خۆیان بە ئەهلی دینو خاوەن کتێبی ئاسمانی دەزانن.

سێ: ڕستەی یەکەم ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ دەربارەی مسوڵمانانو هی دووەم دەربارەی جوولەکەو هی سێیەمیش دەربارەی نەصرانییەکان هاتوونە خوارێ.

شایانی باسیشە هەرکام لە (طبري)و (قرطبي) هەرکام لەو سێ ڕایەیان هێناونو هەردووکیشیان ئەو ڕایەیان پەسند کردوە کە ئەو سێ ڕستەیە هەر سێکیان لە بارەی کافرەکانی ئەهلی کیتابەوە هاتوون[تر] .

---

(تر) بڕوانە: (تفسير الطبري) ج(6) ص (لالالا– لالال)، وە (تفسير القرطبي) ج(لا) ص (لالالا لالال).

منیش وای بۆ دەچم کە ئەو ڕایە ڕاستتربێت کە دەڵێ لە بارەی کافرانی جوولەکەو نەصڕانییەوە هاتوون، بەڵام بێگومان حوکمو ماناکەیان تایبەت نیە بەوانەوەو گشتیی یە، وەك گوتراوە: (إنَّ خصوص السّبب لایمنع شمول المعنی) وەك دواییی باسی دەکەین، ئەوەی ناچاریشمان دەکات بڵێین ئەم ئایەتانە لە بارەی کافرانی جوولەکەو نەصڕانییەوە هاتوون، سیاقی ئایەتەکانو ئەو بە سەرهاتانەن کە پێشتر هێنامانو ئەم فەرموودەیەشە کە پێشتر تەرجەمەمان کردو (مسلم) لە (البراء بن عازب)ەوە هێناویەتی[تر]:((عن البراء بن عازب قال: مُرَّ علی النبـي ﷺ بیهوديّ مُحَمَّمٍ مَجْلودٍ، فدعاهم فقال: هکذا تجِدون حَدَّ مَنْ زنی؟! قالوا: نعم، فدعا رجلاً منْ علمائهم فقال: أنشدك الله الذي أنزل التوراة علی موسی، هکذا تجِدون حدَّ الزاني في کتابکم؟ قال: لا، ولولا أنك أنشدْتني بهذا لم أُخْبِرْك، نجِدُ حدَّه في کتابنا الرجم، ولکنه کثر في أشرافنا، فکنا اذا أخذنا الشریف تَرکْناهُ واذا أخذنا الوضیع أقمنا علیه الحّد. فقلنا تعالوا فلْنجتمِعْ جمیعاً علی التحمیم و الجلد مکان الرجم. فقال رسول الله ﷺ: أللهم إني أول مَنْ أحیا أمرك إذا ماتوهُ، فأمر به فرُجِمَ، فأنزل الله: ﴿یَا أَیُّهَا الرَّسُولُ لا یَحْزُنْكَ الذِینَ یُسَارِعُونَ فِي الْکُفْرِ﴾[1] الی قوله: ﴿وَمَنْ لَمْ یَحْکُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْکَافِرُونَ﴾ یعنی الیهود، ﴿..فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ یعني الیهود، ﴿...فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ للکفّار کلّها)).

---

(تر) بڕوانە: (تفسیر الطبري) ج(6) ص (ﻻﻻﻻ  ﻻﻻﻻ)، وفي (صحیح مسلم) برقم (ﻻﻻﻻ)، و رواه أبو داود برقم: ﻻﻻﻻﻻ وﻻﻻﻻﻻ، وأبن ماجه برقم (ﻻﻻﻻﻻ)، وابن جریر الطبري.

(1) ( المائدة – 41 ).

(لا) وە لەوبارەوە کە ئایا حوکمو واتای ئەم سێ ڕستەیە تەنیا جوولە کەو نەصرانییەکافرەکان ـ واتە ئەوانەی نەهاتوونو نایەنە نێو ئیسلامەوە ـ دەگرێتەوە، یان گشتیی‌یەو هەرکەسێکی دیکەش کە وەك وان حوکم بە کتێبی خوا (عزّوجل) نەکات، دەگرێتەوە؟!

دیسان زاناو توێژەرەوانی قورئان چەند ڕایەکیان هەن:

یـــەك: تایبەتە بە جوولەکەکانەوە.

دوو: تایبەتە بە جوولەکەو نەصرانیی‌و هاوبەش دانەران (مشركين)ەوە.

ســێ: گشتیی‌یەو هەرکەسێك ئەو سیفەتەی تێدابێ (واتەسیفەتی حوکم نەکردن بەوە کە خوا ناردوویەتە خوارێ) ئەو حوکمە دەیگرێتەوەو هیچکەسی لـێ هەڵنەوێرراوە.

ڕای ڕاستیش ـ بە بۆچوونی بەندە ـ هەر ڕای سێیەمە کە زۆر بەی هەرە زۆری زانایانو توێژەرەوانی قورئانیش پەسندیان کردوە، بەڵام نەك ئاوا بەرِەهایی بەڵكو بە بەندو مەرج (قيد وشرط)ەوە وەك لە برِگەی سێیەم دا ڕوونی دەکەینەوە.

(لا) ئایا مەبەست لە (كُفرو ظُلْمو فسِقْ) لەو سێ شوێنەدا چیە؟!

وەك لە ئایەتەکانی (لالا،لالا،لالا)دا دەبینین خوای کاربەجێ بەڕوونی‌و ڕاشکاوی ڕایگەیاندوە کە هەرکەسێك بەوە حوکم نەکات کە ناردوویەتە خوارێ ئەوە (کافر)و(ظالم)و(فاسق)ە، جا ئایا مەبەست لەو کافربوونو زاڵم بوونو فاسق بوونە چیەو چۆنە؟! زانایانو توێژەرەوانی قورئان هەر لە ڕۆژگاری هاوەڵان (أصحاب)ەوە هەتا ئەمڕۆ لەوبارەوە ڕا جیایی‌و مشتومڕیان هەبووەو هەیە، جا ئێمە سەرەتا سەرجەم ڕاوبۆچوونەکان دێنینو دەیانخەینە ڕوو، پاشان ئەوەی کە پێمان وابوو ڕاستە یان ڕاسترەو لە ڕووی بەڵگەوە بەهێزترو پشت ئەستوورترە هەڵی دەبژێرین:

یـــەك: بەشێك لە زانایان گوتوویانە مەبەست لە كوفرو زوڵم‌و فیـسق لەم ئایەتانەدا كوفری گەورەو زوڵمی گەورەو فیسقی گەورەیەو هەر حوكمرانێك حوكمی بە شەریعەتی خوا نەكردبێ‌و نەكات، ئەوە بە كافرو زاڵم‌و فاسق دادەنرێ‌و فڕی بەسەر ئیسلام‌و ئیمانەوە نامێنێ! شایانی باسیشە ئەم بەشەی زانایان دەڵێن: یەكسانیشە ئەو شتەی كە باسی حوكمڕان، تێیدا لە حوكمی شەریعەت لادەدات، مەسەلەیەك‌و دووان بێت یان زیاتر، هەرچۆن بێ كافر دەبێ، چونكە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان مەسەلەیەكی تایبەت‌و دیاریكراو بووە كە جوولەكەكان تێیدا لە حوكمی شەرعیان لاداوە! ئێستاش با ئاماژە یەكی كورت بكەین بە قسەی هەندێك لەو زانا پێشەوایانەی كە ئەم ڕای یەكەمەیان پەسند كردوە:

* (عبدالله بن مسعود) خوا لێی ڕازی بێ، (طبـري)[تر] هێناویەتی كە (عَلْقمة ومسروق) لەبارەی بەرتیل (رشوة) پرسیاریان لێ كردوە ئەویش گوتوویەتی: (من السّحت) جۆرێكە لە حەرام، ئەوانیش گوتوویانە: ئەگەر لەبواری حوكمیش دابێ؟! گوتوویەتی: ئەگەر وابێ كوفرە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾.
* (حذيفة بن اليمان) خوالێی ڕازی بێ، (طبـري)[ير] هێناویەتی كە پیاوێك لەبارەی ئەم ئایەتانەوە پرسیاری لێكردوە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ

---

(تر) (جامع البيان) ج (6) ص (ﻻﻻﻻ).

(ير) هەمان سەرچاوە: ج (6) ص (ﻻﻻﻻ)، بە ژمارە (ﻻﻻﻻﻻﻻ) ،أخرجه الحاكم من طريق أخر و قال صحيح على شرط الشيخين.

بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ...فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ...فَأُولَـئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ گوتوویەتی، دەڵێن: ئەوە دەربارەی بەنی ئیسرائیلە؟! ئەویش گوتوویەتی: ((نعم الأخوة لكم بنو إسرائيل ان كانت لهم كل مُرَّة ولكم كل حُلْوة، كلاّ والله لَتَسْلُكنَّ طريقهم قدر الشراك)) واتە: بەنی ئیسرائیل چاکترین براتانن ئەگەر هەرچی تاڵە بۆ وان بێتو هەرچی شیرینیشە بۆ ئێوە بێت، نەخێر، بەخوا موو بەموو بەرِێی واندا دەڕۆن.

* (الحسن البصري) - خوا لێی خۆش بێ -، (طبـري)[تر] هێناویەتی کە لەبارەی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ گوتوویەتی: (نزلت فـي اليهود و هي علينا واجبة) دەربارەی جوولەکە هاتۆتە خواریو لەسەر ئێمەش پێویستە.

* (السُّدّي) - خوا لێی خۆش بێ -، (طبـري)[یر]، هێناویەتی کە لەبارەی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ...﴾ گوتوویەتی: (و من لم يحكم بما أنزلت فتـركه عمداً وجار وهو يعلم فهو من الكافرين) واتە: هەرکەسێك بەوە حوکم نەکات کە ناردوومەتە خواریو بە ئانقەست وازی لـی بێنێو ستەم بکاتو بشزانێ کە ستەمە، ئەوە لە کافرانە.

دوو: بەشێکیش لە زانایان گوتوویانە مەبەست لە کوفرو زوڵمو فیسق لێرەدا (کفرو ظلمو فسق)ی گچکەیە نەك هی گەورە کە مرۆڤی پێ لە بازنەی ئیمانو ئیسلام دەردەچێ.

---

(تر) (جامع البيان) ج (6) ص (ﻻﻻﻻ)، ژمارە (ﻻﻻﻻﻻﻻ).
(یر) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە، ژمارە (11980).

وەك (طبـري) لەوبارەوە[تر]:

* لە (عطاء)ەوە  خوا لێی خۆش بێت  هێناویەتی  کە گوتوو یەتی: (کفر دون کفرٍ و ظُلْمٌ دون ظلمٍ، و فـ سقٌ دون فِـ سْقٍ) وا تە: کوفری گچکەو ستەمی گچکەو لادانی گچکەیە.

* وەلە (طاوس)ەوە  خوا لێی خۆش بێ - هێناویەتی کە گوتوو یەتی: (لَیْس بکفرٌ یَنْقُلُ عن المِـلَّةِ) واتە: ئەوە کوفرێك نیە کە ئینـ سان لە دین بەرێتە دەرێ.

* وە لە (ا بن عـ بّاس)ەوە  خوا لـ ێی ڕازی بێ - هێناو یەتی کە گوتوویەتی: (هي به کفرٌ و لَیْس کفراً بالله وملائکته و کتبه و رُ سُلِهِ) واتە: ئەوە بۆی کوفرە، بەڵام کوفر بە خواو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرەکانی، نا.

سـێ: بەشێکیشیان گوتوویانە: مەبەست لێرەدا کەسانێکە کە حوکم بە شەریعەتی خوا ناکەنو نکۆڵیی لـێ دەکەنو دانی پـ ێدا ناهێنن! وەك (طبـري) لەوبارەوە گوتوویەتی[یر]: (وقال آخرون: معنی ذ لك: ومن لم یحکم بما أنزل الله جاحداً به، فأما الظلم و الفسق فهو للمُقّرّبه ... عن أبن عباس قوله: ﴿وَمَنْ لَمْ یَحْکُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَـ ئِكَ هُمُ الْکَافِرُونَ﴾ قال: مَنْ جَحَد ماأنزل الله فقد کفر ومن أقرَّ به و لم یحکم فهو ظالِمٌ فاسِقٌ) واتە: وە بەشێکیان گوتوویانە: ما نای ئەوە: وە هەرکەسێك حوکم بەوە ناکات کە خوا ناردوویەتە خوارێو نکوولّیی لـێبکاتو دانی پێدا نەهێنێ، بەڵام سیفەتی ستەمو لادان ئەوە بۆ کەسێکە کە دانی پێدا بێنێ.

---

(تر) هەمان سەرچاوە ، ص (ﻻﻻﻻ) ، ژمارە (11965 و11970 و11971).

(یر) هـەمان بەرگ، ص (ﻻﻻﻻ-ﻻﻻﻻ).

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس لەبارەی قسەی خوا: ((وە هەرکە سێك بەوە حوکم نەکات کە خوا ناردوویەتە خوارێ ئەوە ئەوانەن کافران)) گوتوویەتی: هەرکەسێك دان بەوەدا نەهێنێ کە خوا ناردوویە تە خوارێ ئەوە کافربووە، بەڵام کەسێك دانی پێدابێنێ و حوکمی پێ نەکات ئەوە ستەمکارو لاڕێیە.

چوار: (قرطبـي)[تر]، دوو ڕای دیکەشی لە بارەی تەفسیری: ﴿وَ مَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ەوە هێناون کە یەکەمیانی وەك ڕیوا یەتێك پاڵداوە تە لای (إ بن ع باس) یش، بەڵام من هەردووکیانم پێ بێهێـزن:

یەکەمیان: (ومن لم يحكم بما أنزل ف قد ف عل ف علاً يُ ضاهي أف عال الكفّار)، واتە: هەرکەسێك حوکم بەوەنەکات کە خوا ناردوویە تە خوار (کە دەڵێ کافرە) واتە کردەوە یەکی کردوە کە وەك هی کافرانە!

دووەمیان: (أي ومن لم يحكم بجميع ما أنزل الله فهو كافرٌ فأ ما من حكم بالتوحيد ولم يحكم ببعض الشرائع فلا يدخل في هذه الآ ية) واتە: وە هەرکەسێك بە تێکڕای ئەوە خوا کە ناردوویە تە خوارێ حوکم نەکات، ئەو کافرە، بەڵام کەسێك حوکم بە خوا بە یەکگرتن بکات، بەڵام حوکم بە هەندێك یاسای شەرعی نەکات، ئەو ناچێتە جوغزی حوکمی ئەم ئایەتەوە.

دیارە ئەوەی منیش بەدەڵمەوە نووسا پاش وردبوو نەوەی زۆرو پاڕا نەوەو داوای هیدایەتی زیاتر لە خوای بەخشەر، ڕای سێیەمە کە هەڵ بژێرراوی

---

[تر] (جامع الأحكام القرآن) ج (6) ص (167).

(طبـري)یشه - خوا لێی خۆش بێ -، وەك لەوبارەوە گوتوویەتی[ت]: ((وأولـى هذه الأقوال بالصواب قول من قال: نزلت هذه الآيات في كفار أهل الكتاب لأنّ ماقبلها وما بعدها من الآيات ففيهم نزلت وهم المعنيون بها، و هذه الآيات سياق الخبـر عنهم فكونُها خَبَـراً عنهم أولى، فأن قال قائل: فأن الله تعالى ذكره قد عمَّ بالخبـر بذلك عن جميع من لم يحكم بما أنزل الله، فَلِمَ جعلته خاصاً؟ قـيل: ان الله تعالى عمَّم بالخبـر بذلك عن قوم كانوا بحكم الله الذي حكم به في كتابه جاحدين، فأخبر عنهم أنَّهم بتركهم الحكم على سبيل ماتركوه، كافرون، و كذلك القول في كل من لم يحكم بما أنزل الله جاحِدا به هو بالله كافرٌ، كما قال ابن عبّاسٍ لأنه بِجِحُودِهِ حكم الله بعد عِلْمِهِ أنّه أَنزَلَه في كتابه، نظير جحوده نبّوة نبـِّيةً بعد علمه أنه نبـي)) واتە: ((وە نیزیكترین قسەی لە ڕاستییەوە بەلامەوە لەو قسانەی ڕابردون، ئەو ڕایەیە كە دەڵێ: ئەم ئایەتانە لەبارەی كافرانی ئەهلی كیتاب هاتوونە خوارێ، چونكە ئایەتەكانی پێشەوەو دوایە لەبارەی وانەوەن‌و مەبەستیان پێ ئەوانە، ئەم ئایەتانەش هەموویان قسە لەوان دەكەن بۆیە ئەگەر بگوترێ لەبارەی وانەوە هەواڵ دەدەن چاكترە.

ئەگەر یەكێكیش بڵێ: جا خۆ خوای بەرز بەگشتی هەوڵی لەبارەی تێكڕای ئەوانە داوە كە حوكم بەوە ناكەن كە خوا ناردوویەتە خوارێ، ئەدی چۆن تۆ تایبەتت كرد؟! ـ لە وەلامی دا ـ دەگوترێ: بێگومان خوای بەرز بەگشتی هەواڵی دەربارەی كەسانێك داوە كە نكۆڵیی‌یان كردوە لەم حوكمەی خوا كە لە كتێبەكەیدا حوكمی پێ‌كردووەو هەواڵـی داوە كە ئەوانە لە سۆنگەی ئەو جۆرە وازلێهێنانەوە (كە بە نكوولیی لێكردنەوەیە) كافرن، دە جا بە هەمان

(ت) (جامع البيـان) ج(6) ص (ﻻﻻﻻ-ﻻﻻﻻ).

شێوەش هەرکەسێکی دیکەش بە نکوولێی لێکردنو دانپێدانە هێنانەوە حوکم بەوە نەکات کە خوا ناردوویەتە خوار، ئەوە کافرە بە خوا، وەك (إبن عـباس) گوتوویەتی، چونکە بەهۆی نکوولێی کردنییەوە لە حوکمی خوا دوای ئەوەی زانیویەتی کە خوا لە کتێبی خۆیدا ناردوویەتە خوار، وەك نکوولێی کردنیەتی لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکەی دوای ئەوەی زانیویەتی کە پێغەمبەرە!))

کەواتە: ئەوەی کە بۆتە هۆی بەکافر لەقەڵەمدرانی ئەو جوولەکانەی کە حوکمیان بە کتێبی خوا نەکردوە لەو مەسەلەیەدا کە هاتۆتە پێشیان بەس خودی حوکم نەکردنەکە نەبووە بە تەنیا، بەڵکو حوکم نەکردنو نکۆڵیی کردنیان بووە لە حوکمی خوا، ئەگەرنا خودی حوکم نەکردن بە کتێبو شەریعەتی خوا لە مەسەلەیەکی دیاریکراودا جا بەهۆی بەرتیل (ر شوة) وەرگرتن یان بەهەر شتێکی دیکەوە بێ، گوناهێکی گەورەیەو ئینسانی پێ گوناهبار دەبێ بەڵام کوفر نیە (کوفری گەورە)و پێی لە ئیسلامو ئیمان ناچێتە دەرێ، بە پێویستی دەزانم لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتەی نێوان (أبو مجلز)و تاقمێك لە(خوارج) بێنم کە(طبـري)گێراویەتەوە[1]: کۆمەڵێك لە (الأباضية) لەگەڵ (أبو مجلز)دانیشتنو پێیان گوت: خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ...فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ...فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾.
(أبو مجـلـز)یش گوتی: ئەو کاربەدەستانە (کە حوکم بە شەرع ناکەن لە هەندێك مەسەلەدا)[2] ئەوەی کە دەیکەن دەزانن کە گوناهەو دەیکەن، گوتی: وە ئەم ئایەتە دەربارەی جوولەکەو نەصرانییەکان هاتۆتە خوارێ!

---

(1) (جامع البيان) ج (6) ص (...)، ژمارە: (.....)، وە ژمارە: (.....) تۆزێك ڕوونتـرو درێژتر هێناویەتی.
(2) ئەوەی نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کردوە بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی مەبەست.

ئەوانیش گوتیان: دەبەخوا تۆش وەك ئێمە دەزانی، بەڵام لێیان دەترسی! ئەویش گوتی: ئێوە شایستەترن کە بەوە وەسف بکرێن لە ئێمە، چونکە ئێمە قەناعەتمان وانیە، بەڵام ئێوە قەناعەتیشان وایە کەچی لە ترسی وان (واتە حوکمڕانانی لادەر)[تێ] ناوێرن بیلێیــن!

ئێستاش بە پەسندی دەزانم کە ئەوەی لە بارەی ڕستەی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾، گوتمان لە چەند دێڕێکدا کورتو پوخت بکەینەوە:

(١) هەرســـێك ڕستەی:

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾.
﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾.
﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾.

لەبارەی جوولەکەو نەصرانییەکانەوەو حوکم نەکردنیان بە کتێبــی خوا، هاتوونە خوار.

(١) بەڵام بەڕای زۆر بەی هەرە زۆری زانایان حوکمەکەیان گشتی یەو مسوڵمانانیش دەگرێتەوە.

(١) دەگونجێ مەبەست لە هەرکام لە (کفرو ظلمو فسق) کوفرو زوڵمو فیسقی گچکە بێت، کە ئەو کاتە مەرج نیە هەرکەسێك لە مەسەلەیەکی دیاریکراودا حوکمی بە شەریعەت نەکرد، بەو ڕەفتارەی کافر بێت مادام نکووڵیی لێکردنو دان پێدانەهێنانی لەگەڵ نەبێ.

(١) ڕاستتــر وایە کە بگوترێ: مەبەست لە کوفرو زوڵمو فیسق (کفرو ظلمو فسق)ی گەورەیە بەڵام مەبەست لە حوکم بە کتێبی خوا نەکردنە کە

(تێ) ئەوەی نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کردوە بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی مەبەست.

ئەوەیە کە نکوولّیی لێکردن لە ڕووداوێکدا کە لەحوکمی کتێ بی خوا لایان دابوو وە حوکمێکی دیکەیان لە شوێن دانابوو وە نکوولّیشیان لە حوکمی کتێبی خوا دەکرد هەتا پێغەمبەر خوا ﷺ خوای بەگـــــــژدا کردنو ناچاری کردن دانی پێدا بێنن(تر)!.

(5) کەو تە: حوکمڕان ێك ـ وا تە حوکمڕانی م سولّمان کە ئیعلا نی مسولّمانەتیی خۆیو پابەندیی بە شەریعەتی خواوە کردوە ـ کە لە مەسەلەیەك یان چەند مەسەلەیەکی تایبەتو دیاریکراودا حوکم بە کتێبو شەریعەتی خوا ناکات، مادام خۆی بە گوناه بار بزا نێو نکوولّیی لە ڕاستییو تەواویی شەریعەتی خوا نەبێ، بەو ڕەفتارەی بەس گوناهبار دەبێ، بەلاّم لە بازنەی ئیسلامو ئیمان دەرناچێو بە کافر لە قەلّەم نادرێ، چونکە خودی حوکم نەکردن بە شەریعەتی خواو پ ێوە پابەندنەبوونی لە مەسەلەیەك یان چەند مە سەلەیەکی د یاریکراودا گوناهێکی گەورەیە وەك گوناهە گەورەکانی دیکەو پێش تـریش ـ لە بەرگی یەکەم دا ـ بە درێژیی باسمان کردو خ ستمانە ڕوو کە زا ناو پێشەوایانی ڕەسەنی مسولّمانان بە پێچەوانەی خەوارجو موعتەزیلەوە بە گوناهە گەورەکان (الکبائر) ئینسانی مسولّمان کافر ناکەن!

وە لە ڕاستیدا من جیاوازییەکی ئەوتۆ نابینم لە ن ێوان دووکە سدا کە یەکیان خوێنی بە ناهەق دەڕێژێ، یان زینا دەکات، یان دلّی دا یكو باوکی بەناهەق دێشێنێ ... هتد. یەکێشیان کە حوکمڕانێکی گشــتییە یان دادوەر

---

(تر) کە هەرکام لە (طبري) چەند بەسەرهاتێکیان لەوبارەوە هێناوەو یەکیان ئەوەیە کە (مسلم و أبوداود و أبن ماجه و أبن جري) لە (البراء بن عازب) گێڕاویانەتەوەو پێشتر دەقەکەیمان هێنا، بڕوانە، (جامع البیان) ج (6) ص (للالا ◻ للالا)، وە (الجامع الأحكام القرآن) ج (لا)، ص (للالا– للالا).

(قاضی)ێکەو بە هۆی بەرتیل (رشوة) وەرگرتن یان بەرژەوەندیی ماددییو شوێن هەواو ئارەزوو کەوتنەوە، لە مەسەلەیەکی دیاریکراودا لەو شەریعەتەی کە خوای کاربەجێ ناردوویەتە خوارێ، لادەداتو دەشزانێ کە گوناهبارەو شتێکی خراپی کردوە!

لە کۆتایی توێژینەوەمان دەربارەی رستەی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ دا دەڵێم: بێگومان حوکم نەکردنی بابای حوکمڕان لە مەسەلەیەك یان چەند مەسەلەیەکی دیاریکراودا مادام نکوولیی لێ کردن (جحود)ی لەگەڵ نەبێ، جیایە لە حوکم نەکردنی بە سەرجەم شەریعەتو پابەند نەبوونی پێیەوەو گۆڕینیشی بە سیستەم (نظام)ێکی دی کە! چونکە کەسێك بەگشتی پابەندی شەریعەت نەبێو شتێکی دیکەی لە شوێن دابنێ مانای وایە بڵێ یان نەڵێ بڕوای بەوە نیە کە خوا ناردوویەتە خوار، وە بابای واش بە کافر دادەنرێ هەرچەندە پڕ بەزاریش هاوار نەکات کە کافرەو بڕوای بە ئیسلام نیە! ئنجا ئاشکراشە کە زاناو پێشەوایانی پێشینو ڕابردوومان بۆیە باسی ئەم حاڵەتەیان نەکردوە، چونکە: بە درێژایی مێژووی ئیسلامو لە سایەی دەوڵەتەکانی ئەمەوییو عەبباسییو عوسمانییدا کەمو زۆر شەریعەت کاری پێکراوەو هیچ حوکمڕانێکی مسوڵمانان بەگشتی لە شەریعەت لاینەداوەو سیستەمو حوکمێکی دیکەی لە شوێن دانەناوە وەك دوایی پاش ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیی لە سایەی شوومی دەوڵەتە عەلمانییەکاندا ڕوویداو ئێستاش لە زۆربەی وڵاتانی مسوڵمان نشیندا هەر بەردەوامە! (إبن تیمیة) خوا لێی خۆش بێ- دەربارەی جیاوازی حوکمی نێوان ئەو دوو حاڵەتە ـ واتە حوکم نەکردن بە شەریعەت لە مەسەلەیەکی تایبەتداو حوکم

نەکردن بە شەریعەت بە شێوەیەکی گشتی گوتوویەتی[تر]: ( فأن ا لحاكم اذا كان دَيِّناً لكنَّه حكمٍ بغير علم كان من أهل النار، وإن كان عالماً لكنَّه حـ كم بخلاف الحق الذي يعلمه، كان من أهل النار، وإذا حكم بِلا عَدْلٍ ولا عـ لمٍ أَوْلى أن يكون من أهل النار، وهذا اذا حكم في قضية لِـ شَخْص، وأَ ما إذا حـ كم حكماً عاماً في دين المسلمين فجعل الحقَّ باطلاً والباطل حقاً، والـ سنة بدْ عةً، والبدعة سنة والمعروف منكراً، والمنكر معروفاً ونهى عمَّا أمر الله به و رسوله وأمَرَ بما نهى الله عنه ورسولُهُ، فهذا لون آخر يحـ كم فـ يه رب الـ عالمين وإ لـه المرسلين مالك يوم الدين الذي له الحمد في الأولـى والآخرة ﴿لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَـيْهِ تُرْجَعُونَ﴾[یر]، واتە: بێگومان حوكمڕان ئەگەر ديندار بێت بەڵام بەبێ زانیاری حوكم بكات ئەوە شايستەی سزای ئاگرە، هەروەها ئەگەر زانا بێ بەڵام بە پێچەوانەی ئەو هەقەوە حوكم بكا كە دەيزانێ، ئەوە شايستەی سزای ئاگر (ی دۆزەخ)ە، دیسان ئەگەر بەبێ دادگەریی‌و بەبێ زانیاری حوكمی كرد ئەوە چاكتر شايستەی ئاگرە، ئەمە هەمووی ئەگەر لە مەسەلەیەكداو بۆكە سێك ئاوا حوكم بكات.

بەڵام ئەگەر هات‌و بە شێوەیەكی گشتی حوكمی بەسەر دينی مـ سوڵمانان داكردو هەقی كردە ناهەق‌و ناهەقی كردە هەق‌و سوننەتی كردە بيد عەت‌و بيدعەتی كردە سوننەت‌و چاكەی بە خراپە داناو خراپەش بە چاكەو، ئەوەی خواو پێغەمبەرەكەی فەرمانيان پێكرد قەدەغەی كردو، فەرمانی كرد بەوەی كە خواو پێغەمبەرەكەی قەدەغەيان كردوە، ئائەوە جۆرێكی ديكەيەو خوای پەروەردگاری جيهانەكان‌و پەر ستراوی پێغەمبەران‌و خاوەنی ڕۆژی سزاو

---

(تر) (مجموع الفتاوى) ج (35) ص (٣٨٨).
(یر) ( القصص 88).

پاداشت کە لە دونیاو دوارِۆژدا ستایش دەکریّ: ((حوکمڕانیی هەرهی و یەو بۆ لای ویش دەگیّرریّنەوە)) (القصص ـ٧٠) ، حوکمی ت یّدا دە کات! د یارە حوکمی خوای کاربەجیّو زالّیش (سبحانەو تعالـی) دەربارەی کەسیّك کە ئاوا بەو جۆرە دژایەتی دینو شەریعەتەکەی دەکات لە دن یادا پیّش قیا مەت ئاشکرایەو نازانم بۆچی (إبن تيمية) بە رِا شکراویی نەیگوتوە هەر چەندە زانایەکی یەکجار بویّرو هەڤبیّژە  خوا لیّی خۆش بیّ-! ئاخر ئە گەر ئەو جۆرە دەستەلاّتدارو حوکمڕانە کافر نەبیّ دەبیّ کیّ کافر بیّت؟!

هەروەها (الشيخ محمد بن ابراهيم آل الشيخ) هەر لە بارەی ئەو جۆرە حوکمڕانییەوەو جیاوازی لەگەلّ ئەوەدا کە باسمان کرد، بابای حوکمڕانی پیّ کافر نابیّ گوتوویەتی[٣٣]: (وأما الذي قيل فيه أنه كفرٌ دون كفر، إذا حاكمَ الى غير الله مع أعتقاده أنَّه عاصٍ وأن حكم الله هو الحق فهذا ا لذي ي صدر منه المَرَّة و نحوها، وأما الذي جعل قوانين بتـرتيب وتخ ضيع ف هو ك فر، وإنْ قالوا: أخطأنا وحكم الشرع أعْدَلُ، فهذا كفرٌ ناقلٌ عن المِلّة) واتە: بەلاّم ئەوەی کە لە بارەیەوە گوتراوە: کوفری گچکەیە، ئەوەیەکە (مرۆڤـ) بۆ دادوەر یی بچیّتە لای غەیری بەرنامەی خواو برِواشی وابیّ کە گوناهبارەو تەنیا حوکمی خوا هەقە، ئەویش لە حالّیّکدا کە جاریّكو دووان ... ئەوەی لـیّ روو بدات، بەلاّم کەسیّك کە چەند یاسایەك بە شیّوەیەکی بەرنامەو نەخشە بۆ دار یّژراو دادەنیّو خەلّکیان بۆ گەردن کەچ دەکات، ئەوە کوفرە، هەرچەندە بش ـلّیّن: بە هەلّەدا چووینو حوکمی شەرع داد گەرترە، بەلّیّ ئەم جۆرە رِەڤ تارە کوفریّکە خاوەنەکەی لە دین دەباتە دەریّ.

---

(٣٣) (مجموع فتاوى) محمد بن ابراهيم آل الشيخ، ج (12) ص (٢٨٠).

ئێستاش نۆرەی سێیەمین کۆمەڵە ئایەتە:

## کـۆمەڵی سـێیـەم :

که سێ ئایەتی کۆتایین (للا،للا،للا) جا هەرچەندە پێشتریش هێناومانن بەڵام لێرەش دووبارەیان دەکەینەوە: ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاءَ اللهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِنْ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ إِلَى اللهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ۞ وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللهُ إِلَيْكَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللهُ أَنْ يُصِيبَهُمْ بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيراً مِنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ ۞ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ! وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ؟!﴾ واتە: وە کتێبمان بە هەق بۆ تۆ ناردۆتە خوارێ هەرچی کتێبی خوایە کە لە پێش خۆیدا هاتوون بە ڕاستیان دەزانێ ((واتە ئەسڵەکەیان بە ڕاست دەزانێ)) وە بە سەریانەوە چاودێرە، دە جا تۆ حوکمیان لە نێوان دا بکە بەوە کە خوا ناردوویەتە خوارو مەکەوە شوێن ئارەزووەکانیانو لەو هەقەی کە بۆت هاتوە لامەدە بۆ هەرکامێکتان (لە ئۆممەتان) ڕێبازو بەرنامەیەکمان داناوە (کە لە گەڵ هەلو مەرجو قۆناغو پێداویستییەکانی ژیانو گوزەرانتاندا گونجاوو پڕ بە پێست بووە)، وە ئەگەر خوا ویستبای هەمووتانی دەکردە یەك کۆمەڵ بەڵام (بۆیە کردوونیە ئۆممەتی جیاجیا) تاکو لەو (بەرنامەو ڕێبازان)ەدا کە پێی یداون تاقیتان بکاتەوە (بۆیە کردوونیە کۆمەڵی جۆراو جۆرو بەرنامەی جیاجیاشی بۆ ناردوون) دەجا پێشبڕکە بکەن بەرەو کارەچاکەکان، چونکە گێڕانەوەی هەمووانتان

بۆ لای خوایەو هەواڵتان پێ دەدا بە (سەرەنجامی) ئەوەی کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی‌یەوە.

وە (جارێکی دیکەش ئەی موحەممەد! لێت دووبارە دەکەینەوە) بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوارێ حوکمیان لەنێواندا بکەو مەکەوە شوێن ئارەزووکانیان، وە وریا بە کە لە هەندێك (یاسا) لەو بەرنامەیە کە خوا بۆی ناردوویە خوار لات نەدەن. وە ئەگەر ڕوویان وەرگێرا ئەوە بزانە کە خوا دەیەوێ بەهۆی هەندێك لە گوناهەکانیانەوە بەلایان تووش بکات، وە بێ شنزانە کە زۆر بەی خەڵکی لارێن.

ئایا ئەوانە حوکمی نەفامێتی دەخوازن! جا حوکمی کێ لە هی خوا چاکترە بۆ کەسانێك کە دڵنیابن (لە گەڕانەوەیان بۆ لای خواو سزاو پاداشتی!).

لەبەردەم ئەم سێ ئایەتەشدا پێویستە کۆمەڵە هەڵوەستەیەك بکەین لە بواری ئامانجی نێررانی کتێبەکانی خوای کاربەجێو بەبەزەییدا:

١ ـ ڕستەی: ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە هەمان ئامانجو مەبەست کە کتێبە پێشووەکانی وەك تەوراتو ئینجیلی بۆ نێرراونە خوارێ، قورئانیش بۆ هەمان ئامانجو مەبەست هاتوە کە بریتییە لە چەسپاندنی هەق لە هەموو ڕووەکانی ژیانو گوزەرانی تاكو خێزانو کۆمەڵ دا.

٢ ـ ڕستەی: ﴿مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ﴾ ئەو ڕاستی‌یە دەردەخات کە قورئان سەرجەم کتێبە ئاسمانی یەکانی پێش خۆی وەك ئەو ئەسڵەیان کە لە خوارەوە دابەزیوون بە ڕاست دەزانێو پشتگیریی یان دەکات، دیارە هەموو کتێبەکانی خواش هەروا بوونو یەکدی یان بەڕاست زانیوە، وەك

خوا لەبارەی ئینجیلیشەوە فەرموویەتی: ﴿وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ فِيهِ هُدىً وَنُورٌ وَمُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ﴾.

لا ـ وشەی: ﴿وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە قورئان چاودێرە بە سەر هەموو کتێبەکانی دیکەی خوای کاربەجێو پەروەردگارەوەو هەر گۆڕانو لادانێک یان تێیدا پەیداکرابێ ڕاستی دەکاتەوە، وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾[1]، واتە: بێگومان ئەم قورئانە زۆربەی ئەوەکە بەنی ئیسرائیل تێیدا کەوتوونە کێشەو ڕاجیاییەوە بەسەریاندا دەخوێنێتەوە.

لا ـ ڕستەی: ﴿ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ ﴾ بەڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ وە هەرکەسێکی دیکەش کە خۆی بە شوێنکەوتووی وی دەزانێ لەسەری پێویستە حوکم بەو کتێبە بکات کە خوا ناردوویەتە خوارو گرفتو کێشەکانی خەڵكو کۆمەڵگای پێ چارەسەر بکات.

5 ـ ڕستەی: ﴿وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ﴾ ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە هەمیشە بە دیلی شوێنکەوتنی هەقێك کە خوا ناردوویەتی بریتییە لە وەدواکەوتنی هەواو ئارەزووی خەڵکی، ئەگەر سەرنجی واقیعی سەرجەم ئەو کەسو لایەنانەش بدەین کە پابەندی ئایینو شەریعەتی خوا نین هەروای دەبینین.

6 ـ ڕستەی: ﴿لِكل جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً﴾، زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی ئەو ڕاستییە دەردەخات کە خوای کاربەجێو شارەزا (سبحانەو تعالی) بۆ هەر کۆمەڵگاو گەلێك ڕێبازو بەرنامەیەکی تایبەتی ڕەوانەکردوە کە

---

[1] ( النَّمــل 76 ).

پڕ بە پێستی ئەو واقیعو هەڵو مەرجەیان بووە که تێیدا بوون، وەك پێشتریش باسمان کرد، وشەی ( شرعة)ش وەك ( شریعة) لە ئەسڵدا لە زماندا بەو ڕێیە دەگوترێ کە ئاوی لێوە دەهێنرێ، دیارە ئایینو بەرنامەی خواش ئاوی ژیان (ماء الحیاة)ی ئینسانە بۆیەش ئەو وشەیەی بۆ خوازراوەتەوە، چونکە وەك چۆن ژیانی ماددی مرۆڤ بەبێ ئاو دروست نابێو بەردەوام نابێ، ژیانی مەعنەویشیی بەبێ ئایینو بەرنامەی خوا ناگونجێو ناچێتە سەرێ، وە وشەی (منهاج)یش یانی ڕێبازێکی ڕوونو ئاشکرا، ئیسلامیش وایە.

وە - ڕستەی: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِنْ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ﴾ ئەو ڕستەیە دەریدەخات کە هیچ شتێك لە بەردەم ویستو خواستی بێسنووری خوادا عاسێ نابێو ئەگەر ویستبای دەیتوانی هەموو بەشەر لەسەر یەك ئایینو بەرنامە کۆبکاتەوەو بۆ هەموو پێغەمبەرانی خۆی ﴿علیهم الصلاة والسلام﴾ تەنیا یەك شەریعەتی ناردبایە.

بەڵام بۆیە خوای زاڵو کاربەجێ بۆ هەر ئوممەتێك بەرنامەیەکی تایبەتی ناردوە تاکو ئەو خەڵكو ئوممەتانە بەوە تاقی بکاتەوە کە ئایا پابەند دەبن بەو بەرنامەیەوە کە بۆیان نێرراوە؟ وە ئایا کاتێك ماوەی کارپێکردنی یەکێکیان بەسەردەچێو یەکی دیکە جێی دەگرێتەوە، شوێنکەوتووانی بەرنامە پێشووەکان ئامادە دەبن دەست لەوی پێشوو هەڵگرنو بکەونە دوای ئەوەی دیکە بەبێ دەمارگیریی (تعصّب) بۆ ئەوەی پێشێو بەبێ هەستیاریی (حسّاسیة) بەرانبەر ئەوەی دوایە؟!

- ڕستەی: ﴿فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ﴾یش ئاماژەیە بۆ ئەو ڕاستییە كە سەنگی مەحەكی دیـنداریی‌و بەندایـەتی بـۆ خـواو شوێنكەوتنی كتـێب‌و بەرنامەكانی خـوا بریتـیە لـە پێشـبـڕكە كـردن لـە چاكەكاریی‌و خێرخوازییدا، نەك ناوو شۆرەتی جۆراوجۆر لەخۆ نان! وەك خوای بـەرزو مەزن لە شوێنێكی دیكە فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾.

- ڕستەی: ﴿إِلَى اللهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ ئەو ڕاستییە دەخاتەڕوو كە هەموو مرۆڤایەتی ئەگەر لـە دنـیادا لـە ڕێی كتێب‌و بەرنامەكانی‌یەوەو لەسەر زمانی پێغەمبەران ﴿علیهم الصلاة والسلام﴾ هەق‌و ناهەق‌و ڕاست‌و چەوتی بە شێوەیەكی تیۆریی (نظري)و فیكریی بۆ ڕوون كردوونەتەوە، ئەوە لە دوارۆژدا هەموو ئەو شتانە بـە چاوی سەرو بە بەرجەستەكراویی دەبینن!

- ڕستەی: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ﴾ كە هەمان ئەو دوو ڕستەیەی دووپات كردوونەوە كە لە ئایەتی پێـشوودا هـاتوون، ئەوە دەگەیەنێ كە حوكم كردن بە كتێب‌و شەریعەت، هێندە بابـەتێكی گەورەو گرنگ‌و چارەنووسسازە كە پێویست دەكات خوای بەرزو مەزن لە دوو ئایەتی بەدوای یەكدا هاتوو هێندە بـە جەخت لە سەر كردنەوە دووپاتی بكاتەوە!

ئنجا هەر لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەوانەی بانگەشەی لە یەك دابڕینی دینو ژین یان شەریعەتو سیا سەت دە کەن چ زۆر زانا نە، چ نەزانانە، تا چ ڕاددەیەك بێ ئینسافو دژ بەهەق، یان نەزانو بێئاگان(تر)!

●● ـ ڕستەی: ﴿وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللهُ إِلَيْكَ﴾ بەئا شكرا ئەوە دەگەیەنێ کە زاناو پێشەوایانی مە سوڵمانان پێوی ستە زۆر ور یاو هۆشیار بنو نەهێڵن بە هیچ بیانووو پاساوێك دوژمنو نا حەزانی ئایینو بەرنامەی خوا، تەنازولیان پێ لە هەندێك لە یاساکانی شەریعەتی خوا بکەن، چونکە ماقووڵ نیە ئەهلـی باطیل بۆ ناهەقیەکانی خۆ یان لە ئەهلـی هەق بۆ ڕاستییەکانی شەریعەتی خوا ئازاتربن.

هەروەها ئەم ڕستەیە ئەوەشی لـێ دەفامرێتەوە کە دوژ منو نەیارانی شەریعەتی خوا، لەسەر دوژمنایەتیو پیلانو فێ ڵـی خۆ یان سوورن تەنانەت لەگەڵ پێغەمبەری خواشدا ﷺ چ جـای خەڵکی دیکە!

13 ـ ڕستەی: ﴿ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللهُ أَنْ يُصِيبَهُمْ بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە پشت تێکردنی حوکمو بڕیارە کانی شەریعەت ـ و ێڕای سزای دوا ڕۆژ ـ ما یەی بەڵاو گرف تاریی دنیا شە، وەك چۆن بە پێچەوانەشەوە پابەندیی بە شەریعەتەوەو ملکە چی بۆ بڕیارە کانی، مایەی خێرو خۆشیو سەلامەتیی دنیایە پێش ڕۆژی دوایی.

14 ـ ڕستەی: ﴿وَإِنَّ كَثِيراً مِنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ﴾ ئەو ڕاستییە دەردەخات کە زۆرێك یان زۆربەی خەڵکی مەیلـی لادانو سەرپێچی کردنیان هە یە، وە

(تر) لە کتێبی: (ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی..)داو لە نامیلکەی: (سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك) دا ئەم مەسەلەیەمان باش ڕوونکردۆتەوە.

هەرکەسێکیش لە حوکمو بڕیارەکانی شەریعەتی لادا، مانای وا یە لە خوا یاخی بووەو لە فیطرەتی ساغی خۆیشی دەرچووە!

15و 16و 17ـ ڕستەی: ﴿ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ! وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ؟!﴾، سێ ڕاستیی گەورەو گرنگ دەگەیەنێ:

یەکەم: هەرکەسێك بە شەریعەتی خوا ڕازی نەبێ مانای وا یە بەرنا مەو حوکمی نەفامیی دەخوازێو، حوکمی نەفامییش تێکڕای ئەو بیردۆزەو بەرنامانە دەگرێتەوە کە لە وەحی ڕاستو ڕوونو دەستکاریی نەکراویی خواوە نەهاتوون، چونکە لە ڕاستیدا بەرنامەدانان بۆ ژیانو گوزەرانی ئینسان تەنیا شایستەی خوای زاناو شارەزایە کە نهێنییەکانی سینەو دڵی مرۆڤـ و شێرراوەکانی زەویو ئاسمانو دنیاو دوارۆژ دەزانێو هیچی لێ ونو پەنهان نیە، وەك ئیبراهیم (علیهم السلام) فەرموو یەتی: ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ وَمَا يَخْفَى عَلَى اللهِ مِنْ شَيْءٍ فِي الْأَرْضِ وَلا فِي السَّمَاءِ..﴾[1]، وا تە: پەروەردگارمان! تۆ دەزا نی ئەوەی دەیشارینەوەو ئەوەی ئاشکرای دەکەین، وە هیچ شتێك لە خوا پەنهان نیە نە لە زەویو نە لە ئاسمانێ...

دووەم: هەرکەسێك ئەهلـی یەقین بێتو دڵنیا بێ لە بەدیهێنەرا یەتیو پەروەدگارێتیو پەرستـراوێتی خواو، پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ و بەرنامێیتی ئیسلام (واتە: ئەوە کە خوا ئیسلامی کردۆتە ئایینو بەرنامەی ژیانی مرۆڤـ) حوکمو بەرنامەی خوای کاربەجێی پێ لە هەموو حوکمو بەرنامەیەکی دیکە چاکتـرو تەواوتر دەبێ، بگرە هەر

(ت) ( إبراهيم – 38 ).

ئەوی بەرەهایی پێ چاكو تێرو تەواو دەبێو هەركەسێك وانەبێ دیارە خاوەن ئیمانو یەقیـــن نیە.

سێیەم: هەركەسێك بە ئیسلام قەناعەت نەكاتو چاو بۆ بەرنا مەو ڕێبازێكی دیكە بگێڕێ بیلێ یان نەیلێ، ڕەفتارەكەی بەلگەیە لەسەر ئەوە كە ئاییـــنو بەرنامەی خوای پێ باش نیە! بە بەلگەی ئەوە بەرنامەو دینێكی دیكە دەخوازێ، فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ من الله حكماً..﴾

كەواتە: وادیارە ئەوجۆرە كەسانە بە زمانی حالو ڕەفتار گوتوویانەو دەلێن: بەرنامەو ئایینی خوامان پێ چاك نیە، بۆیەش خوای پەنهانبین ڕایگەیاندوە كە بەرنامەو حوكمەكەی چاكترین بەرنامەو حوكمە!

به پەسندی دەزانم كۆتایی ئەم باسەش بەم چەند قسەیەی (ابن تیمیة) خوا لێی خۆش بێ- بێنم(تر): (لاريْبَ أنَّ من لم يَعْتَقِدْ وجوب الحكم بما أنزل الله على رسولِهِ فهو كافِرٌ، فمن استحلَّ أن يحكم بين الناس بما يراه هو عَدْلاً من غير إتباعٍ لما أنزل الله، فهو كافِرٌ، فأنه مامن أمة الاّ وهي تأمر بالحكم بالعدل، وقد يكون في دينها مايراه أكابِرهم، بَل كثير من المنتسبين الى الأسلام يحكمون بعاداتهم التي لم ينزِّلْها الله كسواليف البادية، وكانوا الأمراء المطاعين، ويرون أنَّ هذا هو الذي ينبغي الحكم به دون الكتاب والسنة، و هذا هو الكفر، فأنَّ كثيراً من الناس أسْلَموا ولكن لايحكمون الاّ بالعادات الجارية التي يأمر بها المُطاعون. فهؤلاء اذا عَرفوا أنَّه لايجوز لهم الحكم الاّ بما أنزل

(تر) (منهاج السنة النبوية). كە (عقيدة التوحيد...)ی (الشيخ الدكتور: صالح بن فوزان) لێی وەرگرتوە، بڕوانە: ص (لالال).

الله، فلم يلتزموا ذلك، بل استحلّوا أن يحكموا بِ خلاف ما أ نزل الله، ف هم كفّارٌ).

واتە: بێگومان هەرکەسێك بڕوای وانەبێ کە لەسەری پێوی ستە حوکم بەوە بکا کە خوا بۆ پێغەمبەرەکەی ناردۆتە خوارێ، ئەوە کافرە، کەواتە: هەر کەسێك بە ڕەوای زانی کە لە نێو خەڵکیدا بەوە حوکم بکات کە خۆی پێی وایە ڕاستەو دادگەری یە بێ‌ئەوەی شوێن ئەوە بکەوێ کە خودا ناردوویە تە خوارێ، ئەوە کافرە، چونکە هیچ کۆڕو کۆمەڵێك نیە کە فەرمان نەکات بە دادگەری حوکم بکرێ، جا دەبینین هەندێك لەوەی کردوویانە بە ئاینی خۆ یان ئەوەیە گەورەو دەستــڕۆیشتووەکانیان بۆیان داناون، بەڵکو گەلێك لەوا نەی خۆیان بە موسڵمان دەزانن بە پێی ئەو نەریتانەیان کە خوا نەیناردوو نە خوارێ حوکم دەکەن، وەك عادەت‌و نەریتە میراتیەکانی خەڵکی بیابان ن شین، کە گەورەکانیان مشوورخۆریان بوون‌و گوێ ڕایەڵــی‌یان بۆ دە کرا، وە پێ یان وابوو کە ئەو نەریتانە ئەوەن کە پێویستە حوکمی پێ‌بکرێ، نەك قور ئان‌و سوونەت! کە دیارە ئا ئەوەیە کوفر.

بەڵێ زۆر لە خەڵکی مسوڵمان بوون، بەڵام تەنیا بەو عادەت‌و نەریتا نە کە لە نێویاندا باون‌و قسە ڕۆیشتووەکانیان فەرمانیان پێ دە کەن حوکم دەکەن، جا ئەوانە مادام بزانن کە بۆیان ڕەوا ن یە ج گە لەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوار حوکم بە شتێکی دیکی بکەن، کەچی بەوەوە پابەند نەبن بگرە بە ڕەواشی بزانن کە بە پێچەوانەی ئەوە کە خوا ناردوویەت یە خوارێ حوکم بکەن، ئەوە کافرن.

ئێستاش کە پێم وایە وەك ڕۆژی ڕوون دەرکەوت کە ئامانج و مەبەستی هاتنە خواری کتێبەکانی خوا (سبحانەوتعالى)بەگشتیو بەتایبەتی کتێبی هەرە گەورەو کۆتاییان قورئانی مەزن، چیە! کۆتایی بەم خاڵی سێیەمە دێنینو بەمەش کۆتایی بە بەندی دووەمی ئەم کتێبە دێنین کە تەرخانمان کردبوو بۆ توێژینەوە دەربارەی کتێبەکانی خواو ئیمان پێهێنانیان، کە وەك پێشتریش باسمان کرد ئیمان بە کتێبەکانی خوا (تبارك و تعالى) یەکێکە لە پێنج پایە گەورەو گرنگەکانی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی.



# بەندی سێیەم




# ئـەم بەنـــدە

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەندە کە تەرخان کراوە بۆ توێژینەوە لەبارەی ئیمان بە پێغەمـبەرانی خواوە (علیهم الصلاة والسلام) کە یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیمان.

لە دەرسی ژمارە چل (40)و چەند باسێکی دیکە پێك دێ کە لە کتێبی (مسوڵمانی کامڵ)(تر) خوازراونەوە.

(تر) بڕوانە: (مسوڵمانی کامڵ ـ بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) لا پەڕە (71- 137)، چاپی یەکەم (1997).

وە ئەم بەندە سەرجەم لە پێنج خاڵان پێک هاتوە، کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە:

1 ـ پێناسەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و چۆنیەتی ئیمان پێهێنانیان.

2 ـ ئەنجامو بەرهەمی بڕوابوون بە پێغەمبەران (علیهم الصلاةوالسلام).

3 ـ هەقی پێغەمبەر ﷺ بەسەر ئۆممەتەکەیەوە.

4 ـ بەسەرهاتێکی پڕمانا، (نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ ).

5 ـ ململانێی هەقو ناهەق (وتووێژی نێوان پێغەمبەرانو سەرانی کوفر).

# والسـلام )و چۆنیەتی ئیمـان پێهێنـانیـان




ئەم خاڵـی یەکەمە کە گرنگتـرینو گەورەترین خاڵـی ئەم بەندە یە لە سێزدە کورتە باسان پێکدێو هەر کورتە باسێك لە بڕگە یەکی سەربەخۆدا دەخەینە ڕوو، ئەمەش ناوو نیشانی ئەو سێزدە کورتە باسەیە:

1- بڕوابوون بە پێغەمبەران یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیمان.
2- ڕوونکردنەوەی چەمكو واتایو شەی (نبـي)و (رسول).
3- پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کێن؟!
4- حیکمەتی (مرۆڤ بوون)ی پێغەمبەران چیە؟!

5- ژمارەو ناوو بەرزو بەرزتریی (تفاضل)ی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).
6- پلەی پێغەمبەرایەتی بەخشراو (وهبي)ە نەك وەدەستهێنراو (كسبي)
7- چەند بنەمایەكی كەسایەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).
8- بەڵگەكانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).
9- بۆچی مرۆڤایەتی پێویستی بە پێغەمبەرانەو پێغەمبەران بۆ چی نێرراون؟!
10- خەسڵەتە پێویستەكانی پێغەمبەران چیو چین؟!
11- تایبەتمەندیی یەكانی بانگەوازی پێغەمبەران كامانەن؟!
12- بۆچی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خاوەن موعجیزەن؟!
13- بانگەوازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە ئەسڵدا یەكەو شێوەكانی جیاجیان.

ئێستاش بڕگە بڕگەو بەڕیز پێیاندا دەچینە خوار:

## (1) بڕوا بوون بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) یەكێكە لە پایەكانی ئیمــان:-

وەك لە ئایەتەكانی ژمارە (177و 285)ی سوورەتی (البقرة)و لە ئایەتی ژمارە (136)ی سوورەتی (النساء)دا هاتوە، وە لە فەرموودە كەی (جبريل)و چەندان ئایەتو فەرموودەی دیكەشدا هاتوەو پێشتر چەند جار یێك قسەمان لەوبارەوە كرد.

دیارە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەو ڕووەوەو بەو ئیعتیبارە كە هەموویان خوای پەروەردگار ڕەوانەی كردوونو هەوا ڵی پێ یداونو هە ڵی بژاردوون، وەكو یەكن، واتە: لەو ڕووەوە كە پێغەمبەرن، بە یەك چاو سەیر

دەکرێن، کەواتە: لە ڕووی ئەسـڵی پێغەمـبەرایەتی یانەوە وەك یەکن، بەڵام لە ڕووی پلەو پایەیانەوە بەرزو بەرزتریان هەیەو لە یەك جیاوازن، وە ئەوە کە نابێ جیاوازی یان بخرێتە نێوان لە ڕووی ئەسـڵی پێغەمبەرایەتی‌و بڕوا پێبوونیانە وەك پێغەمـبەران‌و ڕەوانە کراوانی خوا (سبحانەو تعالی)، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿**إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً ۞ أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقّاً وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَاباً مُهِيناً**﴾[تن]، واتە: بێگومان ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن بە خواو بەپێغەمبەرەکانی ﴿علیهم الصلاة والسلام﴾ وە دەیانەوێ کە جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکانی یەوە، وە دەڵێن بڕوا بە هەندێکیان دەهێنین‌و بڕوا بە هەندێکیان ناهێنین، وە دەیانەوێ لەو نێوانەدا ڕێگایەکی دیکە بدۆزنەوە (بە تایبەتی جوولەکەو نەصرانی‌یەکان کە بڕوایان بە پێغەمبەرانی پێشوو هەیە، بەڵام بڕوایان بە خاتەم‌و سەروەرو گەورەی پێغەمبەران نیە، کە (محمد)ە ﷺ ئائەوانە کافری ڕا ستەقینەن، وە ئازارو ئێشێکی ڕیسواکەرو زەبوونکەرمان بۆ بێبڕواکان ئامادە کردوە.

کەواتە بڕوا بوون بەوەی کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەرهەموویان پایە بەرزو هەڵبژاردەن‌و خوا هەواڵی پێ داون‌و (وحي)و پەیامی بۆ ناردوون، یەکێکە لە پێنج پایەکان ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی، هەربۆیەش خوای بەرزو مەزن لە سەر زمانی پێغەمبەری کۆتایی‌و ئۆممەتەکەی فەرموویەتی: ﴿**لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ**﴾[ین]، واتە: جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرانەوە، ئەمە هەڵوێستی مسوڵمانانە، وە هەر ئەمەش هەڵوێستی هەموو پێغەمبەران‌و هەڵوێستی شوێنکەوتووانی

---

(تن) (النساء - 150،151).

(ین) (البقرة - 285).

ڕەسەنی سەرجەم پێغەمبەران (علیهم ال صلاة وال سلام) بووە. بەلاّم کە جوولەکەو نەصرانیەکان ئێستا دان بە هەندێك لە پێغەمبەراندا دێنن‌و دان بە هەندێکیان دا ناهێنن، بێگومان ڕێگایان لێ تێکچووەو هەقیان لێ بزر بووە، بە هۆی ئەو چەواشەکارییەی کە بە سەریان هاتوە، وە بەهۆی ئەو گۆڕانکاریی‌و دەستکارییەوە کە لە کتێبەکانی خوادا کردوویانە.

ئەگەر بشمانەوێ بە کورتی‌و پوختی پێنا سەی ئی مان بە پێغەم بەران (علیهم الصلاة والسلام) بکەین دەلێیــن: ((بریتیە لە قەناعەت‌و دڵن یایی تەواو بەوە کە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) کە سانێکن خوا وەحی‌و پەیامی خۆی بۆ ناردوون‌و بەسەر سەرجەم مرۆڤایەتیدا هەڵی بژاردوون وە هەموویان لە خراپەو تاوان دوورن‌و بە هەرچی چاکەو خە سڵەتی بەرزو پەسند ڕازاوە بوونە، وەك خوای کاربەجێ لە قورئانێ وەسف‌و پێناسەی کردوون، وە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا لەسەر بناغەی ئەو قەناعەت‌و دڵنیاییەیە، بە خۆشەویستن‌و ڕێز لێگرتن‌و پشتگیریی کردن‌و شوێن پێ هەڵگرتن‌و... هتد)).

## (2) ڕوونکردنەوەی چەمک‌و واتای وشەی: (نبي)و (رسول):

خوای بەرزو بێوێنە لە قورئا ندا ئەم دوو و شەیەی بەکارهێناون بۆ پێناسەکردن‌و نازناوو ناوو نیشانی ئەو ئینسانە هەڵبژاردانەی کە پە سندی کردوون، بۆ ئەوەی کە فریشتەیان بنێرێتە لاو پەیام (وحي)یان بۆ بن ێرێ، وە هەواڵیان پێبداو داوایان لێ بکات کە دین‌و شەریعەتی خوا بە بە ندەکانی ڕابگەیانن.

جا ئێستا با ســـەرنج بدەین داخۆ ئەو دوو وشەیە چ چەمك‌و واتا یەکیان هەیە:

أ ـ (نبـــي): وشەی (نبـــي) لە زمانی عەرەبیدا یان لە (نَبأْ) هاتوە، وا تە: هەواڵ، وەکو خوا دەفەرموێ: ﴿عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ۞ عَنِ النَّبَإِ الْعَظِيمِ ۞ الَّذِي هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ﴾[ت]، واتە: لەچی پرسیار دەکەن؟ لە هەواڵی مەزن ئەوەی کە ئەوان تێیدا لە ڕاجیایی دان، یان لە و شەی (النَّبْوة، والنَّباوة)، واتە: تەپۆڵکەو بەرزایی، یان لە وشەی (نبـــي) یەوە هاتوە، بەبێ گیــرە (شدة)ی دوایی، کە بە مانای (الطریق الواضح) ڕێگا یەکی ئاشکراو ڕۆشن[ی] دێ.

ئنجا بێگومان هەرسێك ماناکان لەگەڵ کەسایەتیو پلەوپایەی بەرزی پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام)دا دەگونجێن، چونکە ئەگەر و شەی (نبـــي)لە (نَبأْ)ەوە هاتبێ، ئەوە دیارە کە پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) هەم هەواڵ پێدراو (مُخْبَر)نو هەم هەوا ڵدەر (مُخبِر)ی شن، چونکە لە لایەکەوە خوا هەواڵی غەیبو نادیاری بەوان داوەو هەم ئەوانیش هەواڵیان بە خەڵك داوە، وە ئەگەر لە (نَبوْةَ و نباوة)یش هاتبێ، کە وەك گوتمان بە مانای تەپۆڵکەو بەرزایی یە، ئەوە ئا شکرایە کە پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) لەئا ستی خەڵکی بەرزترنو ئیمتیازیان بەسەریاندا هەیە، وە ئەگەر لە (نبـــي)یشەوە هاتبێ، کە بە مانای ڕێگای ڕۆشنە، ئەوە دیارە کە پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) خۆیان ڕێگایەکی ڕۆشنن بۆ هیدایەتی خەڵك بەرەو خوا، یان ڕێگایەکی ڕۆشنو ئاشکراو ڕوونیان پێیە.

---

(ت) ( النبــاء 1-3 ).

(ی) لسان العرب: بەرگی/ 1، لاپەڕە (162،164).

ب ـ (رسول): وشەی (رسول)یش، کە ئە سڵە ز مانییە کەی (إرْ سال)ە دەگوترێ: (أرْسَل، یُرْسِلَ، إرْسالاً، ورسولاً)، (إرْسال)یش وا تە: (البـ عث والتوجیه) ناردنو ئاراستەکردن، وەك خوای مەزن لە (مل كة)ی ( سبأ) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِمْ بِهَدِ يَّةٍ فَـ نَاظِرَةٌ ـبِمَ يَرْ جِعُ الْمُرْسَلُونَ﴾[^]، واتە: وەمن دیارییەك دەنێرم بۆ ( سولەیمان)و، چاوەڕێ دەکەم، بزانم نێردراوەکانم بە چ هەواڵو سەرەنجامێکەوە دەگەڕێنەوە.

هەروەها عەرەب دەڵێن: ( جاءت الأ ـبِلُ رَ سَلاً أي مُتتابَ عةً) وا تە: حوشترەکان بە (رَسَلْ) هاتن واتە: بەدوای یەکتردا، یەك لە دوای یەك.

بەڵام ئێمە لە زمانی کوردیدا هەم بۆ (رسول)و هەم بۆ (نـ بـي) یش زیاتر هەر ـیەك و شە ـبەکاردێنین، کە و شەی (پێغەمـ بەر)ە، ـیان (پەیامبەر)، هەرچەندە وشەی (نبـي) لە پێغەمبەر ـنزیکترە ـلە ڕووی واتاوە، وشەی (رسول)یش یانی ڕەوانەکراو یان نێردراو.

وە لە زاراوو لە ڕوانگەی شەرعەوە دە ـتوانین ـبەکورتی واپێنا سەی (پێغەمبەرانو ڕوانەکراوان (الأنبیاء والمرسلین) بکەین کە: کە سانێکن خوا هەڵیبژاردوونو ـپەیامو بەرنا مەی خۆی پ ـێدا ـناردوون ـبۆ لای بەندەکانیو ڕەوانەی کردوون بۆلایان).

## جیــاوازی نێــوان (نبيّ)و (رســول):

هەندێ لە زانا ـیان دە ـڵێن: ج ـیاوازی ـیان نـ ـیەو دوو و شەی هاووا ـتا (مُتَرادِف)نو لە مانادا هەر یەکن.

[^]: (ترٰ) ( النمــل – 35 ).

بەڵام لە ڕاستیدا جیاوازی یان هەیە، چونکە خوای کار بەجێ لە چەند شوێنێکی قورئانی پیرۆزدا هەردوو وشەی (رسول)و (نبيٍّ) بەیەکەوە هێناوە، ئنجا کە بەیەکەوەش هاتن دیارە ئەوە دەگەیەنێ کە مانا کەیان لە یەك جیایە، وەك خوا (عزّوجل) دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَى إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصاً وَكَانَ رَسُولاً نَبِياً﴾[1]، واتە: لە کتێبی خوادا یادی مووسا بکەوە کە بەندەیەکی هەڵبژاردەی خوا بوو، وە (نبي)و (رسول) بوو، مانای وایە دە بێ مانای (رسول)و (نبي) لە یەك جیا بێ، ئە گەرنا خوای پەروەردگار هەردووکیانی پێکەوە نەدەهێنا، چونکە کتێبی خوا ناگونجێ هیچ وشەو بگرە پیتێکیشی تێدابێ زیادەبێو مانایەکی تایبەتی نەبێ.

جا دەربارەی جیاوازی نێوان ئەم دوو وشەیە لە ڕووی وا تاوە زانا یان دوو ڕایان هەن:

ڕای یەکەم: دەڵێ: (رسول) ئەو کەسەیە کە هەم خۆی هەواڵو پەیامو سروش (وحي)ی خوای بۆ هاتوەو هەم لەسەریشی پێویست کراوە کە بیگە یەنێ بەخەڵك، بەڵام (نبي) خۆی هەواڵی پێدراوەو پەیامو سروش (وحي)ی خوای بۆ هاتوە، بەڵام داوای لێ نەکراوە کە بیگەیەنێت بە خەڵك.

ڕای دووەم: دەڵێ: نەخێر بەڵکو (نبيٍّ)یش وەك رسول لەسەری پێویست کراوە کە پەیامو بەرنامەی خوا بە خەڵکی بگەیەنێ، بەڵام ئەوەندە هە یە کە (نبيٍّ) لەسەر شەریعەتی پێغەمبەری پێش خۆ یەتیو شەریعەتو کتێبو بەرنامەیەکی سەربەخۆی بۆ نەهاتوە، ئە گەرنا ئەویش هەرە لەسەریەتی کە دینی خوا بەخەڵك ڕابگەیەنێ، واتە: ڕەوانەکراوانی خوا (رسُلُ الله) (عليهم الصلاة والسلام) هەموویان شەریعەتێکی

[1] (مريم 51).

سەربەخۆو تازەیان بۆ هاتوە، بەڵام پێغەمبەرانی خوا (أنبیاء الله) (علیهم الصلاة والسلام) هەر لەسەر شەریعەتی پێغەمبەرانی پێش خۆیان ڕۆیشتوون، بۆ وێنە: پێغەمبەرانی (بني اسرائیل) بە زۆری (نبـي) بوون، چونکە کتێبی سەربەخۆیان بۆ نەهاتوە، دیارە مەرجیش نیە ئێمە بزانین کتێب بۆ کامیان هاتوەو بۆ کامیان نەهاتوە، بەڵام لە فەرموودەی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) پێغەمبەرانی (بني إسرائیل) زیاتر بە (أنبیاء) ناویان هاتوە، بەڵام (عیسا) - سەلامی خوای لەسەربێ- چونکە (إنجیل)ی بۆ هاتوە، ئەویش ڕەوا نەکراو (رسول)ە، هەرچەندە لەسەر تەوراتیش ڕۆیشتوەو بە ڕاستی زانیوە، بەڵام گۆڕانکاریی (تعدیلات)ێکیشی لە تەوراتدا کردوە، بە فەرمانی خواو بە پێی ئەوە کە لە ئینجیلدا بۆی هاتوە، وەك گوتوویەتی: ﴿وَمُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ فَاتَّقُوا اللهَ وَأَطِيعُونِ﴾[1].

جا من پێم وایە ڕای ڕاست هەر ئەوەی دووەمەو زۆر بەی زانایانیش هەڵیانبژاردوەو پەسندیان کردوە، کە جیاوازی نێوان (نبـي)و (رسول) هەر ئەوەیە کە هەردووکیان خوا سروش (وحي)یان بۆ دەنێرێو لەسەریشیان پێویست دەکات کە پەیامو بەرنامەی خوا بە خەڵك بگەیەنن، ئەوەندە هەیە (رسول) شەریعەتو بەرنامەیەکی سەربەخۆو تازەی پێیە، بەڵام (نبـي) هەر لەسەر شەریعەتو بەرنامەی پێغەمبەری پێش خۆی دەڕوات، سەلاتو

---

[1] (آل عمران 50).

سەلامی خوا لەسەر تێکڕای پێغەمبەران (أنبیاء)و ڕەوانەکراوان (مرسلین)ی بەڕێز بێت.

وە لەوبارەوە دەگونجێ دوو فەرموودە بە بەڵگە بهێنرێنەوە کە لە یەکێکیاندا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((عُرِضَتْ عليَّ الأمَمُ فرأيتُ النبيَّ ومَعَه الرَّهْطُ، والنبيَّ ومعه الرَّجُلُ وَالرَّجلان، والنبيَّ ولَيْس معه أحَدٌ))[تر]، واتە: ئۆممەتانی پێشووم خرانە بەرچاو، پێغەمبەری (نبي) وام دەبینی کە کۆمەڵێك خەڵکی لەگەڵ دابوو، وە پێغەمبەری (نبي) وام بینی کە پیاوێك یان دوو پیاوی لەگەڵدابوو پێغەمبەری واشم دەبینی کەس ئیمانی پێ نەهێنابوو و کەسی لەگەڵدا نەبوو.

کەواتە: دیارە کە پێغەمبەران (الأنبیاء) یش وەك ڕەوانەکراوان (مرسلین) بانگەوازی خەڵکیان بۆ لای پەیامو بەرنامەی خوا (سبحانەو تعالی) کردووەو وانیە کە تەنیا لە بەرانبەر خۆیاندا خۆیان بە بەرپرسیار زانیبێ! فەرموودەی دووەمیشیان ئەمەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا فەرموویەتی: ((كانت بنو إسرائيل تسوسهم الأنبياءُ، كُلما هَلَك نبي خَلَفَهُ نبي...))[یر]، واتە: بەنی ئیسرائیل پێغەمبەران سەرپەرشتییان دەکردن، جا هەرکە پێغەمبەرێك دەمرد پێغەمبەرێکی دیکە شوێنی دەگرتەوە.

کەواتە: پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) لە مەسەلەی سەرپەرشتی کردنی خەڵكو کۆمەڵگاو مشوور لێخواردنیان کتومت وەك ڕەوانەکراوان (رُسُلْ) وابوونو ئەوانیش ئاینو بەرنامەی خوایان بە خەڵك

---

(تر) متفق عليه .

(یر) رواه البخاري .

ڕاگەیاندوەو لەکاتی دەست ڕۆیشتنو بۆ لواندا سەرپەرشتی ژیانو گوزەرانو کاروباریشیانیان کردوە.




## (3) پێغەمبەران (علیهم الصلاة و السلام) کێن؟!

خوای بەرزو مەزنو کاربەجێ لە قورئانیدا لەسەر زمانی (موسی) (علیه الصلاة والسلام) لە وەڵامی فیرعەوندا کە پر سیویەتی: ﴿فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى؟﴾[3]، واتە: ئەدی گەورەو سەروەری ئێوە کێیە ئەی موو سا؟!

---

(3) (طـه - 49).

فەرموویەتی: ﴿رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾(4) واتە: گەورەو سەروەرمان ئەو زاتەیە كە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوەو ڕێڕوونیی شی كردوە! (موسى) (علیه الصلاة والسلام) بەم وەڵامەی ویستوویەتی دوو ڕاستی (حقیقة)ی زۆر گەورە لە فیرعەون حاڵی بكات، یەكەم: حاڵەتی یاساداریی (مُنَظَّم)ی بوونەوەرو بەڕێوەچوونی بەپێی نەخشەو بەرنامەیەكی زانیاری یانەی ڕێك و پێك بەڵگەیە لەسەر بوونی خوایەكی پەروەردگاری زاناو دەسەڵاتدارو میهرەبان، كەواتە گەورەو شوورخۆری ئێمە ئەو خوا پەروەردگارەیە كە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوەو لە سەر بنچینەی بەرنامەو پەیڕەوێكی ڕێك و پێكیش ڕێڕوونی كردوە، هەرئەویش بوونی بە ئێمە ـ ی ئینسان ـ بەخشیوەو هەر بۆ خۆشی شوورمان لێ دەخوات و بەرنامەی ژیان و گوزەرانمان بۆ دیاری دەكات.

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست!

خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار پۆشاكی بوونی بە هەر شتێك پۆشیبێ، ڕێگاو بەرنامەی بەڕێوەچوون و كامڵ بوونیشی بۆ داناوە، جا هەندێك جاران ئەو ڕێگاو بەرنامەیە لە چەند یاساو دەستوورێكی فیزیایی و كیمیاییدا خۆی دەنوێنێ و، هەندێك جاران لە چەند غەریزەیەكدا، بەڵام ئینسان لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئەركی تاقیكرانەوەو جێنیشینایەتی (الخلافة)ی لە سەر زەوی پێسپێرراوە، لەبواری جم وجۆڵ و چالاكییەكانیدا تارادەیەكی زۆر ئازادی پێدراوەو بۆ هیچ كام لە یاسا فیزیایی و كیمیایی و بیۆلۆجییەكان و غەریزەو داخوازییە مەعنەوی و جەستەییەكان گەردنی پێ كەچ نەكراوە، ئنجا

---

(4) (طه – 50).

لەلایەکی دیکەشەوە لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەرکێکی یەکجار گرنگو مەترسیداری پێسپێرراوە، کە بەختیاری یان ژینتاڵی هەمیشەیی پێوەبەندە، خوای کارزانو میهرەبان وێڕای عەقڵو دڵو خەیاڵو پێنج هەستەکان، بە چەند ئینسانێکی شایستەو هەڵبژاردەدا بەرنامەو پەیرەوی تایبەتیی خۆیشی بۆ ڕەوانە کردوەو، لە هەموو جۆرو شێوەکانی هیدایەتو ڕێ پیشاندان بەهرەمەندی کردوە. کەواتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەو ئینسانە تێرو تەواوو شایستەو هەڵبژاردانەن کە خوای زاناو شارەزا بۆ گەیاندنی بەرنامەی خۆی ـ بە بەندەکانی ـ پەسەندی کردوون، خوای میهرەبان لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلاً وَمِنَ النَّاسِ...﴾(الحج- 75)، واتە: خوا چەند پەیامبەرێك هەڵدەبژێرێ لە فریشتانو لە خەڵكی. دیسان خوای زانا هەر لە بارەی ناساندنی کەسایەتی پێغەمبەرانەوە «علیهم الصلاة والسلام» فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى...﴾(یوسف – 109) واتە: وە لە پێش تۆدا هیچ کەسێکمان ڕەوان نەکردوە ـ بەسیفەتی پێغەمبەرایەتی ـ بێجگە لە پیاوانێك کە وەحییمان بۆ ناردوون لە خەڵكی ئاوەدانییەکان[تێ].

کەواتە لەم ئایەتەو لە ئایەتی پێشوویەوە سێ خەسڵەتو نیشانەی بنەڕەتی پێغەمبەرانمان بۆ دەدەرکەوێ:

یەکەم: پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) هەرکامێکیان تەواوترینو شایستەترین خەڵکی سەردەمی خۆیەتیو هەموو شیان هەڵبژاردەو

(تێ) وشەی (قری) کۆی (قریة)یەو لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا بە مانای ئاوەدانی و شاری قەرەباڵغ دێ، نەك گوندو لادێ کە ئەمە مانا عورفییەکەیەتی!.

سەرتۆپی مرۆڤایەتین‌و، هیچ کەس نەك هەر لەوان چاکتر نیە، بەڵکو تۆزی ڕێیەشیان ناشکێنێ.

دووەم: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەموویان پیاو بوو ون‌و، ئەو پایە بەرزو ئەرکە قورس‌و پڕ مەترسی‌یە بە ئافرەتان نە سپێرراوە، خواش بۆ خۆی چاکتر توانا و وزەی بەندەکانی دەزانیێ‌و، باشتر ماهیەتیان دەناسێ: ﴿أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ؟﴾[1].

سێیەم: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەموویان خەڵکی شارو ئاوەدانی یەکان بوو ون و، هیچ کامیان ڕەوەندو کۆچەری نەبوو ون، ڕەنگە هۆو حیکمەتی ئەمەش ئەوەبێ، کە خەڵکی نیشتەجێ (الحُضَّر) لە خەڵکی دەشتەکی (أهل البادیة) ژیرو وریاو چاوکراوەترو لێزانترن، دیارە پێغەمبەرانیش کە هەڵبژاردەی مرۆڤایەتین، پێویستە لە هەموو ڕوویێکەوە - تەنانەت لە شوێنی گەورەبوون‌و پێگەیشتنیشدا - تیرو تەواو بن، بۆ ئەوەی بەچاکترین شێوە ئەرکی سەرشانیان بەجێ بێنن‌و، پەیام‌و بەرنامەی خوا ڕابگەیەنن.

## (4) حیکمەتی ئینسان بوونی پێغەمبەران چیە؟!

هەر لە سەرەتای مێژووەوە ناحەزو نەیارانی خەت‌و ڕێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، (ئینسان بوون)ی پێغەمبەرانیان کردۆتە برو

(1) (الملك 14).

بەهانەی بڕوا پێنەهێنانیانو، چاوپێچکی چاوی خەڵکی عەوامو سادە، بۆ وێنە: خوای زانا دەربارەی (نووح)و گەلەکەی فەرمووویەتی: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ أَفَلا تَتَّقُونَ ۞ فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا هَذَا إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُرِيدُ أَنْ يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَاءَ اللهُ لَأَنْزَلَ مَلائِكَةً...﴾(المؤمنون 23-24)، واتە: وە بێگومان (نووح)مان بۆ لای گەلەکەی رەوانە کرد، فەرمووی: ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن! جگە لەوی هیچ پەرستراوتان نین، ئایا خۆتان ناپارێزن؟! ئەو زلە زلانەی کە بێبڕوابوون لە گەلەکەی گوتیان: ئەی خەڵکینە! ئەم کابرایە بەس ئینسانێکی وەك خۆتانە، دەیەوێ خۆتان بەسەردا هەڵکێشێ،وە ئەگەر خوا ویستبای ـ پێغەمبەرمان بۆ بنێرێ ـ فریشتەیەکی دەنارده خوار ..

هەروەها خوای قسە لەجێ لەبارەی هەڵوێستی بت پەرستانی مەککەوە لە بەرانبەر پێغەمبەرماندا ﴿صلى الله عليه وآله وسلم﴾ فەرموویەتی: ﴿وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ...﴾ (الفرقان 7) واتە: وە گوتیان: ئەمە چ پێغەمبەرێکە کە خواردن دەخواتو لە بازاڕان دەگەڕێ (بە مەبەستی کاسبیو بژێو پەیداکردن)!! هەڵبەتە شتێکی یەکجار سرو شتیو چاوەڕوان کراوە کەسانێکی خوانەناسو بت پەرست، یان ماددیو دنیاویست عەقڵی بە پەردەی هەواو ئارەزوو داپۆشراویانو، دڵو دەروونی بە خراپەو تاوان ژەنگ هێناویان، قەناعەت بەوە نەکات، کە (ئینسان) لێی بوەشێتەوە ببێتە دوێنراو (مُخاطَب)ی خواو هەڵگری بانگەوازو پەیامو بەرنامەکەی، چونکە ئەوان بەهۆی لە خوا دوورکەوتنەوەو شوێنکەوتنی نەفسو ئارەزووەکانییەوەو کەوتنە تەڵەو داوی شەیتانەوە، خۆیان لە مرۆڤ شۆراندوەو سنوورو لەمپەری نێوان خۆیانو شەیتانو ئاژەڵانیان شکاندوەو پەڕاندوەو، ئنجا بە

حوکمی یاسای (هەرکەسە لە هەمبانەی خۆیدا گوێزان دەژمێرێ) تەما شای پێغەمبەرانی پایە بەرزیشیان کردوە!!

بەڵێ گومانی تێدانیە بابایەك بڕواو قەناعەتی وابێ کە مرۆ ڤ ئەنجامو بەرهەمی گۆڕانو پەرەستاندنی ماددەیەو، وە چەی قەوزەو قرژاڵو کر مە گلخۆرکەیەو، بەرازئاساو مەیموونو سەگسار زادەیە!

ئاشکرایە کە لە سۆنگەی خۆ لەلا سووك بوونەوە ئینسانی هێ ندە لە لا گچکە دەبێتەوە، کە قەت قەت ڕێی ناکەوێ لەگەڵ خوادا بدوێو، پەیامو بەرنامەی لێ وەربگرێ! کەواتە: با خوانەناسو بێبڕوایانی نزمو پە ست لە بیرکردنەوەی ئاژەڵانەیاندا بەجێ بهێڵێنو، سەرنج بدەین دا خوا حیک مەتی (ئینسان بوون)ی پێغەمبەران چیە؟!

دەتوانین لە چەند خاڵێکدا ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەینەوە:

یەکەم: وەك لە خاڵی نۆیەمدا ڕوو نی دەکەی نەوە، گەورەترین حیک مەتو ئامانجی نێررانی پێغەمبەران (ع لیهم ال صلاة وال سلام) بریتـ یە لە بڕوبیانوو نەهێشتنو بەڵگە تەواوکردن (إقامة الحجة) لە سەر خەڵکی، وەك فەرموویەتی: ﴿**رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ..**﴾[1] دەجا گومانیشی تێدانیە کە تەنها کاتێك وەك پێویست بەڵگە لەسەر خەڵکی تەواو دەکرێو بڕو بەهانەیان ناهێڵرێ، کە پەیامو بەرنامەی خوا وەك پێویست بە خەڵکی ڕابگات، دیارە پەیامو بەرنامەی خواش ناگونجێ وەك پێویست بەخەڵکی ڕابگات، هەتا وێرای زمانی وتار (مقال) بە زمانی کردارو (حاڵ)یش لە شێوەی واقیعێ کی زی ندوودا نەخرێتە بەرچاویان، دیارە ئەمەش بەس لە حاڵێکدا دە کرێ کە ئەو

(1) (النساء 165).

کەسەی پەیامو بەرنامەی خوای هەڵگرتوە لە جینسو سروشتو ڕەگەزی ئەو خەڵکە بێتو، بەر لە هەموو شتێك بۆخۆی بەو بەرنامەو پەیڕەوەوە پابەند بێت، هەڵبەتە هەربۆیەش لە سوورەتی فاتیحەدا دوای: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ ڕستەی: ﴿صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ...﴾ هاتوە!

دووەم: حیکمەتی دووەمی (ئینسان بوون) ی پێغەمبەران ئەوەیە، کە ئایینو پەیامی خوا بەرنامەو پەیڕەوێکی فراوانو هەمەلایەنەیی ژیانە، هەر لە قسەکردنو خواردنو خواردنەوەو نوستنو هەستانو دانیشتنو بەڕێگادا ڕۆیشتنو دەست نوێژگرتنو خۆشۆردنەوە بیگرە هەتا حاڵەتی جەنگو ئاشتیو حوکم گێڕانو پەیوەندی نێوان دەوڵەتان! دە جا بێگومان پێشاندانو دەرەوشاندنەوەی بەرنامەیەکی ئاوا لەسەر ڕوو پەڕی کردەوەو ئاکارانو لە مەیدانی واقیعو ژیاندا، حەوجێی بە پێغەمبەرێکی ئینسان هەیە، کە هەموو ئەو هەڵسو کەوتو دیاردەو ئاکارانەی لەژیانی خەڵکیدا دەبینرێن، لە ژیانی ویشدا بەگوێرەی بەرنامەی خواو لە جوغزی شەرعو ئایینەکەیدا ببینرێن، تاکو خەڵکی بتوانن لەهەموو وردو درشتی ژیانیاندا بیکەنە سەرمەشقو چاوی لێ بکەن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ (الأحزاب -21)، واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقی یەکی باش بۆ ئێوە هەیە.

سێیەم: سێیەمین حیکمەت ئەوەیە، کە ئەگەر هاتبێتو ئەو پێغەمبەرانە ئینسان نەبان ـ بۆ وێنە فریشتە بوونایە ـ ئەو کاتە سەرەڕای ئەوەی کە خەڵکەکە نەیاندەتوانی لێی حاڵی بنو هەڵسو کەوتی لەگەڵ بکەن، مەگەر لە حاڵێکدا کە بچووبێنرایە سەر شێوەی ئینسان، کە دیارە لە

حاڵێکی واش دا لەگەڵ ئینسانەکانی دیکە لێیان تێکەڵ دەبووو دەگۆڕا، وەك خوا لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكاً لَجَعَلْنَاهُ رَجُلاً وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ﴾(الأنعام -9)، واتە: وە ئەگەر فریشتەمان ناردبایە دەمانگێڕا بە پیاو وە ئەوەی کە ئێستا مایەی لێ تێکەڵبوونیانە هەر لێمان تێکەڵ دەکردن.

بەڵێ سەرەڕای ئەوەش ئەو پێغەمبەرە فریشتەیی‌یانە نەك هەر نەدەبوونە بیانووبڕی خەڵکی، بگرە فریشتەییتی ئەو پێغەمبەرانە دەبوو بە چاکترین بەڵگەو بیانووی دەستی خەڵکی، چونکە ئەو کاتە دەیانگوت: جا خوایە ئێمە چۆن لە پێغەمبەرێکی فریشتە حاڵی بین، بۆ چی لە رەگەزو سرووشتی خۆمانت بۆ نەدەناردین؟! یان دەیانگوت جا خوایە ئێمە کوا وەك فریشتانمان پێدەکرێ، ئەگەر پێغەمبەرەکەشمان فریشتە نەبووایە، ئەویش هەر وەك ئێمە دەبوو و، نەیدەتوانی ئەو ئەرکە (قورسە!) بەرێوەبەرێ!!

## (5) ژمارەو ناوو بەرزو بەرزتریی (تفاضل)ی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) .

أ ـ ژماری پێغەمبەران: دەربارەی ژماری پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عن أبي امامة قال: قال أبو ذر: قلت يارسول الله كم وَفاءُ عِدَّةِ الأنبياء؟، قال مائة ألف وأربعة وعشرون ألْفاً، الرسل من ذلك ثلاث مائة وخمسة عَشر جَمّاً غفيراً﴾(تر)، واتە: ئەبوو ئومامە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئەبوو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ژمارەی پێغەمبەران چەند بووە؟ فەرمووی: سەدو بیست و چوار هەزار (124000)، سێ سەدو پازدە (315) لەوانە ڕەوانە کراو (مرسل) بوون، کە ژمارەیەکی زۆرن.

ب ـ ناوی پێغەمبەران: دەربارەی ناوی پێغەمبەران ـ کە مەبەستمان هەردوو جۆری (أنبیاء)و (رسل)ە (علیهم الصلاة والسلام) خوای پەروەردگار بە گشتی فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِنْ قَبْلِكَ مِنهُمْ مَنْ قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنهُمْ مَنْ لَمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ﴾(ير)، واتە: لە پێش تۆدا پێغەمبەرانمان ڕەوانە کردوون، جا هەیانە بەسەر هاتەکەیانمان بۆ تۆ گێڕاوەتەوە، هەشیانە بۆمان نەگێڕاویەوە... کەواتە زۆر لە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)، پێغەمبەری خۆمان ﷺ تەنانەت هەر بەسەرهاتەکانیشی نەزانیون، چ جای ئەوە کە ناوەکانیان بزانێ! وە ئەو پێغەمبەرانەی کە ناویان لە قورئاندا هاتوە بیست و پێنج (25) پێغەمبەرن (علیهم الصلاة والسلام)، ئەوانیش هەژدە (18) یان بە ڕیز لە شوێنێکدا باسکراون وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا

---

(تر) رواه أحمد في المسند: وصَحَّحه الألباني في (مشكاة المصابيح).

(ير) ( غافر 78 ).

آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ۞ وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ كُلاًّ هَدَيْنَا وَنُوحاً هَدَيْنَا مِنْ قَبْلُ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِ دَاوُدَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ۞ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِنَ الصَّالِحِينَ ۞ وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطاً وَكُلاًّ فَضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ﴾[]، واتە: ئا ئەوە بەڵگە (حجة)ی ئێمە بوو بەخشیبوومان بە ئیبراهیم بە سەر گەلەکەیەوە، هەرکەسێك بمانەوێ بە چەند پلە بەرزی دەکەینەوە، بێگومان پەروەردگارت کاربەجێو زانایە. وە ئیسحاقو یەعقووبمان بە ئیبراهیم بەخشی، هەرکامێکمان لەوانە هیدایەتدا، پێش ئەوانیش (نووح) مان هیدایەت دابوو، وە لە وەچەی نووح، (یان وەچەی ئیبراهیم) داوودو سولەیمانو ئەییووبو یوسفو مووساو هاروونن ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، وە هەروەها زەکەریاو یەحیاو عیساو ئیلیاس، ئەوانیش هەموویان لە چاکان بوون، وە ئیسماعیلو یەسەعو یونسو لووط، هەرکامێك لەوانەشمان بەرزکردەوە بەسەر جیهانییاندا بە پلەی بەرزی پێغەمبەرایەتی. وە حەوتیش لەو پێغەمبەرانە ناویان جیاجیا هاتوە، یەکێ لەوانە (ئادەم) (علیه الصلاة والسلام) وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى آدَمَ﴾[ي]، واتە: بێگومان خوا (ئادەم)ی هەڵبژارد، یەکێکی دیکەیان (هوود)ە وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُوداً﴾[]، واتە: وە بۆ گەلی (عاد) برایەکەیان (هوود)مان ڕەوانە کرد.

---

(تر) (الأنعام 83- 86).
(ير) (آل عمران  33).
() (هود  50).

یەکێکی دیکە لەو پێغەمبەرانە (صالح)ە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحاً﴾[تر]، واتە: وە بۆ گەلـی (ثمود) برایەکەیان ( صالح)مان ڕەوانە کرد.

وە یەکێکی دیکەیان (شوعەیب)ە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْباً﴾[یر]، واتە: وە بۆ گەلـی مەدیەن برایە کەیان ( شوعەیب)مان ڕەوانە کرد.

هەڵبەتە کە خوای کار بەجێ دە فەرموێ (أ خاهم) بۆ هەرکام لەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة وال سلام)، ل ێرەدا مەبە ست ئەوە یە کە لە ڕەچەڵەك (نسب)دا برایان بووە، ئەگەرنا لە ئیمانو دین دا ئەوان پێغەمبەری خوا بوونو گەلەکانیشیان کافر بوون.

وە دووی دیـ کە لە پێغەم بەران (ئ یدریس و ذەلکیـ فل)ن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِنَ ال صَّابِرِينَ﴾[]، وا تە: وە ئیسماعیلو ئیدریسو ذەلکیفل، هەرکامێك لەوانە لە خۆڕاگران بوون، وە پێغەمبەری کۆتاییـ یان (محمد)ە ﷺ، وەك خوای تاكو پاك دە فەرموێ: ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ﴾[]، واتە: موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، شایانیباسیـ شە کە چوار لەو پێغەمبەرە بەڕێزانە (علیهم الصلاة والسلام) عەرەبن، لەوا نە (هود، صالح) لە جۆری عەرەبی (العاربة)ن، چونکە عەرەب سێ جۆری هەبووە: عەرەبی لە بەین چوو (البائدة)، وە عەرەبی ئە سڵە عەرەب (العار بة)، وە عەرەبی بەعەرەبکراو (المستعربة)، (البائدة) ئەوانەن کە پێشتـر لەنێو چوونو

---

(تر) ( هـود  61 ).
(یر) ( هـود  64 ).
() ( الأنبيـاء  65 ).
() ( الفتـح  29 ).

نەماون وەك گەلــی: (عـاد، ثمود)، وە (العاربة) ئەوا نەن كە لە ئە سلّدا عەرەبن، وە (المستعربة) ئەوانەن كە عەرەب نەبوون، بەلّكو بوون بە عەرەب.

دووی دیكەش (إسماعیل و محمد)ن (علیهما الصلاة والسلام)، ئەوانە لە عەرەبی (المستعربة)ن، كە لە ئەسلّدا عەرەب نەبوون‌و دوایی زمانی عەرەبی فێربوون، چونكە ئیسماعیل كوڕی ئیبـراهیمە، دیارە ئ یبراهیمیش عەرەب نەبووە، كەواتە: پێغەمبەری خۆشمان لە ڕیشەو بنە چەكەوە دەگەڕێ تەوە بۆ ئیبراهیم‌و ئەویش وەك ئاشكرایە عەرەب نەبووەو بە زمانی عەرەبیش قسەی نەكردوە[تر].

كەواتە: سەرجەم بە مسۆگەریی بیست‌و پێنج كەس لە پێغەمبەران‌و ڕەوانەكراوانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) ناویان لە قورئانیدا هاتوە كە ئەمانەن: ((ئادەم، ئیدریس، نووح، هوود، صالّح، شوعەیب، ئیبـراهیم، لووط، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، یوسف، موسا، هارون، یونس، ئەیبوب، ئەلیەسەع، ذولكیفل، داوود، سولەیمان، ئیلیاس، زەكەریا، یەحیا، عیسا، موحەممەد)) (علیهم الصلاة والسلام).

ئنجا دەربارەی دوازدە كوڕەكەی (یەعقووب)یش (علیهم السلام) كە بە (الأسباط) لە قورئاندا ناویان هاتوەو (یوسف) یەكێكیانە (علیهم السلام) ئەوانیش بەڕای هەندێك لە زانایان پێغەمبەرن!، بەلاّم نازانین ناویان چییە، بەلّگەشیان لە سەر پێغەمبەرایەتی یازدە برایەكەی یوسف‌و كوڕانی یەعقووب ئەوەیە كە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿قُولُوا آمَنَّا بِاللّهِ وَ مَا

(تر) وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە لە (عبدالله بن عباس)ە (خوا لێیان ڕازی بێ).

أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ...﴾[1]، جا ئەوانە دەڵێن: مەبەست لەوشەی (أسباط) یش کە کۆی (سِبْط)ە، کوڕەکانی یەعقووبە، ئەو زانایانەش کە دەڵێن برایەکانی (یوسف) پێغەمبەر نەبوون، دەڵێن مەبەست لە (أسباط) نەوەو وەچەکانی یەعقووبن، کە لەنێو بەنی ئیسرائیلدا وەحی‌یان بۆ هاتوەو کوڕەکانی یەعقوب جگە لە یوسف (علیه السلام) هیچ کامیان پێغەمبەر نەبوون، چونکە ئەو ڕەفتارەی ئەوان لەگەڵ باب‌و برای خۆیاندا کردوویانە، وەك لە سووڕەتی (یوسف) بەیان کراوە ناگونجێ هی پێغەمبەران بێت! جا لە ڕاستیدا منیش ئەم ڕایەم پێ ڕاستەو دروستە کە پێغەمبەر نەبوون و ئەو قسەیەشم پێ بەهێزنیە، کە دەڵێ: ئەو ڕەفتارو هەڵس‌و کەوتە دزێوو قەڵبانەی برایەکانی یوسف (علیهم السلام) لە پێش وەحی بۆ هاتن و پێغەمبەرایەتییان دا بووە، چونکە پێغەمبەرانی خوا (علیهم السلام) پێش پێغەمبەرایەتیش لە گوناهی گەورەو شتی ناقۆلا هەر سەلامەت‌و پارێزراو (معصوم) بوونە! ئنجا سەیریشە کە خوا سێزدە پێغەمبەر لە یەك کاتدا بنێرێ ـ کە یەعقوب‌و دوازدە کوڕەکانی! وە لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە ئەو یازدە برایەی یوسف بێجگە لە پیلان و تەڵە کەو حەسەدو بوغزو قسەی خراپ‌و پاشان ژیوان بوونەوەو دان بە هەڵەو تاوانی خۆدا هێنان، خوا هیچی دیکەی لێ نەگێڕاونەوە! کەواتە کوا ڕۆڵ بینینی چاکەو خێریان وەك پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خوا؟!! وە لە سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)یشدا دوو پێغەمبەر ناویان هاتوە، کە بریتین لە (شیث و یُوشَعْ)و هەردووکیان فەرموودەیان لەسەرە، بۆ (شیث)، (ابن کثیر)

---

[1] (تر) (البقرة 136)، هەروەها لە ئایەتی (84)ی (آل عمران)و (163)ی (النّساء)یش دا هەمان مەبەست هاتوە.

گوتوویەتی: ((وكان نبــياً بنصّ الحديث الذي رواه أبن حِبّان في صحيحه عن أبي ذر مرفوعاً، أنَّه أُنْزِل عليه خَمْسون صحيفة))[تر]، واته: (شیت)یش (علیهم السلام) به دەقی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ كه (أبن حِبّان) له (صحيح)ی خۆیدا هێناویەتی كه له (ابو ذر) گێراویەتەوە، پێغەمبەر بووە، وە پەنجا پەڕ (صحيفة)ی بۆ هاتوە، شایانی باسیشه زۆربەی هەرەزۆری مێژوونووسان ڕایان وایه كه (شیث) له دوای ئادەمەوە بووە (عليهما الصلاة والسلام).

بۆ (يُوشَعْ)یش، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: یەكێك له پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل له غەزایەكدا كه بەرەو (بيت المقدس) چووه، به خۆر (ڕۆژ)ی گوتوه: ((أنت مأمورةٌ وأنا مأمورٌ، أللَّهم آحْبِسْها عليّ شيئاً))[یر]، واته: تۆ فەرمانبەری خوای‌و منیش فەرمانبەری خوام، خوا یه تۆزێك ئەم ڕۆژەم بۆ ڕابگرە.

جا هەندێك دەڵێن: چونكه نوێژی ئێواره (عصر) درەنگ بووه، ویستوویەتی نوێژی نەچێ، هەندێكیش دەڵێن: بۆ مەبەستی جەنگەكەی بووه، بۆ ئەوەی ڕۆژی بمێنێ تا دەگاته شوێنی دیاریكراوی خۆی بۆ ئەنجامدانی كارەكەی، بەڵگەشمان لەسەر ئەوەی كه ئەو پێغەمبەره (يوشع)(عليه السلام) پێغەمبەر بووه، پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەكیدا دەفەرموێ: ﴿ان الشمس لم تحبس الاّ ليوشع بن نون ليالى سار الى بيت المَقْدِس﴾[سر]، واته: خۆر تەنیا بۆ (یوشەع كوڕی نون) ڕاگیرا، ئەو شەوانەی كه بەرەو (بيت المقدس) ڕۆیشت (بۆ جەنگ‌و جیهاد).

---

(تر) البداية والنهاية: بەرگی (1)، لاپەڕە (99).

(یر) رواه مسلم و أحمد.

(□) رواه أحمد على شرط البخاري.

بەلاَم سێ کەسایەتی گەورە هەن کە زانایان ڕاجیایی (إختلاف)یان هە یە دەربارەیان کە ئایا پێغەمبەرن، یان نا؟! کە بریتین لە: (تُ بَّعْ و ذوال قرنين و خضر)، دەربارەی یەکەمو دووەمیان: (توببەعو ذولقەرنەین)، پێغەم بەرمان ﷺ بۆ خۆی فەرموویەتی: ((ما أدري تُ بَّع كان ن بـيـاً أم لا، و ما أدري ذوالقرنين كان نبـيـاً أم لا!))[تر]. واتە: من نازانم کە ئایا (تُ بعَّ) پێغەم بەر بووە، یان نا؟! وە نازانم کە ئایا (ذوالقرنين) پێغەمبەر بووە یان نا؟! کەوا تە مادام پێغەمبەر (عليه الصلاة وال سلام) نەزانێ کە ئەم دووا نە ئا یا پێغەمبەر بوون، یان نا، ئێمەش هیچی نازانین.

دەربارەی سێیەمیشیان (خضر)، کە خوای بەرزو مەزن لە سووڕەتی (الكهف)دا باسی دەکات، دیارە هەڵسوکەو تەکانی وەك هی پێغەم بەران (عليهم الصلاة والسلام) دەچن، بەلاَم زانا یان م سۆگەرو دلّن یانین کە پێغەمبەر بووبێت، چونکە خوای پەروەردگار لەبارە یەوە فەرموو یەتی: ﴿فَوَجَدَا عَبْداً مِنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا عِلْ ماً﴾[یر]، هەندێ لە زانایان دەڵێن: لێرەدا ﴿آتَيْنَاهُ رَحْ مَةً مِنْ عِ نْدِنَا﴾ وا تە: پ لەی پێغەمبەرایەتیمان پێدابوو وە زانیاری لای خۆم (العلم اللدنيّ)یشمان دابۆیە، هەندێکیشیان دەڵێن: نەخێر بەڵکو خوای پەروەردگار مەبەستی هەر ئەوە یە کە ڕەحمی پێکردبوو، وە زانیارییەکی تایبەتی فێرکرد بوو، بێ ئەوەی خۆی هەوڵی فێربوونی بدات.

دیارە کە بەبێ بەڵگەی شەرعی ڕوونو بێ چەندو چوونیش ناتوانین بە هیچ کەسێك بڵێیـن پێغەمبەر، بۆ وێنە (زەردەشت) ئێ مە ناتوانین ب ڵێین

---

(تر) رواه الحاكم و البيهقي وصححيه الألباني.
(یر) ( الكهـف 65 ).

پێغەمبەری خوایە، وە ناشڵێیـــن: بە تەئکیـد هەونییە، بەڵکو دەڵێیــن: نازانین، وە دەربارەی هەرکەسێکی دیکەش کە ناوی بە پێغەمبەر دەهێنرێ بەڵام بەڵگەی تەواوو دڵنیاکەرمان بەدەستەوە نیە، هەروا دەڵێیـــن.

ج ـ بەرزو بەرزتریی پێغەمبەران:

هەبوونی بەرزو بەرزتریی (تفاضل) لەنێوان پێغەمبەراندا شتێکی ئاشکراو ڕوونەو پێشتر باسمان کرد کە لە ئەسڵی پێغەمبەرایەتییاندا هەموویان وەك یەکن بەڵام لە کەسایەتیو پلەو پایەیاندا، هەڵبەتە بەرزو بەرزتریان هەیە، وەکو خوای پەروەردگار بەڕاشکاویی فەرمووبەتی: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾[تر]، واتە: ئەو ڕەوانەکراوانە (علیهم الصلاة والسلام) هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیان بەرز کردۆتەوە، دیارە وەك لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە پێشتر باسمان کرد، سێ سەدو پازدە (315) لەو سەدو بیستو چوار هەزار (124000) پێغەمبەرە ڕەوانەکراو (رسول)نو خوا ڕەوانەی کردوون بەبەرنامەو کتێبی تازەو سەربەخۆوەو، ئەوانە واپێ دەچێ پایە بەرزتربن لەوانی دیکە کە خاوەن کتێبو بەرنامەی سەربەخۆ نین، وە زۆربەی هەرە زۆری زانایانیش پێیان وایە ئەم پێنج پێغەمبەرانە (نوح، إبراهیم، موسى، عیسى، محمد) (علیهم الصلاة والسلام) کە بە خاوەن عەزم (أولو العزم) ناو دەبرێن، وەك خوا (عزّوجل) بە پێغەمبەری فەرمووە: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ﴾[یر]، واتە: خۆ ڕابگرە وەك چۆن پێغەمبەرانی خاوەن عەزم خۆیان ڕاگرت، لەوانی دیکە گەورەترن، چونکە زانایان دەڵێن: لێرەدا خوای مەزن مەبەستی پێ لەو چوارەی دیکەیە: (نوح،

---

(تر) (البقـرة - 253).
(یر) (الأحقـاف 35).

إبراهيم، موسى، عيسى) كەواتە: ئەو پێنج ەش لەنێو ڕەوا نەكراوان (الرُّسُل)دا پایەبەرزو گەورەترن، دیارە من تێبینیم هەیە لەسەر ئەوە كە تەنیا ئەو پێنج پێغەمبەرە بە خاوەن عەزم، لە قەڵەم بدرێن و بگرە بە ڕاستی نازانم كە هەبوونی عەزم ـ كە مەبەست پێی وی ستو ئیرادەی پتەوە ـ تەنیا بە ڕەوانەكراوانیشەوە بە گشتی تایبەت بكرێ، چونكە بە تەئكید تێكڕای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خاوەنی عەزم بوون و ئیرادەی پتەویان هەبووە، بەڵێ بێگومان لە ڕووی خاوەن عەزمییشەوە پێغەمبەرانی خوا بەرزو بەرزتریان لەنێودا بووە، مەبەست لە فەرمانی خواش: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ﴾ ئەوەیە كە پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ خاوەنی گەورەترین جۆری عەزم بێت.

شایانی باسیشە ناوی ئەو پێنج پێغەمبەرە پایە بەرزە لە دوو شوێنی قورئاندا هاتوون وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنْكَ وَمِنْ نُوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُمْ مِيثَاقاً غَلِيظاً﴾[تر]، وە فەرموویەتی: ﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾[یر]، وەك دەبینین ئەو پێنج پێغەمبەرانە، خوای تاك و پاك (عزّوجل) بە گرنگیی و بایەخ پێدانێكی تایبەتەوە باسی كردوون، لە هەردوو ئایەتەكەدا.

ئنجا بێگومان موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) كۆتایی هەموو پێغەمبەرانەو سەروەرو گەورەشیانە، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

---

(تر) (الأحزاب 7).
(یر) (الشورى 13).

﴿ مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللهِ وَخَاتَمَ النبـيينَ﴾[]، واتە: موحەممەد بابی هیچ کام لە پیاوانتان نییە، بەڵکو ڕەوانەکراوی خوایەو کۆتایی پێغەمبەرانە. هەروەها بۆ بەرزیی پلەو پایەی پێغەمبەر ﷺ کە لە هەموو پێغەمبەران پلەو پایەی بەرزترەو سەروەری هەموویانە، فەرموودە زۆرن، یەکێك لەو فەرموودانە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أنا سيِّدُ وَلَدِ آدم يوم القيامة ولا فَخْرَ، وبِيَدي لِواءُ الحمد ولا فَخْرَ، وما مِنْ نبـي يومئذٍ آدم فَمَنْ سِواءُ الاّتحت لوائي، وأنا أوَّلُ شافِعٍ و أول مُشفَّعٍ ولا فَخْرَ))[بم]، واتە: من گەورەی ڕۆڵەکانی ئادەمم لە ڕۆژی دواییدا بە شانازییشەوە وانالێم، وە ئالای ستایشکردن (ی خوا) لە ڕۆژی دواییدا بە دەست منەوەیەو شانازیش ناکەم، وە هیچ پێغەمبەرێکیش نییە لەو ڕۆژەدا ئادەمو غەیری ئادەم هەموویان دێنە ژێر ئەو ئالاو بەیداخەی کە من لەو ڕۆژەدا بەدەستییەوە دەگرم، وە من یەکەمین کەسم کە تکا دەکەم، وە یەکەمین کەسیشم کە تکام وەردەگیرێ لای خوا، وە بە شانازییشەوە وا نالێم.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: ((فُضِّلْتُ على الأنبياء بِستٍّ، أُعْطِيْتُ جَوامِعَ الكَلِم، وَنُصِرْتُ بالرُّعْبِ، وأُحِلَّتْ لي الغَنائِمُ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ طَهُوراً ومَسْجِداً، وَأرْسِلْتُ الى الخَلْقِ كافَّةً، وَخُتِمَتْ بيِ النبيّون﴾[سم]، واتە: بە شەش ئیمتیاز بەسەر پێغەمبەرانی دیکەدا بەرزکراومەوە: وشە مانا کۆکەرەوەکان (جوامع الكلم)م پێ دراون، وە ترسم بۆ خراوەتە دڵی دوژمنم، بەسەر دوژمنمدا سەرکەوتووم (و پێش ئەوەی بیگەمێ دوژمنم لێم ترساوە)،

---

(تر) ( الأحزاب  40 ).

(یر) رواه أحمد والترمذي وابن ماجه وصححه الألباني.

() رواه مسلم والترمذي.

وە غەنیمەتم بۆ حەلاڵ کراوە، وە زەوییم بۆ بە پاك‌و پاككەرەوە دانراوەو بۆشم کراوە بە مزگەوت، وە بۆ تێکڕای خەڵك ڕەوانەکراوم، وە پێغەمـبەرانیش بە هاتنی من کۆتایی یان هاتوە.

بە پەسند دەزانم کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودەیەی پێغەمـبەری خوا ﷺ بێنین کە دەفەرموێ: ((مَثَلي و مَثَلُ الأنبـياءِ مِنْ قَبْلي كَمَثلِ رجُلٍ بَنـى بُنياناً فأحْسَنَهُ وَأجْمَلَهُ الاّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زاويةٍ مِنْ زواياهُ فجعل الناسُ يطوفون به يَعْجبون لَهُ وَيقولون هلاّ وَضِعَتْ هذه اللَّبِنةُ فأنا اللَّبِنَةُ وَأنا خاتم النبـيّين))[(٢)]، واتە: وێنەی من‌و وێنەی پێغەمبەرانی پێش من، وەك ئەوە وایە کابرایەك خانوێکی دروست کردبێ ڕێکی خستبێ‌و ڕازاندبییەوە بێجگە لە جێی (خشت)ێك لە گۆشەیەك لە گۆشەکانیدا، ئنجا خەڵکی بە دەوریدا بگەڕێن‌و پێی سەرسام بن‌و بڵێن: خۆزگە ئەم خشتەش ڕۆنرابایە! دە جا من ئەو خشتەیەم‌و من کۆتایی پێغەمبەرانم.

(٢) متفق علیه.

## (6) پ لەی پێغ ـەمبەرایەتی بەخش ـراو ( وهـ بي )ە نەک وە دەستهێنراو ( کسـبي ):

بەڵێ پێغەمبەرایەتی بەخششێکی خوایی ـیەو ـبەرەنجی شان وەدە ست نایەت، ئەمە حەقیقەتێکە زۆر گرنگە ئێ ـمە ب ـیزانین‌و ـلە چەندان دە ـقی قورئاندا ئەو ڕاستییە ڕوون کراوەتەوە.

کەواتە هەندێك لە فەیلەسووفەکان‌و هەندێك ـلە ئەهـ ـلـی تە صەووف، وەك: ئیشراقی‌یەکان، کە وڕێنەیان کردوەو پێیان وابووە ئە ـگەر ئین ـسان زۆر زۆر طاعەت‌و عیبادەت بکاو تەزکیەی نەفسی خۆی ب ـکاو لە ـگەڵ خۆ ـیدا خەریك بێ‌و خۆی ماندوو بکاو لە خوا نزیك ببێتەوە، دەگو نجێ ـکە وە حی‌و پەیامی خوای بۆ بێت، ئەوە لە ڕاستیدا قسەیەکی یەکجار زۆر قر ـپۆك‌و ـبێ بناغەیان کردوە، چونکە خوای کار ـبەجێ ـپاش ناوهێ ـنانی ژمارە ـیەك ـلە پێغەمبەران فەرموویەتی: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ مِن ذُرِّيَّةِ آدَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْرَائِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا..﴾[1]
واتە: ئەوانە کەسانێکن لە پێغەمبەران کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون، ـلە وەچەی ئادەم‌و لەوانەی کە لە ـگەڵ ـنووح هـەڵمان ـگرتن، وە ـلە وە چەی ئیبراهیم‌و لە وەچەی ئیسرائیل (یعقوب) وە لەوا ـنەی ـکە هیدا ـیەتمان دان‌و هەڵمان بژاردن.

کەواتە: پێغەمبەرایەتی (النبوة) بەخشش‌و هەڵبژاردن‌و گوڵ بژێرکردنەو بەرهەمی کردو کۆش‌و ڕەنجدان نیە، وە لە جێگایەکی دیکە خوا (عزّوجل) ـبە

[1] (تر) ( مريـم 85 ).

ڕاشکاویی دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا وَ مِنَ النَّاسِ...﴾[تر]، واتە: خوا لە فریشتەکانو لە خەڵکی چەند ڕەوانە کراوێك هەڵدەبژێرێ .

هەروەها فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾[یر]، واتە: خوا بۆ خۆی دەزانێ پەیامی خۆی لای کێ دادەنێت، واتە: بۆخۆی دەزانێ کێ دەکاتە پێغەمبەر، (سەلاتو سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێت).

---

(تر) ( الحج - 75 ).
(یر) ( الأنعام  142 ).

## (7) چەند بنەمایەکی کەسایەتی پێغەمبەران ( علیهم الصلاة و السلام ).

1 ـ یەکەمین بنەمای کەسایەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەیە کە ئینسانن، نەفریشتەن‌و نەغەیری فریشتەن، بەڵکو ئینسانن وەك باقی ئینسانەکان. وەك یەکێك لە مەدح‌و پێهەڵگوتنی پێغەمبەردا دەڵێ: ((محمدٌ بَشَرٌ ولَيْسَ كالبَشَر. بَلْ هو ياقوتَةٌ والناسُ كالحجرِ)) واتە: موحەممەد مرۆڤە بەڵام وەك مرۆڤان نیە، بەڵکو ئەو مرواریی یەو خەڵکیش وەك بەرد وان، وە لەوبارەوە قورئان ئاوای بە پێغەمبەر فەرمووە: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ...﴾[تر]، تۆ بڵێ: من هەر بەشەرێکم وەکو ئێوە، بەڵام (ئیمتیازی من بەسەر ئێوەدا ئەوەیە کە) من وەحییم بۆ دێ!. هەر لەوبارەوە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَنْ يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَى إِلاَّ أَنْ قَالُوا أَبَعَثَ اللهُ بَشَراً رَسُولاً﴾[یر]، واتە: هیچ شتێك ڕێگر نەبوو لەوەی کە خەڵك ئیمان بهێنن کاتێك کە هیدایەتیان بۆهات، ئەوە نەبێ کە دەیانگوت: ئایا خوا بەشەرێکی کردوە بە ڕەوانەکراوی خۆی؟! واتە (چۆن بەشەر بەکەڵکی پێغەمبەرایەتی دێت؟!) دیارە ئینسان ئەگەر کافرو بێبڕوا بوو، خۆی لا بێ ڕێز دەبێ‌و خۆی بە سووك‌و ڕیسوا دەبینێ‌و خۆی پێ لەوە ناوەشێتەوە کە لەگەڵ خوادا قسە بکات‌و خوای بێوێنە فریشتەی بنێرێتە لا!، بەڵام

---

(تر) ( الكهف – 110 ).

(یر) ( الأسراء – 94 ).

ئینسان بە هۆی ئیمانەوە ڕێزو حورمەت‌و پلەو پا یەی خۆی دەزا نێ، بۆیە هەمیشە کافرەکان گوتوویانە: (أَبَعَثَ اللّهُ بَشَراً رّسولاً؟) چۆن خوا ئینسان دەکات بە پێغەمبەر؟!، هەرگیز ئینـ سان لـ یێی ناوە شێتەوەو شایستەی ئەوە نیە کە خوا ڕەوانەی بکات‌و فریشتەی بۆ لا بنێرێ! جا حیکمەتی ئینسان بوونی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوە یە کە ببن بە پێشەواو پێشڕەوو چاوساغ‌و خەڵك بتوانێ سەیریان بـ کات، چونکە پەیام‌و شەریعەتەکانی خوا نەهاتوون کە هەر بـ یـردۆزەو خەیاڵات بن‌و لە جیهانی ئایدیا (مثال)دا بخولێنەوە، بەڵکو هاتوون کە لەسەر ئەرزی واقیع بچەسپێنرێن.

کەواتە: دەبێ پێغەمبەرێك ئەو د ین‌و شەریعەتە هەڵبگرێ، کە بۆخۆی لە پێش هەموو کە سدا جێ بەجێی بـ کات، پا شان بە سەر دەوروبەریدا جێبەجێی بکات، تاکو خەڵك دینێکی بەرجەستە (مُجَسَّم) لە پێغەمبەردا ببینێ، وەك کە دەربارەی ڕەوشت‌و ئاکاری پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) پرسیار لە (عائیشە) ( خوا لـ یێی ڕازی بێ) کراوە، لە وەڵامدا گوتوویەتی: ﴿كان خُلُقهُ القرآن﴾[تر]، وا تە: ڕەو شت‌و ئاکاری پێغەمبەر قورئان بوو، قورئان چۆن‌و چی دەفەرموێ (محمد)یش بەوجۆرە بوو.

دیارە پێغەمبەران ئەگەر ئینسان نەبوونایە نەدەگونجا ببنە چاو ساغ‌و سەرمەشق بۆ خەڵك و هەر شتێکیان کردبایە، دوایی خەڵك دەیگوت:- ئاخر ئەوان فریشـتەن، ئێمە چۆن وەك ئەوانمان پێ دەکرێ؟ بەڵام ئێستا

(تر) رواه مسلم.

کە ئینسانن هیچ کەس ئەو بیانووەی نیە، ئەویش وەك تۆ ئینسانەو خوێن‌و گۆشتە، ناڕەحەت دەبێ‌و تووشی سەرماو گەرماو گرفتاری‌و ئێش‌وژان‌و برسێتی‌و تێنوێتی دەبێ‌و لەش ساغ‌و نەخۆش دەبێ‌و خۆشی‌و ناخۆشیی دەبینێ کە ژیاننامەکانیان دەخوێنینەوە دەبینین کە هەرکام لە (نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا، محەممەد) وە سەرجەم پێغەمبەرانی دیکە وەك: (أیوب، یوسف، یونس، لوط، شعیب، هود، صالح) هەرهەموویان تووشی چەندان جۆرە گرفتاریی‌و نەخۆشی‌و دەردەسەریی بوون، تاکو بۆ گەلەکانیان ببنە پێشەنگ‌و پێشڕەو.

وە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە حوکمی ئینسان بوونیان خواردن‌و خواردنەوەیان هەبووە، تووشی سەرکەوتن بوون، تووشی تێشکان هاتوون، هەیانبووە لێی دراوەو هەیانبووە کوژراوەو زۆر بەیان دەربەردەرو شاربەدەر کراون‌و ... هتد واتە: ئەو شتانەی کە بەسەر باقی خەڵك دێن، بەسەر ئەوانیش هاتوون زۆر بە زیادەوەش!

ئنجا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە بەشەر بوون، کەواتە: فریشتە نەبوون، وە بەشیشیان بە خوایەتی‌یەوە نیەو نابێ بەرزبکرێنەوە بۆ پلەی خوایەتی‌و ئەو شتانەی کە بۆ خوا دەکرێن، وەك بەندایەتی‌و بەگەورەگرتن‌و مل بۆ کەچکردن‌و ... هتد، نابێ بۆ پێغەمبەران بکرێن، چونکە بەڵێ ئەوان ئینسانی هەڵبژاردەو پێغەمبەرانی پایە بەرزن، بەڵام هەر ئینسانن‌و خوا نین.

2 ـ یەکی دیکە لە بنەمایەکانی کەسایەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەیە کە هەم لە ڕووی جەستەیی (خَلْقي) یەوەو هەم لە

ڕووی ڕەوشتی (خُلُقي)یەوە تەواوترین ئینسان بوونو چاکترینو جوانترینو لێهاتووترین ئینسان بوون، هەروەها خاوەنی بەرزترین ڕووحو پاکترین فیطرەتو وردترین بیــرو هۆشیارترین هۆشو گەورەترین عەقڵ بوون.

3 ـ پێغەمبەرانی خوا (عليهم الصلاة والسلام) هەموویان پیاو بوونو هیچ کامیان ئافرەت نەبوون، وەك خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە دە فەرمووێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ﴾[تر]، واتە: لە پێش تۆدا هەر پیاوانمان ڕەوانە کردوونو وەحییمان بۆ ناردوون.

4 ـ وە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لە گوناهە گەورەکان پارێزراو (معصوم) بوونو خوا پاراستوونی لە تووش بوونی خراپەو گوناهـ، چ پێش پێغەمبەرایەتیو چ دوای پێغەمبەرایەتی.

ئەو گوناها نەش کە خوای بێهاو تا لە قورئا ندا لەبارەی پێغەمبەرانەوە باسیان دەکات: وەك ئادەم کە لە درەختەکەی خواردو، مووسا کە پیاوە قیبطیيەکەی کو شتو، ئیبراهیم کە وەك لە فەرموودەدا[یر] هاتوە سێ قە سەی کردن کە لەڕواڵەتدا وەك درۆ دەرچوون، وە نووح کە بۆ کوڕە کافرەکەی پاڕایەوە ... ئەوا نەو غەیری ئەوانەش کە پاڵدراونە لای پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، دەڵێــن: ئەو ڕەفتارانە سەرجەمیان هەڵە (خطأ)نو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لە ئەنجامی کۆشش کردن (إجتهاد)ێکدا کە تێیدا نەیانپێکاوە تووشیان بوون، نەك گوناهـو خراپە بووبنو پێغەمبەران بە ئانقەست کردبیانن. هەر بۆیەش من ئەوڕایە بە ڕاستو

---

(تر) (الأنبيــاء 7).

(یر) لە (صحيح البخاري) دا هاتوە.

پەسند دەزانم کە دەڵێ پێغەمبەرانی خوا (عـليهم الـ صلاة والـ سلام) وێڕای گوناهە گەورەکان لە گوناهی گچکەش پارێزراو (معصوم)ن.

5 ـ یەکی دیکە لەو بنەمایانە ئەوەیە کە، پێغەمبەران چاویان بە خەودا چووە، بەڵام دڵیان هەر بێدار بووە، وەك پێغەمبەرمان ﷺ دە فەرموێ: ((وَكذلك الأنبيـاء تنامُ أعينهُم ولا تنامُ قُلُوبُهم﴾(تر)، وا تە: هەروەها پێغەمبەرانیش چاویان خەوی لـێکەوتوە، بەڵام دڵ یان هەر بـ ێدارو هۆشیار بووە.

6 ـ وە پێغەمبەران لەکاتی سەرەمەرگیاندا سەرپشك کراون، کە ئایا حەز دەکەن بمێننەوە، یان دەتانەوێ بمرن؟، وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: ((ما مِنْ نبـي يَمْرضُ الاّ خُيِّرَ بَيْن ا لدنيا وَالآ خرة﴾(یر)، وا تە: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە نەخۆش کەوتبێ، لە حاڵەتی سەرەمەرگ حە تمەن سەرپشك کراوە، کە ئایا پێت خۆشە لە دن یادا بمێن یەوە یان بەرەو عالەمی دوارۆژ بچی؟! بەڵام ئەوان کە زانیویانە کاتی مردنیان هاتوەو خوا ئەو کاتەی دیاریکردوە، یەکسەر مردنیان هەڵ بژاردوە هەر چەندە ئیختیاریان پێدراوە کە ئەگەر حەز نەکەن بە مردن، خوای پەروەردگار، کاتەکەیان بۆ درێژ بکاتەوە.

7 ـ تایبەتمەندیەکی دیکەی پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام) ئەوە یە کە لە هەر شوێنێك وەفاتیان کردبێت، هەر لەو شوێنەدا ن ێژراون، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لَمْ يُقْبَرْ نبـي الاّ حَ يْثُ يَ موُتُ))(سم)،

---

(تر) رواه البخاري.
(یر) رواه البخاري و مسلم.
(سم) رواه أحمد بسند صحيح .

واتە: هەر پێغەمبەرێك لە كوێ وەفاتی كردبێت، هەر لەو شوێنە شدا نێژراوە، پێغەمبەری خۆشمان (علیه الصلاة والسلام) هەر لە ژوورەكەی عائیشەدا (خوا لێی ڕازی بێ) كە وەفاتی تێداكرد، هەر لە شوێنی وەفات كردنەكەی بەخاك سپێررا.

8 ـ تایبەتمەندیی یەكی دیكەی پێغەمبەران، ئەوەیە كە زەوی نایانخوات و لەژێر زەویدا نارزن، وەك پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: ((إن الأرض لا تأكُلُ جَسَدَ الأنبياء))(تر)، واتە: زەوی جەستەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ناخوات و نارزێنێ.

9 ـ وە تایبەتمەندیی یەكی دیكەیان، ئەوەیە كە لە گۆڕەكانیاندا زیندوون، وەك پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: ((الأنبياء أحياء في قبورهم يُصلُّون))(یر)، واتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەموویان زیندوون لەگۆڕەكانیاندا نوێژ دەكەن.



(تر) رواه أبو داود والنسائي، وصحّحه ابن خزيمة: فتح الباري: بەرگی(8)، لاپەڕە (188)
(یر) رواه البخاري ومسلم وأصحاب السنن.

## (8) بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پێنج جۆرە بەڵگەیان هەبوون‌و هەرکام لە پێغەمبەران لە پێنج ڕووەوە پێغەمبەرایەتی یان ئیسپات بووە:

**یەکەم : موعجیزەکانیان: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە كە موعجیزەی نەبێت :-**

وەکو کە پێغەمبەر دەفەرموێ: ((مامن نبي إلاّ وَأُوتيَ من الآيات ما مِثْلُهُ آمن عليه البَشَرُ وَأنّما كان الذي أُوتيْتُهُ وَحْياً أُوحَي الليَّ فأنا أرجو أن أكونَ أكثرهم تابِعاً يوم القيامة))[تر]، واتە: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە خوا نیشانەو بەڵگەیەکی نەداتێ، کە خەڵك بەپێی ئەو نیشانەو بەڵگەیە ئیمانی پێبێنن، وە نیشانەو موعجیزەکەم سروش (وحي)ێکە بۆم نێرراوە (کە قورئانە)، بۆیە من ئومێد دەکەم کە شوێنکەوتووانم لە هی هەموویان زیاتر بن لە ڕۆژی قیامەتدا.

بەڵگەی ئەوەش کە پێغەمبەران موعجیزەیان هەبووە، چەندان ئایەتی قورئانی بەرێزن، بۆ وێنە خوای کاربەجێ لە سەرەتای ئایەتی ژمارە (25) لە سوورەتی (الحديد) فەرمووییەتی: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ﴾، واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگەگەلی ئاشکراو ڕوونەوە ڕەوانە کردوون، شایانی باسیشە کە موعجیزەی پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) هی هەرکامێکیان بەپێی چاخ‌و سەردەمی خۆی گۆڕاوە، هی مووسا(علیه السلام)، گۆچانەکەی بووە کە

---

(تر) رواه البخاري.

بۆتە مارێکی گەورە، دەستی بووە کە وەك گڵۆپ ڕووناك بووە، و بێڕای چەند موعجیزەیەکی دیکەش، هی عیسا (علیه السلام) ئەوە بووە کە مردووی زیندوو کردۆتەوە بە فەرمانی خوا، وە هەموو جۆرە نەخۆشییەکی چاك کردۆتەوە، هی صالح (علیه السلام) ئەوە بووە کە حو شترێك لە بەردێك هاتۆتەدەر، هی سولەیمان (علیه السلام) ئەوە بووە کە چەند (جِنّ)و (با)و (باڵندە)ی بۆ ڕامو ژێردەستە بووە ... هتد، موعجیزەی هەرکام لە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) بەپێی هەلومەرجو واقیعی کۆمەڵگایەکەی بووەو خەڵکەکە لەو کاتیدا بە چ شتێك سەرنجیان ڕاکێشرابێت یان لەوکاتەدا چ شتێك زیاتر باو بووبێت، موعجیزەی پێغەمبەرەکەش لەوجۆرە بووە، بۆ نموونە: ڕۆژگارێك کە (موسا) (علیه السلام) بۆلای فیرعەونو گەلەکەی ڕەوانەکراوە جادووگەریی (علم السِّحر)، باوبووە، بەڵام لە ڕۆژگاری هاتنی (عیسا) (علیهم السلام)دا پزیشکی گەریی (علم الطب) ڕەواجی هەبووە... دیارە بەو شێوەیەش چاکتر بەڵگە لە سەر خەڵکی تەواو دەکریو بیانوو بڕاو دەکرێن.

**دووەم : موژدەدانی پێشووەکان بە هاتنی داهاتووەکان :**

بەڵێ هەر پێغەمبەرێکی پێشوو موژدەی داوەو بە گەلی خۆی ڕاگەیاندوە کە لە دوای من پێغەمبەرێکی ئاواو ئاوا دێت، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: **﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ**

الـ شَّاهِدِينَ﴾[ت]، واتە: وەیاد بکەوە کاتێك خوا پەیمانی لە پێغەمبەران وەرگرت لە سۆنگەی ئەوەوە کە کتێبو حیکمەتم پێتان داوە هەر کاتێك پێغەمبەرێکتان هاتە لا ئەو ئایینو بەرنامەی ئێوەی بەڕاست دانا دەبێ بڕوای پێ بێننو سەری بخەن - خوا- فەرمووی ئایا دانتان پێدا هێناو پەیمانی منتان لەسەر ئەوە وەرگرتو بەڵێنتاندا؟ گوتیان: دانمان پێدا هێنا!

فەرمووی دەجا ئێوە شایەد بنو منیش لەگەڵتان لە شایەدانم.

بەڵێ هەموو پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام﴾ ئەو پەیمانەیان لـێوەرگیراوە، کە هەر پێغەمبەرێك لەدوای خۆتان هات، بەگەلەکەشتان ڕابگەیەننو بۆ خۆشتان ئیمانیان پێ بێننو پشتیوانییان بکەن.

بۆ هاتنی پێغەمبەری خۆشمان هەموو پێغەمبەران ئەو پەیمانو بەڵێنەیان لـێ وەرگیراوە، بە تایبەتی عیسا (علیه السلام)، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكُمْ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ...﴾[ث]، واتە: عیسای کوڕی مەریەم گوتی: ئەی بەنی ئیسرائیل، من پێغەمبەری خوام، ئەوەی پێش خۆم بە ڕاست دەزانم کە تەوڕاتە، وە موژدەشتان پێ دەدەم، بە هاتنی پێغەمبەرێك کە لە دوای من دێتو ناوی (ئەحمەد)ە.

---

(ت) ( آل عمران 81 ).
(ث) ( الصـف 6 ).

**سێیەم : کەسایەتی (شخصیة)ی خۆیان :**

هەرکام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کەسایەتییان لەوپەڕی بەرزیی دابووە لە ڕووی ئیمانو عەقیدەوە، لە ڕووی خواپەرستییەوە، لە ڕووی ڕەوشتو ئاکارو هەڵسو کەوتو ڕەفتاری پەسندەوە، لە ڕووی دوارۆژ بەسەر دنیادا هەڵبژاردنو دنیا بەکەمگرتنەوە، لە ڕووی ئازایەتیو بوێرییەوە، لە ڕووی پشت بەخوا بەستنەوە، لە ڕووی ئەوەوە کە دژو پێچەوانەی هەموو ئەو دابو نەریتی نەفامیی ڕۆژگاری خۆی بووەو لە نەیارانیشی بێمنەت بووەو هیچ پشتو پەنایەکیشی نەبووە جگە لە خوا، دیارە ئینسانی ئاوا ئەگەر خۆی لەسەر حەق نەبینێو دڵنیا نەبێ لەوەی کە خوای بەرزو مەزن پێی گوتوەو پێی ڕاگەیاندوە، ناتوانێ شتی وا بکات.

کەواتە: کەسایەتی دامەزراوو پاكو چاكو تێرو تەواوی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتییان.

**چوارەم : پەیامو بەرنامەیەك کە هێناویانە :**

پەیامو بەرنامەو کتێبی هەر کام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئەگەر تەماشا بکرێتو لێی بکۆڵدرێتەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو پەیامو بەرنامەو کتێبە، لە توانای ئینساندا نیەو حەتمەن لە وەحی خواوە هاتوە، بۆ نموونە: خەڵك هەمووی لە بەرانبەر قورئاندا دەستەوستانو سەرسامەو ئەو زانایانەی کە لێدەکۆڵنەوەو شارەزاو پسپۆڕن هی وایان هەیە تەنیا بە تێگەیشتنی یەك ئایەت، مسوڵمان بووە، وەك ئێستا دەبینرێ بەردەوام ژمارەیەکی زۆر لەزانا ئەورووپیو

ڕۆژئاواییەکانو غەیری وانیش، دوای ئەوەی کە لە قورئان دەکۆڵنەوەو تێی دەگەن، یەکسەر مسوڵمان دەبن، کە زۆربەیان خاوەن بڕوانامەی بەرزنو پسپۆڕن لە یەکێك لە لقەکانی زانستدا.

## پێنجەم : پشتگیریی کردنی خوا لێیان و سەرخستنیان :

بەڵگەیەکی دیکەی ڕاستێتی پێغەمبەران ئەوەیە کە خوا پشتگیری کردوونو پارستوونیو سەری خستوون .

بەڵێ خوای پەروەردگار بە درێژایی مێژوو پشتگیریی پێغەمبەرانی خۆی کردوەو دینو بەرنامەکەیانی هێشتۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو هەموو دوژمنو ناحەزانەیان هەبوون، وە ڕێچکەو بیردۆزەکانی ناحەزو نەیارەکانیان بوونەتە بلّقی سەر ئاوو فڕێ دراونەتە زبڵدانی مێژووەوە، هەرچەندە پێغەمبەران (علیه السلام) بێ پشتو پەنای ڕواڵەتی بوونو بە پێچەوانەوەش نەمروودو فیرعەونو طاغووتەکان سامانو هێز توانای دونیایان بەدەستەوە بووە!

## (9) بۆچی مرۆڤایەتی پێویستی بە پێغەمبەرانەو پێغەمبەران بۆچی نێرراون؟!

دەتوانین بە کورتیو پوختی بڵێین: مرۆڤایەتی لە دوو ڕووانەوە پێویستی بە پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، لە ڕووی هیدایەت بۆ ئینسانو لە ڕووی ڕێکخستن بۆ ژیانو گوزەرانەوە.

1- یەکەمجار هیدایەت بۆ ئینسان، چونکە ئینسان پێویستی بەوە هەیە، کە بزانێ لە کوێوە هاتوە؟ بۆ چی هاتوە؟، بۆ کوێ دەچێ؟! کێ هێناویەتی چی پێ سپێرراوە؟! کە بێگومان جیهانبینیو ئیمانو عەقیدە وەڵامی ئەم پرسیارانەی لە مست دەنێ، پاشان پێویستی بەوە هەیە ئەو فیطرەتو دەروونەی کە بۆ خوا پەرستیو بەندایەتیکردن بۆ خوا تینوویە، ئۆخژنو ئارامی بۆ بێتو تەسەللای بێت، دیارە ئەوەش بەبێ خواپەرستی ڕاستو دروست نایەتەدی، کە لە درووشمەکانی خواپەرستی (شعائر العبادة)دا بەرجەستەیە.

پاشان هەموو ئینسانێك ـ مادام فیطرەتی تێك نەچووبێ ـ عەودالی ڕەوشتی بەرزو خەسڵەتە پەسندەکان (فضائل)ە، بۆ نموونە: هەموو ئینسانێك ڕاستگۆیی پێ خۆشەو ڕقی لە درۆیە، ئەمانەتی پێ خۆشەو ڕقی لە خیانەتە، پاکیی پێ خۆشەو ڕقی لە پیسییە، جا پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) هاتوون کە ڕەوشتی بەرزو کاری جوان بڵاوبکەنەوەو فێری خەڵکی بکەن، وە سیفەتە نزمەکان (رذائل)و ڕەوشتو خوو خدەی خراپ بنبڕ بکەنو لە ڕیشەی دەربێنن.

2- هەروەها مرۆڤایەتی بۆ ڕێکخستنی ژیانو گوزەرانی تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتی پێویستی بە پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) تاکو بە پێی ئاراستەکانی وەحی خوای زاناو تواناو کاربەجێ‌و بە بەزەیی لە هەموو لایەنەکاندا ژیانو گوزەرانی تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتی خۆی ڕێك بخاتو پاش لە خۆدا بەرجەستەکردنی ڕێنمایی (هدی)ی خوا ـ وەك تاك ـ لە هەموو ڕووەکانی: جیهانبینیی‌و ئیمانو عەقیدەو خواپەرستیی‌و خوو ڕەوشتو ئاکارەوە، بەرنامەی ڕاست (دین الحق)ی خواش ـ وەك کۆمەڵ ـ لە هەموو ڕووەکانی خێزانیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی‌و ئابووریی‌و ... هتدەوە لە خۆیدا بەرجەستە بکات، وەك خوا (عزّوجل) لەبارەی ئەركو ئامانجی پێغەمبەرانەوە فەرموویەتی: ﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ﴾(تر)، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خۆی بە ڕێنمایی‌و بەرنامەی ڕاستەوە ناردوە..

ئنجا بەڕاستی کاتێك سەرنجی واقیعی کۆمەڵگای بەشەری دەدەین لەم ڕۆژگارەدا دەبینین کە بەدەست خۆیەوە گیری خواردوە، بەدەست ئەو تەکنۆلۆژیایەوە کە بەرهەمی زانیارییەکە ئیمانو ئەخلاقی بەرزو پێش ئەوەش جیهانبینییەکی ڕاستو دروستی لەگەڵ داندیە! بۆیە دەبینین تەکنۆلۆژیایەکە بەشی زیاتر بۆ کاولکاریی‌و ستەمو چەوساندنەوەو بڵاوکردنەوەی خراپەو فەسادو ئاشووبو ئاڵۆزیی بەکاردێ. هەتا خێرو خۆشیی‌و ئاوەدانیی‌و... هتد!

(تر) ئەم ڕستە قورئانیی‌یە لە سێ شوێنان دووبارە بۆتەوە کە ئەمانەن:
أ - ( التوبة - 33 ). ب - ( الفتح 28 ). ج - ( الصف 9 ).

ئنجا بێگومان تەنیا کەسێك دەتوانێ بەرنامە بۆ ژیانی مرۆڤ دابنێ، کە نهێنییەکانی بوونەوەر هەمووی بزانێ، وە نهێنییەکانی ڕووحی ئینسانو نهێنییەکانی جەستەی بزانێ، وە نهێنییەکانی تاكو کۆمەڵو خێزان، بەڵکو نهێنییەکانی دونیاو قیامەت بزانێ، ئەوەش هەر خوای بەدیهێنەرو تاكو پاکە (سبحانە وتعالـی).

بۆیە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ؟!﴾[1].

بەڵێ یان بەرنامەو حوکمی خوا (عزّو جل)، کە لە سەر زانیاریو حیکمەتی بێسنووری خوا بنیات نراوە یان بەرنامەو حوکمی ئینسان، کە لەسەر بناغەی نەفامیی (جهل) بنیات دەنرێت، چونکە هەر چەندە ئینسان زۆر زانا بێت، بەڵام سەبارەت بەوە کە بەرنامە بۆ ئینسان دابنێت هەر بە نەزانو نەشارەزا دادەنرێو بەرنامەکەیشی هەرسەری لە نەفامییەوە دەردەچێ.

ئاخر مرۆڤ هەرچی یەك بێت بەرانبەر بە نهێنییەکانی بوونەوەرو ژیانو مرۆڤـو دنیاو دوارِۆژ، هەر نەزانەو هەتا شتێك دەزانێ سەدان شت نازانێ!

ئێستاش بۆ ئەوەی تیشکی زیاتر بخەینە سەر هۆی پێویستی مرۆڤایەتی بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) با لە چەند خاڵێکی کورتیشدا ئاماژە بکەین بە ئامانجی نێررانیان:

---

[1] (المائدة 50).

**ئـامانجی نێـررانی پێغـەمبەرانی پایـــە بەرزی خـــوا:**

**یەکەم: بەڵگەو بەهانە بەدەست خەڵکی‌یەوە نەهێشـتن لە سەر گرتـنی ڕێی چەوتو هـەڵە.**

خوای کاربەجێ لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللهُ عَزِيزاً حَكِيماً﴾(تر)، واتە: پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەرن، بۆ ئەوەی خەڵکی لە دوای ـ نێررانی ـ پێغەمبەران هیچ بەڵگەیان نەمێنن لەسەر خوا، وە خوا زاڵو کاربەجێیە.

لەم ئایەتە دەفامرێتەوە کە عەقڵی ئینسان بە تەنێ بەس نییە بۆ بەرنامە دانانو بەرێوەچوونی بە شێوەیەکی ئینسانانە، هەر بۆیەش خەڵکی پێش هاتنی پەیامو بەرنامەی خوا بە پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) مافی گلەیی‌یان هەیەو، بەڵگەیان بەدەستەوەیە!!

**دووەم : چەسپاندنــی بیـری خــوا بەیەك گــرتن (التوحیـد)و، ڕیشـەکێش کردنی هـاوبەش پەرستی (الشـرك).**

خوای تاكو بێ وێنە لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاّ أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾(ير)، واتە: وە بەر لە تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوان نەکردوە مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە بێگومان جگە لەمن هیچ پەرستراو نین، دەجا بم پەرستن!

---

(تر) ( النساء 165 ).
(ير) ( الأنبياء 25 ).

**سێ یەم: بانگکردن و کۆکردنەوەی خەڵکی لەسەر ڕاستە شەقامی خوا.**

خوای چاکەکار لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ ۞ يَهْدِي بِهِ اللهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلامِ وَيُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾[تر]، واتە: بە تەئکید لەلایەن خواوە ڕووناکیی و کتێبێکی ڕوونکەرەوەتان بۆ هاتوە، خوا بەهۆی وی‌یەوە کەسانێك کەوە دوای ڕەزامەندیی وی دەکەون بەرەو ڕێیەکانی سەلامەتی ڕێڕوونی‌یان دەکات، وە لە تاریکی یانەوە بەرەو ڕاستە شەقام ڕێڕوونی‌یان دەکات.

**چوارەم : نەهێشتنی ستەم و چینایەتی و خراپە، چەسپاندنی دادگەریی و یەکسانی و چاکە.**

خوا بەرزو مەزن لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ...﴾[یر]، واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بە موعجیزەوە ناردوون وە کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوار، بۆ ئەوەی خەڵکی بەدادەگەریی بەرێوە بچن، وە ئاسنیشمان ناردۆتە خوارێ .. ( چونکە چەسپاندنی دادگەری و لابردنی ستەم بەبێ هێز ناکرێ).

---

(تر) ( المائدة 14،15 ).

(یر) ( الحدید 25 ).

**پێنجـەم : بوونە پێشــڕەوو ســەر مەشـق بۆ خەڵـکی.**

خوای تاك‌و پاك لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُوا اللهَ وَالْيَوْمَ الآخِرَ وَذَكَرَ اللهَ كَثِيراً﴾[1]، واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە سەر مەشقی یەکی چاك هەیە، بۆ کەسێك کە بە ئومێدی (پاداشتی) خواو ڕۆژی دوایی‌یەو زۆر یادی خوا دەکات. لە ڕاستیدا مەسەلەی سەرمەشقی‌و پێشڕەوایەتی لە ژیانی ئینساندا شتێکی یەکجار گرنگ‌و کاریگەرە، چونکە ئەوەی کە هەر لە بەرایی مێژووی مرۆڤایەتی‌یەوە بۆتە کۆسپ‌و تەگەرەو گرێ پووچکەی ژیانی تاکیی‌و کۆمەڵایەتی‌و ماددیی‌و مەعنەویی ئینسان بریتی بووە لە نەتوانینی پێوە پابەندبوون‌و جێبەجێ کردنی ئەو یاساو دەستوورانەی کە لە ڕێی شەرع‌و عەقڵەوە لە ڕاستی‌و تەواویان دڵنیاو مسۆگەربووە!!

بێگومان تاقە هۆی ئەو نەتوانینەش بریتی بووە لە زاڵبوونی ئەو هەواو ئارەزوو و داخوازی‌یە بەدە ناشەرعی‌یانە کە لە زبڵدانی نەفسی فەرمان بە خراپەکەر (الأمارة) و خوتخوتەو دنەدانی شەیتانی لەعینەوە پەیدابوو ون، جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) خاوەنی دڵ‌و دەروونێکی پاك‌و عەقڵ‌و هۆشێکی زۆر چاك بوون، بە یارمەتی خوا توانیوویانە کە لە سەداسەد مەبەستی نێو دڵ‌و قسەی سەر زمان‌و کردەوەی ئەندامەکانیان یەك بن، لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانی تاکی‌و کۆمەڵایەتییاندا، لە سۆنگەی ئەمەشەوە توانیویانە ببنە چاکترین‌و ڕاستترین پێشڕەوو سەرمەشقی مرۆڤایەتی.

---

[1] (الأحـزاب - 21).

**شەشەم : ئاگاداركردنەوەی خەڵكی لە حەقیقەتی ژیانی دونیای تەمەن كورتی فریودەر.**

خوای میهرەبان لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾(تر)، واتە: وە ئەم ژیانە دنیاییی‌یە جگە لە خۆخافلاندن‌و یاری چیدی نیە، وە بێگومان بەس (ژیانی) مەنزڵی دوارۆژ ژیانی راستەقینەیە، ئەگەر بزانن! بەڵێ بێگومان فەراموشكردنی مردن‌و لە بیرچوونەوەی ئامانج‌و مەبەستی ژیانی دنیا ـ كە تاقیكردنەوەیە ـ و زیاد لە پێویست سەرگەرم بوون‌و فریو خواردن بە جوانیی‌و زەرق‌و بەرقی ڕواڵەت‌و كەم‌وكورت‌و كەم ماوەی ژیانی دنیا، كۆمەڵە نەخۆشیی‌و دەردێكی یەكجار بێڕەزاو كوشندەن‌و، مرۆڤایەتی زۆر حەوجێی بەو زاتە بەرزانەیە كە نێوە نێوە نقورچێكی وریاكردنەوەی لێ بدەن‌و نەیەڵن پێنج‌و دوو ڕۆژی ژیانی دنیا بیكاتە دیلی خۆی‌و نەبێتە كۆیلەی نەفس‌و ئارەزووەكانی، كە سەرجەمی دەردو نەخۆشیی‌یە تاكیی‌و كۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی‌و ئابووریی‌یەكانیش هەر لێرەوە سەر هەڵدەدەن‌و پەیدا دەبن.

**حەوتەم : سەرنج ڕاكێشانی مرۆڤ بۆ سەرەتاو سەرەنجامی كارەساتەكانی دوای مردن.**

خوای خاوەن لوتف‌و بەزەیی‌و لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا شَهِدْنَا عَلَى أَنْفُسِنَا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَشَهِدُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ...﴾(یر)، واتە: ئەی كۆمەڵی جندو مرۆڤ! ئەدی چەند

---

(تر) ( العنكبوت – 64 ).

(یر) ( الأنعام – 130 ).

پێغەمبەرێك لە خۆتان نەهاتنە لاتان، کە ئایەتەکانی منیان بە سەردا دەخوێندنەوە، لە دیداری ئەم ڕۆژەتان دەیانترساندن؟! گوتیان: شایەدی لەسەر خۆمان دەدەین، وە ژیانی دنیا فریوی داین، وە شایەدیی‌یان لە سەر خۆیاندا کە بێبڕوا بوون (بۆیە بەو دەردە چوون).

بەڵێ خوێنەری بەرێز!

یەکی دیکە لە ئامانج‌و مەبەستە هەرە گرنگەکانی نێررانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بریتی بووە لەوەی کە سەرەتا (مبدأ)و سەرەنجام (مصیر) بخەنە بەرچاوی خەڵکی‌و، تەنیا ئەم قۆناغە کورتەی ژیانی دنیا نەبینن‌و بەین بەین چاوێك بە ڕابردوویاندا بگێڕنەوەو جارو بار سەر بەرزبکەنەوەو ئەوپەڕو کۆتایی‌و سەرنجامی ژیانی دنیاو قۆناغەکانی دوایشی ببینن‌و، هەروەك چۆن خەمی ئەم چەند ڕۆژەی دنیایان دەخۆن‌و ڕەنجی بۆ دەدەن، ژیانی دوارۆژیش لەبیر نەکەن‌و لە گەرمەی جم‌و جۆڵ‌و چالاکییەکانی ئەم ژیانەیاندا، ژیانی ئەو لاش لەبەر چاو بگرن‌و بیرێکی دوای مردن‌و گۆڕەپانی قیامەت‌و ڕاوەستانی بەردەمی دادگای خواو پەڕینەوەی پردی سەرپشتی دۆزەخیش بکەن!

## (10) خەسڵەتە پێویستەکانی پێغەمبەران چیی و چین؟

خوێنەری بەڕێز!

خوای کاربەجێ کە خاوەنی ئەو پەڕی زانیاریو بەزەیییو کارزانیو دادگەری یە، قەت ئەوەی لێ چاوەڕوان ناکرێ کە کارێك بە یەکێك بسپێری، توانای جێبەجێکردنی نەبێت، چونکە ئەو بۆ خۆی بە بەندەکانی فێرکردوە کە لێی بپاڕێنەوەو بڵێین: ﴿... رَبَّنَا وَلا تُحَمِّلْنَا مَا لا طَاقَةَ لَنَا بِهِ...﴾ واتە: ... پەروەردگارمان وە شتێکمان لێ داوا مەکە کە توانامان پێی نەشکێ ... وە بۆ خۆشی فەرمووویەتی: ﴿لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا...﴾ واتە: خوا داوای ـ هیچ شتێکی ـ لە توانا بەدەر لە کەس ناکات ... جا بێگومان پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) وەك لە خاڵەکانی ڕابردوودا خستمانەڕوو کارێکی یەکجار قورسو ئەرکێکی زۆر گرنگو مەترسیداریان پێ سپێرراوە، کە دەتوانین بۆ زێدە ڕوونبوونەوە لە چەند خاڵێکدا بیانخەینە ڕوو:

1 ـ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) چەند بەندە یەکی دانستەو شایستەن کە خوا هەڵی بژاردوونو وەحی بۆ ناردوون.
2 ـ یاساو دەستوورەکانی شەرعو بەرنامەی خوا بە خەڵکی ڕادەگەیەنن.
3 ـ بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ لای خوا.
4 ـ بە فەرمانی خوا گوێڕایەڵیو فەرمانبەرییان لە سەر ئوممەتەکانیان فەرزە.

5 ـ خوا گێڕاونی بە پێشەواو سەرمەشقی خەڵكی لە هەموو بوارو لایەنەكانی ژیاندا.

6 ـ ڕابەرو مشوورگێری مرۆڤایەتین و پێویستە لە هەموو ڕووێكەوە بەسەر خەڵكی ڕابگەن و گیروگرفتە فیكـــری و كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریيەكانیان بەپێی تواناو بەگوێرەی بەرنامەی خوا چارەسەر بكەن.

7 ـ هەواڵی مەسەلە پەنهانەكانی وەك سەرەتا (مبدأ) و سەرەنجام (مصير) و، ژیانی نێو گۆڕو بەرزەخ و، ڕۆژی دوایی و كارەساتە گرنگ و سامناكەكانی و چۆنیەتی كۆكردنەوەو لێپرسنەوە (الحشر والحساب) و بەهەشت و دۆزەخ ـ بە ناوی خواوە ـ بە خەڵكی ڕابگەیەنن.

ئنجا شتێكی ئاشكراشە كە هەركام لەم ئەركانە شتێكی یەكجار گرنگ و قورسەو هەركەسێك وەئەستۆی بگرێ حەوجێی بە چەند خەسڵەتێكی تایبەتی و گرنگ دەكات، چ جای هەمووشیان!!

هەر بۆیەش خوای میهرەبان و كاربەجێ (سبحانەو تعالى) بەلوتف و بەخششی خۆی پێغەمبەرانی پایەبەرزی (عليهم الصلاة والسلام) بە چەند سیفەتێكی گرنگ و مەزن ڕازاندۆتەوەو بەهرەمەندكردوە، كە ئەو خەسڵەت و ئیمتیازە بەرزو پەسندانە بوونەتە هۆی ئامادەیی و لێوەشاوەیی ئەو زاتە پایەبەرزانە بۆ ئەنجامدانی ئەركی سەرشانیان.

جا هەرچەندە زاناو توێژەرەوان، بە تایبەتی زانایانی پسپۆری بواری عەقیدە لە چۆنیەتی ڕیزكردن و ژماردنی ئەو خەسڵەتانەدا هەندێك جیاوازییان لە نێواندا هەیە، بۆ وێنە زۆربەیان لە سەر ئەو ڕایەن كە (فطانة وَأمانة وَصدق وَتبليغ) ئەو خەسڵەتە بەرزە تایبەتی و پێویستانە

پێکدێنن، بەڵام ئەوەی لەقسەی تێکڕای زانایان وەردەگیرێو لە ئەنجامی تێوەڕامان (إستقراء)ی حاڵو واقیعی پێغەمبەرا نەوە دە ستگیر دە بێ، ئەوەیە کە هەموو ئەو مەرجو خە سڵەتانەی کە لەم چەند خا ڵەدا دەیانخەینە ڕوو، لە هەموو پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلم) هەبوو ون و، پێویستیش بووە هەبن:

یەکەم: (ئینسان بوون)، هۆو حیکمەتی ئینسان بوونی ئەو زاتانەش پێشتر خرایە ڕوو.

دووەم: (پیاوبوون ـ الرجولة)، ئەمیش لەبەر ئەوەی کە سرو شتو پێکهاتنی جەستەییو دەروونیو عەقڵیی ئافرەت لەگەڵ ئەرکو پایەی پێغەمبەرایەتیدا ناگونجێ.

سێیەم: نیشتەجێ بووێتی، ئەم خە سڵەتو مەرجەش لە زۆر ئا یەتی قورئانو لە حاڵو واقیعی پێغەمبەرانیشدا دەبینرێو حیکمەتەکەیشمان باسکرد.

چوارەم: خەسڵەتی (الفطانة)، کە بە مەعنای عەقڵو تێگەیشتنو[ئر]، و وریایی دێو، پێچەوانەی گێلیو کەودەنیو فەقیر حاڵییەو پێویست بوونیشی ڕوونو ئاشکرایە.

پێنجەم: خەسڵەتی (الأمانة)، کە بە مەعنای دڵو دەستو زمان پاکیی دێو، پێچەوانەی (خیانة) ناپاکییە، چونکە وشەی (أمانة)[یر]، لە ئەسڵدا لە (أمن)ەوە هاتوە کە بە مانای دڵنیاییو بێ باکیی دێ،

---

(ئر) بڕوانە: (لسان العرب)ی ابن منظور، ب (13)، ل (323).
(یر) سەرچاوەی پێشوو، ل (21، 23).

کەواتە: ئینسانی (أمین) ئەو کەسەیە کە خەڵکی لە شەڕو خرا پەی دڵو زمانو ئەندامەکانی دڵنیاو بێترسو بیم بن‌و، (خائن) یش بە پێچەوانەوە، ڕستەی: (إني لكم رسولٌ أمين)یش ویردی سەر ز مانی پێغەمبەران بووە(تر).

شەشەم: خەسڵەتی (الصدق) واتە: ڕاستی، بەڵام نەك تەنیا ڕاستیی زمان، وەك زۆر کەس وا حاڵــی بوو ون‌و هەڵە لە بەرانبەر وشەی ( صدق)دا (ڕا ستگۆیی) دادە نێن، بەڵکو ( صدق) ڕا ستیی دڵو ز مان‌و ئەندامەکان، یان ڕاستیی دەرو دەروون (ظاهر و باطن) دەگە یەنێ‌و پێویستبوونیشی بۆ پێغەمبەران بەڵگەنەویستە.

حەوتەم: سیفەتی (التبليغ)، واتە: ڕاگەیاندنی بەرنامەی خوا، بە ز مانی گوتارو کردار (المقال والحال) وە نەشاردنەوەو پشت گوێ نەخ ستنی گچکەترین شتیش، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلاَّ الْبَلاغُ الْمُبِينُ﴾(یر).

هەشتەم: سیفەتی (العصمة)، واتە: پارێزران لە خراپەو تاوانی گ چکەو گەورە. وشەی (عصمة)یش لە ئەسڵــی زماندا بە مەعنای پێشگیریی لــێکردن (منع) دێت، پێشگیــری کردنێك کە ببێتە هۆی پارا ستن (حفظ)، بەڵام لە زاراوی شەرعدا بریتیە لەوەی کە خوای میهر بان، یەکێك لە بەندەکانی خۆی لە هەڵەو تاوانی گەورەو گچکە ب پارێزێ، دەربارەی (عصمة)ی پێغەمبەرانیش (عليهم الصلاة والسلام) تێکڕای

---

(تر) بڕوانە: سوڕەتی (الشعراء) ئایەتەکانی (107و125و143و162و178) کە هەر کام لە: (نوح وهودو صالح و لوط و شعيب) (عليهم الصلاة والسلم) ئەو قسەیەیان کردوە.

(یر) ( النحـل 35 ).

زانایان لەوەدا یەکدەنگن کە ئەو زاتە بەرزانە بەر لە پێغەمبەرایەتیو دوای پێغەمبەرایەتیش لە گوناهی گەورە پارێزراون، بەڵام سەبارەت بە پارێزرانیان لە وردە گوناهان پێش پێغەمبەرایەتیو لە دوا ییش لەنێو زانایاندا مشتومڕ هەیەو ڕایان جیاجیایە.

(قرطبـي) لەوبارەوە لە تەفسیری (الجامع لأحكام القرآن)دا دە ڵێ: وە زانایان دوای ئەوەی تێ کرا لە سەر ئەوە ر ێك کەوتوون کە پێغەم بەران (ع ليهم ال صلاة وال سلام)، لە گونا هە ز لەکان (الكبائر)و لە هەر خەسڵەتێکی نزم کە ناشرینیو ناتەواویی تێدابێ پارێزراون، بەڵام لەوەدا کە ئایا گوناهی گچکەیان هەبوە یان نا؟ مشت ومڕیان لە نێواندا هەیە، جەماوەری شەرع زا نان (جم هور الفقهاء) گوتوویانە: کە وەك چۆن لە گوناهە زلەکان پارێزراون بە هەمان شێوەش لە تێکڕای گوناحە گچکەکانیش پارێزراون، چونکە ئێمە فەرمانمان پێکراوە کە شوێنیان بکەوین لە کردەوەو پەرێزو ئاکاریاندا، ئەو فەرمان پێکرانەش بە موتڵەقیەو بە هیچ نیـ شانە (قرينة)یەکەوە نەبەستراوەتەوە، جا ئەگەر بێتو بڵێین دەگونجێ گوناهی گچکەیان کردبن، ئەوە ناتوانین بیانکەینە سەرمەشقو پێشڕەو، چونکە مەرج نیە هەموو کردەوەیەك لە کردەوەکانیان بۆ ئێ مە جیابێ تەوە داخوا کاتی خۆی بە مەبەستی لە خوا نزیکبوونەوە کراوەو ئێ ستاش حەڵاڵە؟ یان کاتی خۆی خراپەو گوناح بووەو ئێستا قەدەغەیە؟

دیارە لە حاڵێکی واشدا ناگو نجێ فەرمان بە ئیـن سان بـ کرێ، شوێنیان بکەوێ و بیانکاتە سەرمەشق چونکە دەگونجێ هەندێك لە کردەوەکانیان تاوانو خراپە بێ!! (أبو إسحاق الأسفراييني) یش لە زانایانی (أهل السنة) گوتوویەتی: پێغەم بەران (ع ليهم ال صلاة

والسلام) هیچ جۆرە گوناهێکیان لـێ ڕوونادات، چونکە لە گونا هە وردو درشتەکان پارێزراون، ئەمەش دا خوازیی بەڵ گەی موعجیزە بەدەستەوە بوونە، هەندێکیش گوتوویانە: دەگو نجێ وردە گوناه یان هەبووبن، بەڵام ئەم قسەیە هیچ بنچینەیەکی نیە، وە ئەوەی کە زۆربە لەسەرنی ئەوەیە کە دروست نیە گوناهی گچکەشیان هەبێ.

هەندێك لە زانایانی دوایی (المتأخرین) گوتوویانە: ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە خوای بەرز هەواڵی داوە کە هە ندێکیان گوناه یان کردوون، وە گوناهەکانی پاڵداوەتە لایانو لەسەر ئەوە سەرکۆنە شی کردوون، ئەوانیش ئەو گوناهانەیان بەهی خۆیان داناون و، نارەزایی یان دەربارە دەبڕیونو، لێیان ترساونو لێیان ژیوان بوو نەوە، هەموو ئەم بابەتانە لە زۆر جێیاندا هاتوونو هەموو شیان پێ نە ناکرێن، ئەگەر هەندێکیشیان تەئویل هەڵبگرن، بەڵام هەموو ئەوا نەش لە پلەو پایەی وان داناشکێنێ، چونکە ئەو هە ڵەو پەلا نە لەڕووی غەڵەتو لە بیر چوونەوەوە بوون ونو، ئەگەر بۆ وان بە خراپە (سیئة) لە قەڵەم درابن لەبەر پلەوپایەو مەقامی بەرزی وان بووە، (جنَیْدْ)یش چاکی کردوە کە گوتوویەتی: (حَسنات الأبرار سیئات المقرّبین)چونکە ئەوەی کە کرێکار (أجیـر) لەسەری خەڵات دەکرێ، وەزیر لەسەری سزا دەدرێ، (قرطبـي) دەڵێ: بێگومان هەر ئەمەش ڕاستە، چونکە ئەو زاتانە (صلوات الله وسلامه علیهم) هەرچەندە چەند دەقێك شایەدیی یان داوە کە هەندێك هەڵەیان کردوون، بەڵام ئەوە لە شانی وا نی نەهێناوەتە خوارو لە پلەوپایەیانی دانە شکاندوە، بەڵکو خوا لە سۆنگەی ئەوەوە دەفریایان هاتوەو هەڵی بژاردوون و، ڕێڕوونی کردوونو

پاکی کردوونەوەو، پەسند کردوون‌و بەرزی کردوونەوە، (صلوات الله و سلامه علیهم)﴾[تر].

وە هەر لەم بارەوە پێویستە چەند شتێکی دیکەش بخەینەڕوو:

**یەك:** بێجگە لە پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) هیچ کەس پارێزراو (معصوم) نیەو، ڕێی تێ دەچێ‌و دەگونجێ تووشی هەڵەو تاوان ببێ، با لەواقیع‌و (نفس الأمر) دا تووشیش نەبێت، وە ئەوەش کە مو سڵمانانی (شیعة) دەیڵێن کە گوایە هەرکام لەو دوازدە[یر]، پێشەوایەکانیان هەر لە (علي بن أبي طالب)ەوە (رضي الله عنه) هەتا (محمد بن حسن العسکري)[3] کە بە (المهدي المنتظر)ی ناودەبەن، لە هەموو هەڵەو ناتەواویی‌یەکان پارێزراون، هیچ بەڵگەیەکی عەقڵیی‌و شەرعی ڕاستەقینەی لەسەر نیە، ئیمام (مالك)یش لەو بارەوە فەرمووبەتی: (ما مِنّا الاّ رُدَّ علیه إلاَ صاحب هذا القبر) واتە: پێغەمبەر (علیهم الصلاة والسلام).

**دوو:** تەنها لە ئیسلامدا ڕێزو حورمەتی تەواو بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دانراوە، ئەگەرنا لە (تەورات‌و ئینجیل)ی ئێستای دەستی جوولەکەو دیانەکاندا کە دەستکاریی کراون‌و گۆڕراون شتی زۆر

(تر) بڕوانە (الجامع الأحكام القرآن) ب (1)، ل (308، 309) بە تۆزێك کورت کردنەوە (اختصار) ەوە.

(یر) بێگومان هەرکام لەم دوازدە زاتە پێشەوایە لەلای (أهل السنة) ش جێی ڕێزو حورمەتن، ئەوەندە هەیەی ئێمە جگە لە پێغەمبەران هیچ کەس بە (معصوم) نازانین، تەنانەت چوار جێ نشینەکانیش کەبە (الخلفاء الراشدون) ناسراون، چونکە بەڵگەیەك لەوەبارەوە شك نابەین.

(3) مێژوونووسان زۆربەیان ڕایان وایە کە (الحسن العسکري) بێ‌پاشەوار (عقیم) بووەو، کوڕێکی بە ناوی (محمد)ەوە نەبووە!

بێجێو ناقۆڵا کە تەنانەت لە مسوڵمانی سادەو ئا ساییش ناوە شێتەوە پاڵداوەتە لای ئەو زاتە بەرزانە، بۆ وێ نە: مەیخوارد نەوەو زیـ ناکردن لەگەڵ کچی خۆدا پاڵدراوەتە لای (لوط) (علیه الصلاة وال سلام)!![تر]، وە گوتراوە کە گوایە (داود) (علـ یه ال صلاة وال سلام) لە گەڵ ژ نی (ئۆریا)دا زینای کردوەو[یر] ئاوسیش بووە، لە حاڵێ کدا کە گوا یا (ئۆریا) سەرکردەی سوپای (داود) بووە! وە گوتراوە کە گوایە (سلیمان) لە دوادوای تەمەنیدا هەڵگەڕاوەتەوەو دەستی کردەوە بەبت پەرستی![سم].

ئەمە سەبارەت بە جوولەکە، دیانەکانیش گومانیان وایە کە جگە لە (مەسیح) (علیه السلام) کە تا قە پارێزراو (مع صوم)ە، تێ کڕای ئینسانەکان، پێغەمبەرو غەیری پێغەمبەر گوناهـو تاوانەکان دە کەن، تەنیا (عیسی)ش دەبێتە تکاکارو رزگار کەری ئەو تاوانبارا نە، وەك ئینجیل دەڵێ!![شم].

نۆیـــــەم: دووربی لە هەر عەیبێکی خەڵك ڕەوێ نەرەوە (ال سلامة مِنَ العیوب المُنَفِّرة)، جا ئەو عەیبو ناتەواویی یە جەستەیی (خَلْقي) بێ، یان دەروونی (خُلُقي)، وەك سیلداریی و گەڕیی و بە لەکی و، ڕژد یی و ترسنۆکی و بێورەیی و.... هتد.

کەواتە ئەوەی کە دەربارەی (أیوب) (علیه ال سلام) لە هە ندێك کتێباندا گێڕراوەتەوە کە گوایە کر مێو بۆ گەنیو بووەو تەنا نەت

---

(تر) بڕوانە: (التورات) سفر التکوین، ل128.

(یر) سەچاوەی پێشوو (الباب الحادي عشر) مِنْ سفر صموئیل.

() سەرچاوەی پێشوو (الباب الحادي عشر) مِنْ سفر الملوك.

(شم) بڕوانە: (النبوة والأنبیاء)ی محمد علی صابونی، ل (67).

لەبەرچاوی هاوسەرە ئارامگرەکەشی بێزراوە!! هیچ گومانی تێدا نییە کە درۆو دەلەسەی رووتەو، یەکی دیکەیە لەو شتە پڕووپووچانەی کە بە (اسرائیلیات) ناسراون‌و سەرەتا دوژمنانی دین وتوویانەو دوا پیش لە لایەن هەندێك کەسی دڵساف‌و سادەو لا ساکەرەوە تێ کەڵ بە کتێبەکانی مێژووو تەفسیر کراون، بەڵگەشمان ئەوەیە کە:

لا- خوا پێغەمبەرانی پایەبەرزی بۆیە ناردوون تاکو خەڵکی بەرەو خوا بانگەواز بکەن‌و بەرنامەی خوایان لەلا شیرین بکەن، کەوا تە: هیچ ماقووڵ نیە ئەو ئەرکە بەرزو پیرۆزە بە کەسێك بسپێررێ کە نەك هەر نەبێتە هۆی سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی، بەڵکو ببێتە هۆی ڕەواندنەوەو سڵەمینەوەیان!

لا- ئەو نەخۆشی‌یەی کە (أیوب) تووشی بوو، قورئان ئاوای با سکردوە: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾[1]، واتە: وە ئەییوب لەکاتێکدا بانگی پەروەردگاری کرد، کە من ئازارو ناخۆشیم تووش بووە، وە تۆش میهرەباز ترینی میهرەبا نانی، وەك دەبینین هیچ باسی گول بوون‌و کرمێ بوون‌و ... شتی وای تێدانیە.

ئێستاش بە پێویستی دەزانم بەر لەوەی ئەم باسە گرنگە بەجێ ب هێڵین، جارێکی دیکە سەرنجی ئەو خە سڵەتە بەرزە تای بەتی‌و پێوی ستانە بدەینەوەو بزانین لەبەرچی هەبوونیان لە پێغەمبەراندا (ع لیهم ال صلاة والسلام) شتێکی گرنگ‌و پێویستە!

جارێ دەر بارەی خە سڵەتی یە کەم‌و دووەم‌و سێیەم (ئینـ سانێتی‌و پیاوێتی‌و نیشتەجێیی)، ئەوە لە ڕابردوودا شتێکمان خ ستەڕوو، بەڵام

---

(1) (الأنبياء 83).

سەبارەت بە خەسڵەتی زیرەکیی (الفطانة) دەڵێین: هیچ ماقووڵ نییە بابایەك ئەركی پێغەمبەرایەتی پێ بسپێرێ (ئەو ئەر کەی کە لە سەرەتای ئەم باسەوە لە (لا) خاڵاندا خستمانەڕوو) کە خاوەنی ئەو پەڕی عەقڵو بیـرتیژیو زەینو ڕوونیو وریاییو لێزانی نەبێ، چونکە ئەرکی ناوبراو وا داخواز دەکات کە بابای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە هەموو بوارەکانی فیکریو ئەخلاقیو کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابوور یدا واقیعی خەڵكو کۆمەڵگا بگۆڕێو، سەر لە نوێ لە سەر بن چینەی بەرنامەو پەیڕەوی خوا هەوڵی چاککردنو دامەزراندنەوەی بداتو، دیارە لە حاڵێکی واشدا ئەو پێغەمبەرە لەگەڵ دەیان جۆرە کۆ سپو تە گەرەو گیروگرفتی ئایدیۆلۆژیو کۆمەڵایەتیو سیاسـیدا روو بەڕوو دەبێ تەوە، ئەگەر بێتو عەقڵو هۆشێکی یەکجار تیژو تەواوی نەبێت، ناتوا نێ ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، دیسان هەرکام لە دەستپاکییو ڕا ستییو گەیاندن (أمانەو صدقو تبلیغ)یش بە هەمان شێوە، چونکە بابا یەك خەڵك تێیـرا نەبینن بیکەنە ئەمینداری خۆیانو متمانە بە قسەو وتارو کرداری نەکەنو، توانای ڕاگەیاندنی بێ پێچو پەنای بەرنامەو بانگەوازی خوای نەبێت، ناتوانێ ئەو ئامانجو مەبەستەی کە بۆی ن ێرراوەو ئەو ئەرکەی کە پێی سپێرراوە بیهێنێتە دیو، لە حاڵێکی واشدا حیک مەتی ڕەوانەکرانی ئەو زاتە دەفەوتێو، بێگومان خوای زاناو کارەبەجێش، کاری بێحیکمەتو بێسوودی لـێ ناوەشێتەوە.

سەبارەت بە خەسڵەتی هەشتەمیش (عصمة) پێم وایە ئەوەندە قسانەی کە لە (قرطبـي)یەوە نەقڵمان کردن، ئەو مەسەلەی ڕوون کردەوەو بە

پێویستی نازانم چیدی قسەی لێبکەین، دەربارەی خەسڵەتی نۆیەمیش وەك پێشتر گوتمان، پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئامانجی هەرە سەرەکیی و بنەڕەتیی یان بانگ کردن و سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی یەو، دیارە هەموو ئەو عەیب و ناتەواوی یە جەستەیی و دەروونی یانەش کە دەبنە هۆی سڵەمینەوەو دوورکەوتنەوەی خەڵك، پێچەوانەی ئەو ئامانج و مەبەستە گرنگ و سەرەکی یەن کە ئەو زاتە بەرزانەی بۆ ڕەوا نەکراون، بۆیە ناگونجێ بە هیچ کامیانەوە گیرۆدەبن.

## (11) تایبەتمەندیی یەكانی بانگەوازی پێغەمبەران كامانەن؟!

خوێنەری خۆشەویست!

بۆ ئەوەی چاكتر جۆرو چۆنیەتی كەسایەتیی پێغەمبەرانمان (علیهم الصلاة و السلام) بۆ ڕوون بێتەوە، پێویستە هەوڵ بدەین زیاتر لە جۆرو چۆنیەتی بانگەوازەكەیان وردبینەوە، جا خوا پشتیوان بێ هەوڵ دەدەین كە لە چەند بڕگەیەكدا تیشكێك باوێینە سەر گرنگترین و سەرەكیترین ئیمتیازو تایبەتمەندییەكانی بانگەوازو خەتو ڕێبازی ئەو زاتە بەرزو پەسندو پێشەواو سەركردە دڵگیرو ڕەندانە (صلوات الله علیهم أجمعین).

یەكەم: یەكەمین و بنەڕەتیترین ئیمتیازو تایبەتمەندیی بانگەوازو ڕێبازی پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا ئەوەیە كە: بانگەوازو ڕێبازێكی خوایی یە، واتە: لە خوای پەروەردگارەوە سەرچاوەی گرتوە، نەك لە خۆیان، یان سەرچاوەیەكی دیكەوە، وەخواش بەو كارە ڕای سپاردوون و لە سەری پێویست كردوون نەك بۆ خۆیان حەزیان لێكردبێ و هەڵیان بژاردبێ!

دەقی قورئانیش لەوبارەوە زۆرن بۆ نموونە:

* ﴿قُلْ لَوْ شَاءَ اللهُ مَا تَلَوْتُهُ عَلَيْكُمْ وَلا أَدْرَاكُمْ بِهِ، فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُراً مِنْ قَبْلِهِ أَفَلا تَعْقِلُونَ؟!﴾[1]، واتە: بڵێ ئەگەر خوا ویستبای بە سەرمدا نەدەخوێندنەوەو لە بارەشیەوە شارەزام نەدەكردن، چونكە پێش (هاتنی) وی تەمەنێك (ی چل ساڵە)م لە نێودا گوزەراندوون، ئایا نافامن؟! (كە ئەگەر قورئان هی خۆم بوایە پێشتر بە سەرمدا دەخوێندنەوەو پێم ڕادەگەیاندن!).

---

[1] (تر) (یونس - 16).

* ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِنْ أَمْرِنَا، مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلا الْإِيمَانُ...﴾[]، واتە: وە ئاوا بە فەرمانی خۆمان ڕووحیێکمان بۆ لا ناردی، کە تۆ نەتدەزانی نە کتێب چیەو نە بڕوا...

* ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاّ مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾[]، واتە: بڵێ من بۆم نیە کە لە لایەن خۆمەوە بیگۆڕمەوە ـ بە کتێبو بەرنامەیەکی دیکە ـ من بەس شوێن ئەو ـ پەیام ـ ە دەکەوم کە پێم ڕادەگەیەنرێ، من ئەگەر سەرپێچی لە پەروەردگارم بکەم لە ئازاری ڕۆژێکی مەزن دەترسم!

بەڵێ بانگەوازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) زادەو هەڵقوڵاوی بیرو هۆشی خۆیان نیەو، لە ئەنجامی ئەزمونو تەجرەبەی زاتیی خۆیانەوەو هەست کردنیان بە بارودۆخی ناهەموارو گیروگرفتو دەردە فیکریو سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریەکانی ئەو ژینگە (بیئة)یەوە کە تێیدا ژیاون پەیدا نەبووە، بەڵکو لە لوتفو بەزەییو زانیاری بێسنووری خواوە سەرچاوەی گرتوەو، لەلایەن ویەوە وەك ئەرکێك پێیان سپێرراوە[].

هەڵبەتە لێرەش، وەڵامی پرسیارێکی گرنگو مەتەڵێکی پێچراوەمان دەسگیر دەبێ: ئەویش ئەوەیە: کە بۆچی پێغەمبەران ـ و شوێنکەوتوانی ڕەسەنیشان ـ بە پێچەوانەی فەیلەسووفو سەرکردەو بلیمەتانی جۆراو جۆرەوە، هیچ کاتێك ئامادە نەبوون کە لە بەرانبەر هیچ تەماعو ترس

---

( ) ( الشوری – 52 ).
( ) ( یونس 15 ).
( ) بڕوانە کتێبی پێشوو، ل (34،35). وە بڕوانە (النبوة والأنبیاء) نوسینی: ابو الحسن الندوي، ل (35،36).

وەبەرنان (تطميع و تخويف)ێكدا هێندەی سەری دەرزی‌یەك لە بەرنامەو بانگەوازەكەیان كەم بكەنەوە؟![تر].

دووەم: یەكی دیكە لە جیاوازی‌یە بنەڕەتی‌یەكانی بانگەوازی پێغەمـبەران (عليهم الصلاة والسلام) لەگەڵ بانگەوازەكانی دیكەدا، ئەوەیە كە هیچ كاتێك ئەو زاتە بەرزو بەرێزانە چاوەڕوانیی هیچ جۆرە ئافەرین‌و كرێ‌و پاداشت‌و مزەیەك[یر] لە هیچ كەس نەبوو ون بێجگە لە خوا ـ جل جلاله ـ، وەك خودا لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾[] ، واتە: بڵێ هیچ جۆرە كرێ‌و پاداشتێكتان لـێ داوا ناكەم، وە من لە خوازەلۆكان[شم] نیم.

ئنجا هەر لێرەشدا بۆمان دەدەكەوێ كە بۆچی پێغەمـبەران (عليهم الصلاة والسلام)و شوێنكەوتووانی ڕەسەنیشیان ـ توانیویانە هێندە بەبێ منەتی‌و ڕاشكاویی‌و لە خۆڕادیتوویی‌یەوە بانگەوازی خۆیان بكەن و، بتوانن دەست لە چاوی شێریش بنێن، بەڵێ هەرچی پاكە بێ باكە!

سێیەم: یەكی‌دی لە نیشانەو درووشمە تایبەتی یەكانی خەت‌و ڕێبازی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئەوەیە كە یەكەمین هەنگاوی دەست پێ‌كردنیان‌و بەردی بناغەی كاركردنیان، بریتی بووە لە چەسپاندنی بیری خوا بەیەك گرتن (التوحيد)، وەك خوای مەزن‌و تاك‌و

(تر) بڕوانە (تهذيب سيرة ابن هشام) عبدالسلام هارون، ل (64،65). وە بڕوانە (الحرب النفسية ضد الأسلام في عهد الرسول في مكة) د.عبدالوهاب كحيل، ل (181، 183).

(یر) مـزە: كـرێ (أجـر).

() ( ص  86 ).

(شم) خوازەلۆك: بە ئیذسانێك دەڵێن كە زۆر داوای شتی لە خەڵكی دكاو ببێتە مایەی سەرگرانی وان وخۆ سووككردنی خۆشی.

پاك لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاّ أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾(تر)، (ئەم ئایەتە پێشتــر واتاکەی دراوە).
زانای ناودار (أحمد الدهلوي) لەوبارەوە گوتوویەتی: ((بێگومان پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) سەرەتای بانگەوازەکەیانو گەورەترین ئامانجیان لە هەموو رۆژگارێکداو لە هەموو ژینگە (بیئة)یەکدا بریتی بووە لە ڕاستکردنەوەی بیروباوەر (تصحیح العقیدة) لەبارەی خوای بەرزەوە، وە ڕاستکردنەوەی پەیوەندی نێوان بەندەو پەروەردگاری، بۆ ساغکردنەوەی گەردن کەچی (إخلاص الدین)و یەکلاکردنەوەی خوا پەرستی بەتەنێ بۆ خوا، وە ڕاگەیاندنی ئەوەی کە بەس ئەو سوودو زیان گەیێــنو، شایستەی پەرستنو پاڕانەوەو پەنا پێبردنو قوربانی بۆ سەربڕینە، وە هێرشی پێغەمبەرانو زەبری توندیان ئاراستەی ئەو بتپەرستی یە کرابوو کە لە سەردەمی ئەواندا لە ئارادابووە، کە بە شێوەیەکی زەق لە پەرستنی بتو صەنەمو، پیاو چاکاندا ـ لە مردووانو زیندووان ـ خۆی دەنواند...))(یر).
بێگومان حیکمەتو فەلسەفەی ئەم جۆرە سیاسەتو شێوازەی پێغەمبەرانیش ( صلوات الله و سلامه علیهم)، ئەوە بووە کە بێبڕوایی(الألحاد)و هاوبەش پەرستی (الشرك)، بە واتایەکی دیکە: خوانەناسینو بەهەڵە خواناسین، ماكو بنەمای هەموو دەردو نەخۆشی یە فیکریو ئەخلاقیو سیاسیو کۆمەڵایەتی یەکانی ئینسانو، بە پێچەوانەوەش بە ڕاستی ناسینی خوا، کە لەپێش هەموو شتێکدا لە بە

(تر) ( الأنبیـاء 25 ).
(یر) بڕوانە(حجة الله البالغة)، و بڕوانە(النبوة والأنبیاء)ی محمد علي صابوني، ل(37، 38)

تاكگرتن (توحید)یدا دەدرەوشێتەوە، سەرچاوەی بە پیێزی هەموو جۆرە چاكیی‌و پاكیی‌و خێرو خۆشیی‌یەكی ماددیی‌و مەعنەویی یە لە ژیانی تاك‌و كۆمەڵدا، چونكە خوا (جل جلاله) خاوەنی ئەو پەڕی چاكیی‌و پاكیی‌و جوانیی‌و تەواوی‌یە، بەڵكو ئەم خەسڵەتە بەرزو پەسندانەو هەر خەسڵەتێكی دیكەی ئەوتۆش بە شێوەیەكی زاتیی‌و موتڵەق بەس لە خوادا هەن و، ئینسانیش بە ئەندازەی نزیكیی، لەو، لەو خەسڵەتە بەرزو پەسندانە ـ بە ئەندازەی ئامادەیی‌و لە سنووری سروشتی ئینسانانانەیدا ـ بەهرەمەند دەبێت‌و، بە پێچەوانە شەوە بێبەشبوونی ئینسانو دووریی لە هەر چی سیفەتی چاك‌و پەسندە هەیە پەیوەندییەكی راستەوانە (طردي)ی هەیە لەگەڵ دوورە پەرێزیی، لە خوای بەرزو مەزن، هەر بۆیەش خوا فەرموویەتی: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعاً...﴾[تر]، واتە: كێ دە سەلات و بەرزیی دەوێ، ئەوە هەرچی دەسەلات‌و بەرزیی هەیە هی خودایە ... (واتە: بە هۆی نیزیكی لە خواوە بەرزیی‌و دەسەلاتتان دەستگیر دەبێ). وە دەربارەی ئەوانەی كە خوایان لەبیر دەچێتەوەو لێی دووردەكەونەوە فەرموویەتی: ﴿نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ﴾[یر]. واتە: خوایان فەراموش كردوە، ئەویش ئیهمالی كردوون[]، وە لە شوێنێكی دیكەدا فەرموویەتی: ﴿...نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ...﴾[شم]، واتە: خوایان لەبیر چۆتەوە، ئەویش خۆیانی

(تر) ( فاطر 10 ).

(یر) ( التوبة 67 ).

() بۆیە لێرەدا وشەی (نسیان) بە ئیهمال كردن‌و پشت گوێ خستن تەفسیر كراوە، چونكە (لازم)ی (نسیان)ەو، ناشتوانین مەعنای ئەسڵی (نسیان) بۆ خوا بەكاربێنین.

(شم) ( الحشر 19 ).

لەبیــربردوونەوە، (واتە: لە سۆنگەی لە خوا دووركەوتنەوەوە وایان لــێهاتوە ئاگایان لە خۆیان نەماوەو زیانو قازانجی خۆیان لێك ناكەنەوەو، بە پێچەوانەی قازانجو بەژەوەندی خۆیانەوە هەنگاوە دەنێن بێئەوەی هەست بەخۆیان بكەن).

چوارەم: یەكی دیكە لە ئیمتیازو تایبەتمەندی یەكانی خەتو رێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بریتیە لە رەچاوكردنی سادەییو ساكاریو دووری لە هاڵۆزیو شتی توێكڵدارو بە فۆرتو پێچ، هەڵبەتە ئەم خەسڵەتەش دروشمو نیشانەیەكی یەكجار روونی بانگەوازی گشت پێغەمبەرانە، بەڵێ ئەو زاتە بەرزو بەرێزانە لە گەڵ سروشتو (فطرەت)ی خەڵكیدا رۆیشتوونو لە قەدەر عەقڵیان دواندوویانن، نەك وەك زۆربەی فەیلەسووفو سەركردەكان كە شتی زۆر سادەو روونیش لە خەڵكی هاڵۆز دەكەن و، بۆیان لە بەرگی جۆراو جۆرەوە دەپێچنو لەجیاتی هیدایەتدان سەریان لــێ دەشێوێنن، بۆ نموونە خوای قسە لەجێ فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللهُ الْمُلْكَ، إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ: رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ، قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ، قَالَ إِبْرَاهِيمُ: فَإِنَّ اللهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ...﴾[1]، واتە: تەماشای ئەو كەسەت نەكردوە ـ بە چاوی عەقڵو دڵ ـ كە لە گەڵ ئیبراهیم دا (علیهم الصلاة والسلام) مشتومڕی كرد لەبارەی پەروەردگاری یەوە! لە سۆنگەی ئەوەوە كە خوا دەستەڵاتی دابۆیە، كاتێك ئیبــراهیم فەرمووی: پەروەردگارم ئەوەیە كە دەژیەنیو دەمرێنێ ـ كابراش كە توێژەرەوانی قورئانو مێژوو زانان

---

[1] (ترر) ( البقــرة – 258 ).

دەڵێن ناوی نەمروود بووە ـ گوتی: منیش دەژیەنم و دەمرێنم(تر)، ئیبراهیم فەرمووی: دەجا ـ ئەگەر ڕاست دەکەی تۆش پەروەردگاری ـ خوا هەمیشە رۆژێ لە ڕۆژهەڵاتەوە دێنێ، تۆش ـ تەنانەت جارێك ـ لە ڕۆژئاواوە بیهێنەوە! سەرەنجام ئەوەی بێبڕوا بوو - نەمروود- ماتو سەرسام بوو..

پێنجەم: نیشانەو دروشمێکی دیکەی بانگەوازو ڕێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەیە کە بە پێچەوانەی بیرو باوەڕو بانگەوازەکانی دیکەوە خەڵکی بەرەو بەرنامەیەکی ئاشکراو ئامانجێکی ڕوون بانگ دەکەن، کە هیچ جۆرە تەمومژو تاریکییەکی تێدا نابینرێ، خوای بەرزو بێوێنە لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿**قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي...**﴾(یر)، واتە: بڵێ: ئەمەیە ڕێبازی من: لەبەر رۆشناییدا بەرەو لای خوا بانگەواز دەکەم منو ئەوانیش کە شوێنم کەوتوون.

کەواتە: بانگەوازی خوایی یانەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەم شێوازو چۆنیەتییەکی سادەو سروشتیو بێگرێو قۆرتی هەیەو، هەم ئەو ئامانجو مەبەستانەش کە خەڵکیان بۆلا بانگ دەکات شتی مەنتیقیو ڕوونو ئاشکراو خوارسك (فطري)و بێ پێچو پەنان، بەڵام لێرەدا ڕاستییەك هەیە ناکرێ لێی بێدەنگ بین: ئێمە کە دەڵێین شێوازی چۆنیەتیو ئامانجو مەبەستی بانگەوازی پێغەمبەران ڕوونو ئاشکراو ساکارو سروشتیو بێپێچو پەنان، مانای ئەوە نیە کە ئایینو

---

(تر) دەڵێن (نەمروود) دوای ئەوەی ئەم قسەیەی کرد، بابایەکی حوکم دراو بە مەرگی ئازاد کردو، یەکێکی بێخەتاشی کوشت.

(یر) (یوسف - 108).

بەرنامەی خوا لە قووڵیی و ووردەکاریی بێبەشە، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە ئەو ئایینو بانگەوازە بەرزو پیرۆزو بەپێزە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە لایەن بەدیهێنەرو پەروەردگاری مرۆڤەوە هاتوە، لە نزیکترین ڕێگاوەو بە ئاسانترین شێوە دەچێتە نێو عەقڵو دڵی ئینسانەوە، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە پێویستە بزانرێ کە سروشتی مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێ هەق بناسێو، خستنە ڕووی هەق حەوجێی بە وشەو تەعبیری چڕو هاڵۆزو بلۆز نیە، بەڵام شتی ناڕاستو (با طل) ناچارە بۆ شاردنەوەی ماهیەتی دزێوی خۆی پەنا بەرێتە بەر و شەو تەعبیری ئاڵۆزو سەیر.

شەشەم: تایبەتمەندییەکی دیکەی بانگەوازی پێغەمبەرانی خوا (صلوات الله وَسلامه علیهم) ئەوەیە کە خەڵکی بانگ دەکات بۆ بە کەمگرتنی خۆشیی و لەززەتو نازو نیعمەتەکانی ژیانی دنیاو هەڵیان دەنێ بۆ زیاد لە پێویست سەرگەرم نەبوون بە ژیانی دنیاوەو، قەناعەت کردنو بە شێوەیەکی سادە ژیان بەسەربردن، چونکە ئەم ژیانە دنیاییە، مەیدانی تاقیکردنەوەو کێڵگەی تێدا چاندنە، نەك تاقە هەلو دەرفەتی ڕەخساوی لەززەت وەرگرتنو ڕابواردن، دە قورئانو سوننەتیش لەوبارەوە یەکجار زۆرن کە ئەمانە چەند نموونەیەکیانن:

* ﴿...فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الْآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾(١)، واتە: خۆشیی و ڕابواردنی ژیانی دنیا لەچاو ـ هی ـ دوارۆژ بەس شتێکی کەمە.

---

(١) ( التوبـة - 38 ).

※ ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللهِ حَقٌّ فَلا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا...﴾[تر]، واتە: خەڵکینە! بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، با ژیانی دنیا فریوتان نەدات..
※ ((ما الدنيا في الأخرة إلاّمثل ما يجعل أحدكم اصبعه في اليّمّ فلينظر بم يرجع!))[یر]،واتە: دنیا لەچاو دوارۆژ هەروەك ئەوە وایە كە یەكێكتان پەنجەی دەخاتە دەریاوە، جا با سەرنج بدات داخوا چی پێوە هاتوە!

لە كۆتاییی دا دەڵێم:

بێگومان بەكەمگرتنی ڕابواردنی ژیانی دنیا پێویستە خەسڵەتێكی گرنگ و بنچینەیی هەموو مسوڵمانێك بێت كە خۆی بە شوێنكەوتووی پێغەمبەران دەزانێ و، پابەندی بانگەوازو بەرنامەكەیان دەبێت، بەڵام خەسڵەتی ناوبراو پێویستە لە زاناو پێشەوایانی میراتگری پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) شتێكی بنەڕەتی و بەرچاو بێت و، نابێ وەك خەڵكی سادەو عەوامەكان ڕەفتار بكەن، چونكە:

**یەكەم:** ئەو كەسانەی كە ئەوان خۆیان بە جێگرو میراتگەریان دەزانن ئاوا بوون.

**دووەم:** ئەوان بانگی خەڵك دەكەن بۆ لای خواو بەرنامەكەی و، یەكێك لەوشتانەش كە بەرنامەی خوا فەرمانی پێ دەكات بریتییە لە بەكەم گرتنی رابواردنی ژیانی دنیاو ماقووڵیش نییە بانگی خەڵك بكەن بۆ شتێك كە حاڵ و واقعی خۆیان پێچەوانەیەتی!

---

(تر) ( فاطـر – 5 ).
(یر) رواه مسـلم.

**سێیەم:** جێگرو میراتگری رەسەنی پێغەمبەران پێویستە وەك ئەو زاتە پایەبەرزانەی خۆی بەجێگریان دەزانێ لە ئێش و ژان و سەرماو گەرماو هەورازو نشێوی ژیانی خەڵکیدا بە شداربێت، جا بێگومان ئەگەر هەوڵ نەدات لە ژیانێکی بەقەناعەت و سادەو دنیا بەکەمگرانەدا بژیەت، مەگەر بە هەواڵ و دەنگ و باس ببیستێ، دەنا وەك پێویست لە حاڵ و باڵ و گوزەرانی خەڵکی تەنگدەست و نەدار ئاگادار نابێت.

**حەوتەم:** تایبەتمەندی یەکی دیکەی بانگەوازو رێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەیە کە فراوان و هەمەلایەنەیەو دەرو دەروون (ظاهر و باطن)ی ئینسان و سەرلەبەری بوارو لایەنەکانی ژیانی دەگرێتەوە، بەڵێ بەرنامەو پەیڕەوێك کە پێغەمبەرانی مەزن بانگەوازیان بۆ کردوە، هەم بەرنامەی تێگەیاندن و پێگەیاندنی تاك (فرد) بووە، لە بوارەکانی فیکریی و مەعنەویی و ئەخلاقی داو، هەم بەرنامەی گۆڕین و چاککردن (التغیر والأصلاح)ی کۆمەڵگا (مجتمع) بووە، لە بوارەکانی ئابووری وسیاسی و کۆمەڵایەتیدا.

**هەشتەم:** یەکی دیکە لەو تایبەتمەندیی و درووشمانەی کە خەت و رێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە خەت و رێبازەکانی دیکەی جیادەکاتەوە، ئەوەیە بە درێژایی مێژوو بە زۆری خەڵکی نەدارو بەشخوراوو چەوساوەو رەش و رووت .. لایەنگرو پشتیوانی بووەو ئاڵاو مەشخەڵەکەی هەڵگرتوەو، بە پێچەوانەوەش هەمیشە چینی مشەخۆری ستەمکارو خۆشگوزەران و چەوسێنەر، پەرچ و لەمپەرو دوژمنی بابە کوشتەو سەرسەختی ئەو خەت و بەرنامەیە بووە، هەڵبەتە

هۆی ئەمەش ئا شكرایەو ئەم دیاره یەش شتێكی زۆر سرو شتیو چاوەڕوان كراو بووه، چونكە بانگەوازو ڕێبازی پێغەمبەران دژی ستەمو چەوساندنەوەو بێدادیو خۆ سەپاندنەو وەك پێ شتر گو تمان ئا مانجی هەرەبەرزی بریتیە لە هێنانەدیو چەسپاندنی دادگەری، د یارە ئایینو بەرنامەیەكی ئاواش لە سەرێكەوە خەڵ كە ڕەشو روو تە چەو ساوەو مافخوراوەكە بە پشتوانی خۆیانی دەزانن‌و وێرای ئەمەش هیچ پەردەو دیوارێكیش لەنێوان ئەوان‌و ئەو ئایینەدا نیە وەك ترسان لە تێكچوونی بەرژەوەندی ناشەرعیو خۆبەزلگریی‌و... هتد، كە ڕێگای بڕواهێنانیانی لــێبگرێ، وە لە سەرێكی دیكەشەوە چینە خۆشگوزەران‌و چەوسێنەرو خۆبەزلگرەكە، لە ئایین‌و ڕێبازی ناوبراودا گەورەترین مەترسی هە ست پێكردوە، چونكە زانیویەتی ئەگەر بێت‌و سەربگرێو بچەسپێ، هەژارو چەوساوەكان كۆت‌و زنجیــری دەست‌و پێیان یان دەپ سێنن‌و كۆ شكی ستەمو زۆرو بێدادی وا نیش دەرووخ ێنن، بۆ یە بە هەموو ه ێزو توانایانەوە كەوتوونە دژا یەتیكردنیو جەنگێكی فراوا نی ماددیو مەعنەوی، یان جەستەییو دەروو نی، یان ئابووریو سیا سی یان لەگەڵدا بەرپاكردوە، لەوبارەشەوە دەقی قورئان زۆرن، بۆ نموونە:

* ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِنْ نَذِيرٍ إِلاَّ قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ كَافِرُونَ﴾(ت) ، واتە: هیچ ئاگاداركەرەوە (پێغەمبەر)ێكمان لە هیچ ئاوەدانییەكدا نەناردوە مەگەر خۆشگوزەرانەكانی گوتوویانە، ئێمە بەو ـ ئایین ـ ەی كە پێی ڕەوانەكراون، بێبڕواین.

(ت) (سبأ 34).

* ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ. أَنْ لا تَعْبُدُوا إِلاّ اللهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ۞ فَقَالَ الْمَلأُ الذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلاّ بَشَراً مِثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاّ الذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا﴾[تر]، واته: وه بێگومان نووحمان ناردە لای گەلەکەی ـ پێی گوتن ـ بێگومان من ئاگادارکەرەوەیەکی ئاشکرام بۆ ئێوە، کە جگە لە خوا ـ هیچ شتێك ـ مەپەرستن، من لە ئازاری رۆژێکی بە ئێش لێتان دەترسم، ئەو زلەزلانە کە بێبڕوا بوون لە گەلەکەی گوتیان: ئێمە بەس بە مرۆڤێکی وەك خۆمانت دەزانین، وە ناشبینین کەست دواکەوتبێ جگە لەوانەی کە هەرچیو پەرچییەکانمانن.. ((دیارە چینی خۆ شگوزەرانی چەو سێنەرو خوێنمژو خۆبەزلگر کە لە ڕوانگەی خوارو خێچی چەو سێنەرانەو خوانەناسانەی خۆیانەوە تەماشای شتان دەکەن چینی ڕەشو ڕووتو نەدارو چەوساوە هەرە بە (أراذل)[یر]، لە قەڵەم دەدەن)).



(تر) (هـود - 25، 27).
(یر) (أراذل) کۆی (أرذل)ە ئەمیش (صیغة التفضیل)ی (رذیل)ەکە بە مانای پەستی و زەبوونیی و کەم بایەخیی دێت.

## (12) بۆ چی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خاوەن موعجیزەن ؟!

خوێنەری بەڕێز!

وەك لە خاڵەکانی ڕابردوودا باسکرا، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆیە لەلایەن خواوە هەڵبژێرراون، تاکو ببنە موژدەدەرو ترسێنەرو ڕێ پیشاندەری خەڵکی بەرەو ڕاستە شەقامی خوا، وە بۆیە نێرراون کە گۆڕانو چاککردن (تغير وَإصلاح)ێکی بنجیو هەمەلایەنەیی لە گشت بوارو لایەنەکانی ژیاندا بێننەدیو، کۆمەڵگای نەفامی (المجتمع الجاهلي)و ڕژێمی طاغوتی لابەرنو بیگۆڕن بە کۆمەڵگایەکی مسوڵمانو حوکمێکی ئیسلامی.

ئنجا گومانیشی تێدانیە کە ئەم کارە شتێکی یەکجار قورسو بە زەحمەتەو پێویستی بە ئامادەکردنێکی گرنگو چەندان پێداویستی (مُستلزمات) دەکات، کە یەکێك لەو پێداویستییانەو بە شێکی هەرە گرنگی ئەو ئامادەکردنە، بریتییە لە هەبوونی بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکراو بەهێز بۆ سەلماندنو پاڵپشت کردنی ڕاستیی و تەواویی ئەو بانگەوازو ڕێبازە نوێو نامۆو (ناباوە)ی کە ئەو پێغەمبەرانە هێناویانە.

دەجا ئەو بەڵگەو پشتیوانە لە زاراوی شەرعدا پێی دەگوترێ (مُعْجِزَة) وە (بیِّنە) وە (آیة)، کە لە مەعناو نیوەڕۆکدا لێك نزیکن، چونکە (معجزة) بە شتێك دەگوترێ کە ببێتە هۆی دەمکوتکردنو دەستەوستان کردنی خەڵکی، وە (بَیِّنة)ش بە بەڵگەیەکی هێندە ڕوونو ئاشکراو

بەهێز دەگوترێ کە هیچ کەس توانای ئینکاری کردنو ملەجیڕەی لە ئاقاریدا نەبێ، وە (آیة)یش بە دروشمو نیشانەیەکی وا دەگوترێ کە بشێ بکرێتە بەڵگەی ئیسپاتی بوونو ڕاستیی شتێك.

ئەمەش چەند دەقێکی قورئان لەوبارەوە:

* ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ...﴾[ ]، واتە: بێگومان ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە گەلـی ئاشکراوە ڕەوانە کردوە..
* ﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحاً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ﴾[ ]، واتە: وە بۆ لای ـ گەلـی ـ (ثمود) صالحی برایمان نارد فەرمووی: ئەی گەلـی خۆم خوا بپەرستن جگە لەوی چ پەرستراوتان نین، بە تەئکیدیش لەلایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکی ڕوونتان بۆ هاتوە..
* ﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْباً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ﴾[ ]، واتە: وە ناردمانە لای ـ گەلـی ـ مەدەین شوعەیبی برایان ..
* ﴿وَقَالَ مُوسَى يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ. حَقِيقٌ عَلَى أَنْ لا أَقُولَ عَلَى اللهِ إِلاَّ الْحَقَّ قَدْ جِئْتُكُمْ بِبَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِي إِسْرائِيلَ. قَالَ إِنْ كُنتَ جِئْتَ بِآيَةٍ فَأْتِ بِهَا إِنْ كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾[ ]، واتە: وە مووسا فەرمووی: ئەی فیرعەون من پێغەمبەرم لەلایەن پەروەردگاری

---

(تر) ( الحديد [ ] 25 ).
(یر) ( الأعراف [ ] 73 ).
( ) ( الأعراف [ ] 85 ).
( ) ( الأعراف - 104، 106 ).

جیهانەکانەوە، لە هەق گوتن بەولاوە لەمن ناوەشێتەوە کە بەناوی خواوە بیلێم، بە تەئکید لە پەروەردگارتەوە بەڵگە ـو موعجیزەی سەلماندنی راستی خۆم ـ م بۆ هێناوی، دەجا وەچەی ئیسرائیل ( بني إ سرائیل)م لەگەڵ بنێرە! ـ فیرعەون ـ گوتی: ئە گەر هیچ نیە شانەت هێ ناون بیخەڕوو، ئەگەر لە ڕاستانی ..

ئنجا شایانی باسە کە خوای کاربەجێو زانا بۆ هەر کام لەو پێغەمبەرە پایە بەرزانە (ع لیهم ال صلاة وال سلام) جۆرە بەڵ گەو موعجیزەو نیشانەیەکی تەرخان کردوە کە لەگەڵ جۆری ئەرکە کەیو بارودۆخی گەلەکەیو ئاستی فیکری یاندا بگونجێ، بۆ وێنە: لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە سەردەمو رۆژگاری (مووسا)دا (عل یە ال صلاة وال سلام) زان یاری جادووگەریی (علم السحر) باوبووە، خوا جۆرە موعجیزەو بەڵگە یەکی داوە بە مووسا کە بەڕواڵەت لە جادوو بچێو بەرهەڵستی ئەو دیاردەیەی پێبکات، ئەویش بریتی بووە لەگۆچان (عصا)ەکەیو دەستی درەوشاوەی.

بەڵام چونکە لە ڕۆژگاری (عیسا)دا (علیە الصلاة وال سلام) زان یاری پزیشکی (علم الطب) باوبووەو لە ئارادابووە، خوا چەند موعجیزەو نیشانەیەکی وای بە عیسا بەخشی بوون کە بەڕوا ڵەت لە شێوەی پزیشکی گەرییدا بوون، بەڵام لە ڕاستیدا یاسادڕ (خارق العادة) بوون و، لە ڕێی زانیاریو تەجرەبەوە دەستگیر نەدەبوونو ئێ ستاش کە (٢٠٠٠) ساڵ بەسەر لە دایك بوونی (عیسا) داتێدەپەڕێ هەر دەستگیر نەبوو ونو دەستگیریش نابن، وەك: مردوو زیندوو کردنەوەو کوێری زگ ماكو با بای بەڵەك چاککردنەوەو لە قوڕ دروستکردنی باڵندەی زیندووو ... هتد

ئەمە دەربارەی جۆرو چۆنەیەتی موعجیزەکان، بەڵام ئەو موعجیزا نە لەلایەکی دیکەشەوە دیسان جیاوازی یان لە نێواندا هەبووە، کە بریت یە

لەلایەنی ژمارەو چەندایەتی، بۆ وێنە: پێغەمبەرێکی وەك ( صالح) (علیه الصلاة والسلام) لە قورئانێدا بەس باسی حوشتر (ناقة)ە کەی کراوە، چونکە وادیارە ئەو پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) ئەوەندە بەڵگەیەی بەس بووە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکەی و سەلماندنی دەعوایەکەی، بەڵام دەبینین کەسانێکی وەك مووساو عیسا (علیهما الصلاة والسلام) هەریەکە چەندان موعجیزەی جۆراو جۆریان[تر]، هەبوون، لەبەر ئەوەی ئەرکیان قورسترو سنووری کارکردنیان فراوانتر بووەو حەوجێیان بەبەڵگەو نیشانەی زیاتر بووە.

ئنجا کە دەگەینە سەر باسی دوایین پێغەمبەرو گەورەترینیان (محمد)ی کوڕی (عبدالله) ﷺ، دەبینین چەند جیاوازی یەك لە نێوان موعجیزەی وی و هی پێغەمبەرانی دیکەدا هەن:

یەکەم: موعجیزەی هەموو پێغەمبەرانی پێشوو تایبەت بووە بەو خەڵك و ڕۆژگارو بارودۆخانەوە کە تێیاندا ژیاون و، بەمردنی خۆیان موعجیزەکانیشیان نەماون، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەری سەردار ﷺ ئەو سنوورە تەسکەی شکاندووەو هەرماوەتەوە، دیارحیکمەت و هۆی ئەمەش ئەوەیە کە ئایین و بەرنامەی ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) تایبەت بووە بە کۆمەڵە خەڵکێکی دیاریکراوو ڕۆژگارێکی سنووردارەوە، لە دوای هەرکام لەو بەرنامانە خوا پێغەمبەرو بەرنامەی دیکەی ناردوون، بەڵام بەرنامەی پێغەمبەری کۆتایی ئایینێکی گشتی و هەمیشەیی خەڵکی سەر زەوییەو، جارێکی

---

(تر) بۆ وێنە: خوای بەرز و مەزن دەر بارەی موعجیزەکانی مووسا (علیه السلام) فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ (الأسراء  101) واتە: بێگومان ئێمە نۆنیشانەی ڕۆشنمان بە مووسا دابوون...

دیکەش هیچ بەرنامەو ڕێڕوونی‌یەکی دیکە لەلایەن خواوە بەدوای ویدا نایەت، کەواتە پێویستە هەم بەرنامەکە لە گۆڕان‌و لادان (تغییر وَتحریف) بپارێزرێ‌و، ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾[1]، وەهەم ئەو موعجیزەو بەڵگەیەش کە شایەدو پشتیوانیەتی بمێنێتەوەو بەسەر نەچێت!

دووەم: ئەگەر سەرنج بدەینە موعجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو دەبینین هەموویان شتی یاسادر (خارق العادة)ی زەق‌وبەر چاوو بەرهەست (محسوس) بوون، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ موعجیزەیەکی فیکریی‌و ئەدەبیی‌و عیلمی‌یە!! هەڵبەتە هەر خوا زانیاری ڕاستەقینەی لەوبارەوەو لە هەموو بارێکی دیکەشەوە هەیە، بەڵام ڕەنگە هۆو حیکمەتی ئەم دیاردەیەش ئەوە بێت، کە پێغەمبەرانی پێشوو لەنێو گەلانێك دا هاتوون کە مرۆڤ لە قۆناغێکی پێنەگەیشتنی فیکر(مرحلة عدم النضج الفكري)ی دابووە، هەربۆیەش حەوجێی بەوە بووە کە زیاتر لە ڕێی پێنج هەستەکانی یەوە بدوێنرێ‌و هەقی لە قاڵبی شتی بەرهەستدا بخرێتە بەرچاو، بەڵام دوای هاتنی دوایین پێغەمبەر ﷺ بە تەواوترین بەرنامەی خواوە، مرۆڤایەتی لە قۆناغی کامڵ بوونی فیکریی (مرحلة الرشد الفكري) نیزیك بوو بۆوەو پێویست بوو پێغەمبەرێك‌و بەرنامەیەکی بۆ بنێررێ کە بەڵگەو موعجیزەیەکی گونجاو لە گەڵ ئاستی فیکریی خۆی، پاڵپشتی بێت، دیارە ئەو بەڵگەو موعجیزەیەش قورئانە.

---

[1] (الحجر - 9).

سێیەم: ئایینو بەرنامەی پێغەمبەرانی دیکە لە موعجیزەکانیان جیابوون، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی ﷺ بەرنامەو موعجیزەکەی هەر یەکن، واتە بەرنامەیەکی پێ دراوە کە لە عەینی بەرنامەبوونیدا موعجیزەشەو لە عەینی موعجیزە بوونیشی دا بەرنامەیە.

چوارەم: هەرچەندە قورئانی بەرێزو قسەلەجێیە کەمینو گەورەترین بەڵگەو موعجیزەی (محمد)ە ﷺ بەڵام تاقە بەڵگەو موعجیزەی ئەو زاتە پایە بەرزە نیە، بەڵکو بەڵگەو موعجیزە ئیسپاتکەرەکانی پێغەمبەری نەخوێندەوارو پەسند ئاکار یەکجار زۆرنو بەدەیان(تر)، دەژمێررێن، بەڵام لەبەر دوو هۆیان کە باسی موعجیزەکانی ئەو زاتە دەکرێ، بەس قورئان ناودەبرێو کەمتر باسی موعجیزەکانی دیکەی دەکرێ:

أ ـ چونکە زۆربەی هەرە زۆری موعجیزەکانی دیکەی بەکۆچکردنی نەمانو کۆتایی یان پێ هاتوە.

ب ـ چونکە ئەوەی کە خوا وەك بەڵگەو شایەدی سەلماندنی دەعوای پێغەمبەرایەتی بە (محمد)ی بەخشیوە بەس قورئان بووە، وە ئەو بەڵگەو موعجیزانەی دیکەی زیاتر پێشانی هاوەڵانی بەرێزی داوە بەمەبەستی زیاتر قەناعەت هێنانو بڕوا دامەزران، نەك بڕواهێنان!!

---

(تر) موعجیزە کانی پێغەمبەرمان (علیە السلام) لە زۆر سەرچاواندا باسکراون و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە، بەڵام بە بڕوای من چاکترینیان کتێبی (الشفاء)ی (قاضي عیاض)ە، کە لە چوار بەرگی قەبەدا چاپ کراوەو دوو شەرحی (علي القاري)و (خفاجي) بەسەرەوەیە.

رەنگە هۆی حیکمەتی ئەمەش کە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ بەس قورئانی وەك بەڵگەو نیشانەی ڕاستیی خۆیو بەرنامەکەی بەکارهێناوە، ئەوەبێ کە دوایی شوێنکەوتووانی ویش لەکاتی خەباتو بانگەوازدا هەست بەبێ بەڵگەییو بێهێزی نەکەنو نەڵێن: حەیفێ ئێمەش وێرای قورئان فلانو فیسار (یاسادرِ)یشمان لە دەست نایەت!!(تێ)، بەڵکو هەست دەکەن کە ئەوانیش وەك پێشەوای بەرزو بەڕێزیان پشتیان بە هەمان تاقە پاڵپشتی هەرە بەهێزەوە داوە کە کاتی خۆی ئەو کردوویەتە بەڵگەو شایەدی سەلماندنی ڕاستی بانگەوازو ڕێبازەکەی!!

ئنجا شایانی باسیشە کە قورئانی بەپێز لە هەمان کاتدا کە بەڵگەو موعجیزەی دوایین پێغەمبەرە ﷺ بەڵگەو شایەدی ڕاستی پێغەمبەرانی پێشووشە، چونکە چ بە درێژی (تفصیل)ی ﴿وەك موعجیزەی هەرکام لە (إبراهیمو موسیو عیسیو صالحو داوودو سلیمانو یونسو زکریا...)﴾ وە چ بە کورتی (مجمل)ی (وەك باسکردنی موعجیزەی پێغەمبەرانی دیکەی کە هەموویان خاوەن بەڵگەو نیشانەی ئاشکرابوو ون) باسی ئەو بەڵگەو نیشانانەشی کردوە کە بە باقی پێغەمبەران دراون.

(تێ) دیارە لە ئەنجامی شوێنکەوتنی ڕاستو ساغو دڵسۆزانەی سونەتی پێغەمبەردا ﷺ زۆر جاران بە فەرمانی خوا (کرامة)ی جۆراو جۆر لەسەر دەستی بەندە خواناسو ساڵحەکان دەردەکەون، بەڵام هەروەك چۆن پێغەمبەرمان موعجیزەکانی خۆی (جگە لە قورئان) نەدەکرد نە پاڵپشتی بانگەوازەکەی، دۆستانی خوا (أولياء الله)ش ئەو (کرامة) و یا سادرانە (خوارق العادات)ی خۆیان بەمەبەستی بەڵگە هێنانەوەو پێ سەلماندن ناخەنەروو، مەگەر لە حاڵەتێکی کەم و ڕێژپەڕو لەکاتی ناچاری دا .

کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودە ـیەی پێغەمـ ـبەر ﷺ د ـێنین ـکە دەفەرموێ: ((ما مِن نبـي الا وَأوتي مِنَ الآيات ما مثـ ـله آ ـمن عل ـيه البشر، وانما كان الذي أوتيته وَحياً أُوحي إليَّ، فأنا أرجو أن أكون أكثرهم تابعاً يوم القيامة﴾(تر)، واتە: هیچ کەس ـلە پێغەمـ ـبەران ـنەبووە ـکە بەڵگەو نیشانەی وای نەدرابنێ کە ئینسان بڕوایان پێبێنێ، وە بێگومان ئەو ـ موعجیزە ـ ەی پێم دراوە وەحییێك بوو ـبۆم ـنـ ـێرراوە، بۆ ـیە ـمن ئومێدم وایە کە لە ڕۆژی دواییدا لە هەموویان شوێنکەوتووم زیاتر بن.



(تر) رواه البخاري.

## (13) بانگەوازی پێغەمبەران لە ئەسڵدا یەکەو شێوەکـانی جیا جیـان:-

لە سۆنگەی ئەوەوە کە مرۆڤایەتی بە پێی ویستی خوا لە شێوەی چەند گەلو هۆزی جیاجیادا بەسەر ناوچەکانی زەویدا دا بەش بوو ونو، لە هەموو گۆشەو کەنارەکانی دنیادا نیشتەجێ بوو ون، ئەو ئایینو بەرنامانەش کە بە پێغەمبەرانی زۆرو جۆراو جۆری خوادا بۆ ئەو خەڵکە پرژو بڵاوو جۆراو جۆرە نێرراون، هەرچەندە لە کاکڵو نێوەڕۆکدا یەك بوو ونو خاوەنی یەك ئەسڵو بنەڕەتن، بەڵام لە شێوەو چۆنیەتی جۆراو جۆردا خراونە ڕوو، دەقی قورئانیش دەربارەی هەرکام لەو دوو دیاردەیە زۆرن کە بۆ وێنە هەندێکیان لـێ دەخەینەڕوو:

**یەکـەم: دیاردەی یەکیـەتی ئاییـنو بەرنامەی پێغەمبەران لە ئەسـڵو نێوەرۆکدا :**

* ﴿**شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ...**﴾[1]، واتە: ئەو ئایینەی کە بۆ ئێوەی کردۆتە بەرنامە هەمان شتەکە نووحی پێ ڕاسپاردبوو، وە ئەوەیە کە بۆ تۆمان ناردوەو، ئەوە یە کە ئیبراهیمو مووساو عیسامان پێ ڕاسپاردبوون، کە ئایین بەرپابکەنو تێیدا پەرتەوازە مەبەن.

---

(1) (الشورى 13 ).

* ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾[ت]، (ئەم ئایەتە پێشتر مەعنا کراوە).
* ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ..﴾[ث]، واتە: وە بەتەئکید لە هەموو کۆمەڵێکدا پێغەمبەرێکمان ناردوە کە خوا بپەرستن‌و لە طاغووت دوورە پەرێزبن.

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست!

ئەسڵ‌و بنچینەو کاکڵ‌و نیوەڕۆکی بانگەوازو بەرنامەی بەڕواڵەت جیاجیاکانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بریەتی بووە لە خواناسین‌و خوا بەیەکگرتن‌و ڕوو لە خواکردن لە هەموو بوارو لایەنەکانی تاکی‌و کۆمەڵایەتی ژیانداو، دوورە پەرێزی‌و خۆپاراستن لە کەوتنە تەڵەو داوی تاغووتە زۆرو جۆراوجۆرەکانەوە.

**دووەم: دیاردەی جیاجیایی بەرنامەکانی پێغەمبەران لە شێوەو ڕواڵەتدا:**

* ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً...﴾[ج]، واتە: بۆ هەرکامێکتان ـ مەبەست ئۆممەتەکانە ـ بەرنامەو پەیرەوێکی تایبەتیمان داناوە.
* ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ...﴾[ح]، واتە: وە هیچ پێغەمبەرێکمان بە زمانی گەلەکەی نەبێ نەناردوە، تاکو بۆیان ڕوون

(ت) (الأنبياء 25).
(ث) (النحل 36).
(ج) (المائدة 38).
(ح) (ابراهيم 4).

بکاتەوە... (کەواتە: ئەو زمانانەی کە کتێبو بەرنامەکانی خوایان پێ نێرراونو، ئەو زمانانەی کە پێغەمبەران پێیان لەگەڵ گە لەکانیان دا دواون جیاجیابوو ون).

* ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ...﴾(تر)، واتە: ئنجا تۆمان خستە سەر بەرنامەیەك لە ـ شێوەو بەرنامەکانی ـ ئایین.

هەرچەندە ئایینو بانگەوازی پێغەمبەران (عـلیهم الـ صلاة والـ سلام) لەئەسڵو بنچینەدا یەکەو خەڵکی بەرەو یەك هەوارو مەنزڵ دەباتو، بۆ یەك ئامانجو مەبەست بانگیان دەکات، بەڵام لە جۆرو چۆنیەتی جیاجیاو لە قاڵبو شێوەی جۆراوجۆردان، ڕەنگە هۆو حیکمەتی ئە مەش ئەوەبێ کە ژیانو گوزەرانی ئینسان بەردەوام لە گۆڕانو پەر ستاندن دا یەو، دیسان تیـرەو گەلەکانیش بە حوکمی جیاوازیی ناوچەو جیاوازیی ڕەنگو زمانو دابو نەریتو جۆری گوزەرانو پەیوەندییەکانیانو ئاستی فیکری یان حەوجێیان بە بەرنامەو پەیڕەوی شێوە جیاجیاو جۆراو جۆر دە کات، هەربۆیەش دەبینین پێغەمـبەرانی بەرێزو پایە بەرز (عـلیهم الـ صلاة والسلام) هەتا باسی بیروباوەڕو تێڕوانین بۆ گەلو کۆمەڵگانیان دە کەن، لەیەك نوختەی هاوبەشەوە دەست پێدەکەنو پێداگیـری لە سەر چەند مەبەستێکی دیاریکراو دەکەن و، زۆرجاران هەرشێوەی دەربڕینەکانیشیان دەقاودەق وەك یەکە، بەڵام کە دێنە سەر باسی لایەنی بەرنامەیی (الجانب التشريعي)، ئەوە هەم ئەو بابەت (موضوع)انەی لە بارەیانەوە دەدو ێنو هەم شێوەی تەعبیرەکانیشیان جیاوازی هەیە، دیارە هۆی ئەمەش ئەوەیە کە هەرچی بیروباوەڕو تێڕوانین (العقيدة والتصور)ە لەسەر چەند ئەسڵو

(تر) ( الجـاثية – 18 ).

بنەمایەك ڕادەوەستێ كە بریتین لە چەند ڕاستی (حقائق)یەكی چەسپاوو نەگۆڕ، بەڵام هەرچی لایەنی بەرنامەو پەیڕەوە، ئەوە پەیوەندی بە ژیانو گوزەرانو جۆرو چۆنیەتی هەڵسوكەوتو پەیوەندییەكانی خەڵكییەوە هەیە، دیارە ئەم مەسەلانەش لە گۆڕانو پەرە ستاندنو گەشەكردنێكی بەردەوام دان.

ئەمەش چەند نموونەیەك لە دەقەكانی قورئان سەبارەت بە خستنەڕووی هەركام لە لایەنەكانی بیروبڕواو بەرنامە لەسەر زمانی پێغەمبەران بۆ گەلەكانیان:

## یەك: لایەنی بیروبڕوا :

* ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾[ ].

*﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُوداً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ أَفَلا تَتَّقُونَ﴾[ ].

* ﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحاً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ...﴾[ ].

* ﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْباً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ...﴾[ ].

وەك دەبینین لە بواری ڕاگەیاندنی بیروباوەڕدا دەنگی زوڵاڵی

---

( ) ( الأعراف - 59 ).
( ) ( الأعراف - 65 ).
( ) ( الأعراف - 73 ).
( ) ( الأعراف - 85 ).

پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پەردەی کات‌و شوێن (زمان و مکان) دەدڕێ‌و بە هەموویان (کۆڕس)ێك پێكـدێنن ـ بەڵام بە چەند زمانی جیاجیا ـ سروودی: (اعبدوا الله ما لكم من اله غيره) دەڵێن!

دوو: لایـــەنی بەرنـــامەیی:

* ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ ۞ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلا تَتَّقُونَ ۞ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ۞ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ ۞ قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ ۞ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلا عَلَى رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ ۞ وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ﴾[؟].
* ﴿كَذَّبَتْ عَادٌ الْمُرْسَلِينَ ۞ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلا تَتَّقُونَ؟ ۞ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ؟ ۞ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ؟ ۞ وَإِذَا بَطَشْتُمْ بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ؟﴾[؟].
* ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ الْمُرْسَلِينَ ۞ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ أَلا تَتَّقُونَ؟ ۞ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ؟ ۞ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ۞ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ۞ وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً فَارِهِينَ ۞ فَاتَّقُوا اللهَ وَأَطِيعُونِ ۞ وَلا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ ۞ الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلا يُصْلِحُونَ﴾[؟].
* ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ ۞ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلا تَتَّقُونَ؟ ۞ أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ؟ ۞ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾[؟].

---

(؟) ( الشعـراء - 105، 114 ).
(؟) ( الشعـراء - 123، 130 ).
(؟) ( الشعـراء - 141، 152 ).
(؟) ( الشعـراء - 160، 166 ).

* ﴿كَذَّبَ أَصْحَابُ لْأَيْكَةِ الْمُرْسَلِينَ. إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلا تَتَّقُونَ؟ ...أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ ۞ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ۞ وَلا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ...﴾[1].

وەك دەبینین بەرنامەو پەیڕەوی گۆڕانکاری هەر کام لەم پێنج پێغەمبەرانە (نوح، هود، صالح، لوط، شعیب)، (علیهم الصلاة والسلام) هەرچەندە تێکڕا لەسەر یەك ئەسڵو بنچینە دامەزراون کە بریتیە لە (پایەرزکاریی بۆ خواو فەرمانبەریی بۆ پێغەمبەر) ( فاتقوا الله وأطیعون)، وە هەرچەندە نێوەڕۆكو مەبەستی هەموانیشیان یەك شتە، کە بریتیە لە گۆڕینو چاککردنی کۆمەڵ، بەڵام هەرکامێکیان شێوەو بیچمێکی تایبەتی هەیەو مۆرکێکی سەربەخۆی پێوەیە، ئەمەش لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو کۆمەڵگایانەی کە ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵیان ڕووبەڕوو بوونو لە چاککردنو گۆڕینیان وەخۆکەوتوون، لێك جیاو جۆراو جۆر بوون و، هەرکامێکیان لە بارودۆخو کاتو شوێنێکی جیا لەوانی دیکەدا بووەو، بەجۆرە نەخۆشیو گیروگرفتێکی تایبەتیەوە گیرۆدەبووە، کە ئەگەر لە هەندێك خاڵانیشدا پێك بگەنەوە، بە شێوەیەکی گشتی هەرلێك جودانو، شێوەو چۆنیەتیەکی سەربەخۆیان هەیەو لە ئەنجامی ئەوەشدا پێویستییان بە شێوازو چۆنیەتیەکی تایبەت و بەرنامەیەکی سەربەخۆش دەکات بۆ گۆڕینو چارەسەر.

---

[1] (تر) ( الشعراء – 176، 183 ).

## با بزانین چۆن؟!

یەکەمی ئەو پێغەمبەرانە کە ( نووح)ە، لە گەڵ گەلو کۆمەڵێکدا دەستەویەخە بووە، کە ڕژێمی چینایەتیو چەوساندنەوەی ئابووریو سیاسی بەسەریدا زاڵ بووەو خەڵکەکە بۆ تە دوو بەش، زۆربە یەکی ڕەشو ڕووتو نەدارو چەوساوەو مافخوراو کە زلەزلە چەو سێنەرو خۆ شگوزەرانەکان بە (الأرذلون)یان[تر] ناو دەبەن!، بەڵام قورئان بە زۆری بە چەو سێنراوەکان (المستضعفین)[یر]، ناویان دە بات، وە بە شی دووەمی کۆ مەڵگای نووح، دەستەیەکی کەمی خۆ بەزلگرو قسە ڕۆیشتوو، کە قورئان بە خۆ بەزلگران (المستکبرون)و خۆشگوزەرانان (المترفون)و زیادەڕۆکەران (المسرفون) وەسفیان دەکات، جا لێرەدا نووح (علیه السلام) کە لە گەڵ کۆمەڵگا یەکی ئاوادا ڕووبەڕوو بووە کە دووچاری دەردی چینایەتیو قڕیی و پڕیی و ڕژێمی ئا غاو مسکێنی بووە، دەبینین بە زۆری تەئکید لەسەر ئەوە دەکات دوای پارێزکاریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەر کە بنچینەی گۆڕینو چاککردنی کۆ مەڵگان، کە: سەنگی مەحەكو تەرازووی گرانییو سووکیی بریتییە لە کردەوە (و ما علمي بما کانو یعلمون)، وە کە لە دوای کردەوەی چاك سەرەنجامی چاکییو خراپیی بەندەکان بەس خوا دەیزانێ (إن حسابهم إلاّ علی ربّي...).

---

(تر) پێ شتر و شەی (الأراذل ، الأرذ لون) مان تەفسیر کرد، هەڵبە تە (أراذل) و (أرذ لون) هەردووکیان هەر کۆی (أرذل)ن، ئەوە ندە هە یە یەکەمیان ( جمع التکسیر)ەو ئەوی دیکەیان (جمع المذکر السالم)ە.

(یر) لە وشەی (المستضعف)ەوە دەفامرێتەوە کە خەڵکە چەوسێنراوە کە لە زاتی خۆیدا بێهێز ( ضعیف) نیە، بەڵکو بە ئانقە ست بێهێز کراوە، چونکە (س) سەر (مستضعف) سینی (طلب)ە.

کەواتە: ئەوەی کە ئێوە ـ ئەی چینی خۆ بەزلگرو چەو سێنەر ـ خۆ تانی پێوە هەڵدەکێشن‌و شانازی پێوە دەکەن لە دەستەڵات‌و سامان‌و ڕەنگ‌و دیمەنی جوان‌و بنەماڵەو وەجاخ‌و ڕەچەڵەك، هیچیان لەلای خوا بە سەنگی مە حەك‌و پێوەری هەڵسەنگاندن دانانرێن، بەڵکو پێوەرو سەنگی مە حەکی نا سینی چاکیی‌و خراپیی ئینسانەکان بەس کردەوەی چاکە!!

دووەمیشیان کە (هوود)ە (علیه السلام) بۆ کۆمەڵگایەك ن ێرراوە، کە ئامانج‌و مەبەستی هەرەبەرزی ژیان لەلای وان بریتیە لە دروستکردنی گردو قەلای بەرز بەرزو کۆشك‌و باڵەخانەی بڵندو بێڕەزا لەسەر شوێنە بەرزەکان‌و ڕێ‌و بانان، بەس بە مەبەستی کات بە سەربردن‌و ڕا بواردنی بێ‌ئا مانج‌و ڕێگریی‌و دەست وەشاندن‌و فیزو کە شخەکردن بە سەر خەڵکی چەو ساوەو بەشخوراودا، بۆیە ئەویش لەوبارەوە ئامۆژگاری گەلە کەی دە کات‌و تێ یان دەگەیەنێ، کە ئەو جۆرە ڕەفتارانە پێچەوانەی ژیانێکی ئینسانانەن‌و لە گەڵ سوپاس‌و شوکرانە بژێریشدا بەراوەژوون‌و پێویستە شەرم لە خوا ب کەن‌و دەستیان لــێ هەڵگرن!

سێیەمیشیان کە (صالح)ە (علیه السلام) بۆ گۆڕین‌و چارەسەری واقیعی دوور لە خوایانەی کۆمەڵێك نێرراوە کە لە ژیانێکی پڕ هێمە نی‌و ئا سایش‌و بەزەرق‌و بەرق‌و پێشکەوتووی بەرزو گەشە سەندوو (را قي)دا سەرگەرمی رابواردن‌و گوزەران بوو ون کە ڕەزو باغ‌و کانی‌و سەر چاوەی زۆرو ک شتوکاڵ‌و دارخورمای میوە پێگەیشتووو خانووو کۆشکی لە شاخ داتا شراوو نەخش‌و نیگار تێدا کێشراو، چەند دیمەنێکی زەقی ئەو ژیانە ماددیی‌یە پڕ عەیش‌و نۆش‌و بە کەیف‌و سەفایە بوو ون، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە کۆ مەڵگای (ثمود) لەسەر بنچینەی پارێزکاریی‌و پابەندیی بە فەرمانی پێغەمە بەرەوە دانەمەزراوە، شان بەشانی ئەو پێشکەوتنە ڕوا ڵەتی یە ماددی یەو ئەو

ڕابواردنو گوزەرانە جەستەیی‌یە، لەلایەن دەستەیەکی دیکتاتۆرو بەزەبرو زۆری خۆشگوزەرانو زیادەڕۆکەر (مُسْرِفْ)ەوە کە کارو پیشەیان خراپەکاریی (إفساد)و ئاشووب گێڕانە، چەندان نەخۆشی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووری پەرەیان گرتووە، ئەو عەیشو نۆشو ڕابواردنە ماددی‌یەیان کردۆتە ژارەمارو ژەقنەمووت، بۆیە (صالح) لەو ڕووەوە گەلەکەی دەدوێنێو، ئەو دەستە خۆبەزلگرە خۆشگوزەرانو خراپەکارە کە شیرازەی کۆمەڵگایان پچڕاندووەو هەموو شتێکیان لە گرێژەنە بردوە، بە خەڵکە عەوامو سادەو فریو خواردوە مافخوراوە کە بناسێنێ!

(لوط)یش کە چوارەمیانە لە سۆنگەی ئەوەوە کە کۆمەڵەکەی دووچاری نەخۆشییەکی یەکجار نزمو پیسی ئەخلاقی بووە، کە بریتییە لە نێربازیی، ئەویش وەك هاوەڵانی دیکەی دوای بانگەوازکردنی بۆ پارێزکاریو فەرمانبەریی (التقوى وَالطاعة) بێ پێچوپەنا بەخەڵکە سەرلێشێواوو ڕەوشت نزمەکەی ڕادەگەیەنێ کە ئەو کارە شتێکی یەکجار دزێوو پەستو نزمەو، خوا ئافرەتی بۆ پیاوو پیاوی بۆ ئافرەت خوڵقاندوە، نەك بە پێچەوانەوە، وە پێیان ڕادەگەیەنێ کە (أنتم قوم عادون) ئێوە گەلێکی یاخیو لەڕێ دەرچووو سەرکێشن!!

(شوعەیب)یش کە بۆ چاککردنو گۆڕینی واقیعی بێ سەرەوبەرەو پەشێوی خەڵکی (مەدیەن) ـ کە بە خاوەن درەختەکە (أصحاب الأيكةَ)ش ناسراون ـ نێرراوە، لەبەرئەوەی کۆمەڵی ناوبراو لە بواری ئابووریو مامەڵەو بازرگانیدا تووشی تەرازوو بازییو فێڵو فەرەجو تەڵەکەبازیی بووبوون، لە ئەنجامی ئەمەشدا بووبوونە خراپەکاران (مُفسدین)ی سەرزەوی، زۆر بەی ئامۆژگاریو ئاگاداری‌یەکانی لەو سوورگەیەدا دەسووڕێتەوە.

ئێستاش بە پێویستی دەزانم بەر لەوەی ئەم باسە بەجێ بێڵم سەرنجی خوێنەر بۆ مەسەلەیەکی گرنگ ڕابکێشم:

وەك لە سەرگوزشتەی ئەو پێنج پێغەمبەرە بەرزو بەڕێزەدا دەبینین هەرچەندە هەرکامێکیان لە بواری بەرنامەییەوە بە شێوەیەکی جوداو سەربەخۆ لەگەڵ گەلەکانیدا دەدوێن، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەر کام لەو گەلو کۆمەڵانە خاوەنی بارودۆخو واقیعێکی تایبەتییەو لەگەڵ چەند دەردو نەخۆشیو کێشەیەکی تایبەتیدا دەستەویەخە بووە، بەڵام هەر پێنجیان لەبواری بیرو بڕواو بنچینەی خەباتو شۆڕشەکانیاندا پێیان لە سەر یەك شێوە تەعبیرو پێداگیری لەسەر چەند مەسەلەیەك دەکەن، کە بە ئەسڵو بنەماو بناغەی شۆڕشو خەباتی پێغەمبەران دادەنرێن، کە ئەمانەن:

﴿... أَلا تَتَّقُونَ... إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ۞ فاتقوا الله وَأطيعون ۞ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾.

1 ـ بێدارکردنەوەو ڕاچڵەکاندن (**أَلا تَتَّقُونَ**).

2 ـ ڕابەرایەتیو چاوساغی یەکی جێی دڵنیاییو متمانە پێکراو (**إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ**).

3 ـ فەرمان کردن بە پارێز کاریی لە خواو فەرمانبەریی کردنی پێغەمبەری پێشەوا (**فاتقوا الله وأطيعون**).

4 ـ چاوەڕوانی نەکردنو داوانەکردنی پاداشت لە هیچ کەس (**وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ**).

5 ـ دڵی خۆ خۆشکردنو قەناعەت کردن بەکرێو پاداشتی خوا (**إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ**).

هەڵبەتە ئەم پێنج بنچینە سەرەکیو هێڵە گشتییە نەك هەر لە رابردوودا بەڵکو ئێستاشو لەمەودواش هەر بە بەردی بناغەی هەموو خەباتو شۆڕشێکی خواییانە دادەنرێنو، پێویستە شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) زۆرچاك سەرنجیان بدەنو هەمیشە لە بەرچاویان بن.

لێرەشدا کۆتایی بە خاڵی یەکەمی بەندی سێیەم دێنینو دەچینە سەروکاری خاڵی دووەم:

( خـــاڵـــی دووەم ) :

# ئەنجـامو بەرهـەمی بـڕوا بـوون بە پێغـەمبـەران ( علیهم الصلاة والسـلام )



# ئـەم خـاڵـــە

خوێنەری ســەنگین:

ئەم خاڵی دووەمە تەرخان کراوە بۆ خستننە رووی ئەنجام‌و بەرهەمی ئیـمان هەبوون بە پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا (علیهم الـ صلاة والـ سلام)، وە هەوڵمان داوە کە لە دوو تویێی پێنج برگاندا پێنج ئەنجام‌و بەرهەمی گرنگ‌و سەرەکی ئیمان هەبوون بە پێغەمبەران‌و رەوانەکراوانی خوا (عزّو جل) بەو جۆرەی کە لە خاڵی یەکەمدا خستمانەروو چونکە لە راستیدا تەنیا ئیـمانی (راست‌و دروست) ئەنجام‌و بەرهەمی چاك‌و پەسندو چاوەڕوان کراوی دە بێ، نەك هەر جۆرە (ئیمان)ێك! هەربۆیەش هەرکاتێك بابای مـ سوڵمان هە ستی کرد کە یەکێك لە پایەکانی ئیمانی ئەنجام‌و بەرهەمی پێویستی تـ ێدا وەدی نەهێناوە، دەبێ دەستبەجێ چاو بەخۆی‌و جۆری ئیمانەکە یدا بیگێرێ تەوەو کارەکەی لە بناغەوە راست بکاتەوە، ئەگەرنا (ئاو کە لە سەرچاوە لێڵ بوو لە جۆگەلە روون نابێتەوە)!

خـوێنەری بەرێز!

وەك چۆن روونـاکبوونەوەی نێوەوەو دەرگاو پەنجەرەکانی ژوورێك کە چرای تێدا داگیرساوەو، میوەو بەرداربوونی درەختێکی بەردار کە رووادوەوفراژوو بووە،

ئەنجامێکی سروشتو مسۆگەرو چاوەڕوان کراوە، کردارو رەفتارو رەوشتو ئاکاری مسوڵمانانەش میوەو بەرهەمێکی مسۆگەرو سروشتی یە لە هەر کەسێکدا کە ئیمانی لە عەقڵو دڵدا سەقامگیرو پنجو گرتوو بووە.

جا با لێرەشدا بزانین، ئەنجامو بەرهەمی مسۆگەرو چاوەڕوانکراوی بڕوابوون بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە دەرو دەروون ( ظاهر و باطن)ی مرۆڤی مسوڵماندا چیەو چۆنە بەوجۆرەی کە باسکرا؟!

## یەکەم : خۆشترویستنیان لە هەموو کەسێك :-

بەڵێ یەکەمین ئەنجامو بەرهەمی چاوەڕوانکراوی بڕوابوون بە پێغەمبەران ئەوەیە کە بابای بڕوادارو مسوڵمان ئەو پێغەمبەرە بەرزو بەرێزانەی لە هەموو کەس خۆشتر بوێن، تەنانەت لە نەفسی خۆشی!! خوای بەرزو بێوێنە لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿النبي أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ﴾[1]، واتە: پێغەمبەر ﷺ بە بڕواداران لە نەفسی خۆیان لە پێشترە، وە فەرموویەتی: ﴿مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُمْ مِنَ الْأَعْرَابِ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنْ رَسُولِ اللهِ وَلا يَرْغَبُوا بِأَنْفُسِهِمْ عَنْ نَفْسِهِ﴾[2]، واتە: خەڵکی ـ شاری ـ مەدینەو ئەو عارەبە خێڵەکی یانەی لە دەوریانن، بۆیان نیە کە لە پێغەمبەری خوا دواب کەون ـ و نەچن بۆ جەنگ ـ وەنابێ نەفسی خۆیان لە ـ فیداکردن ـ لە پێناوی نەفسی ویدا لێ وەچاوبێ! پێغەمبەریشمان ﷺ فەرموویەتی: ((ثلاثٌ مَنْ كُنَّ فيه وَجَدَ بهنَّ حلاوةَ الأيمان: أن يكون الله ورسوله أحب اليه مما سواهما...))[3]،

---

(1) ( الأحزاب 6 ).
(2) ( التوبة – 120 ).
(3) متفق عليه.

واتە: سێ ـ شت ـ لە هەرکەسێکدا هەبن بەهۆی وانەوە شیـرنایەتی بڕوای دەستگیربووە: ـ یەکەمیان ـ کە خوداو پێغەمبەرەکەی لە غەیری وان لەلا خۆشەویست تر بن.

دیسان فەرمووویەتی: ((لایؤمن أحدکم حتی أکون أحب إلیه مِنْ وا لده وولده والناس أجمعین))[تر]، یەکێکتان بڕوا نایەنێ، تامنی لەلا خۆشەویستتر نەبێ لە بابیو ڕۆڵەیو تێ کڕای خەلکی! هەڵبەتە لە هەموو شتێك خۆشترویستنی پێغەمبەران (علیهم الـ صلاة والـ سلام) زۆر شتان لە سەر ئینسان پێویست دەکاتو نیشانەشی زۆرن، بەلاّم زەقـ تـرینو بەر چاوترینیان ئەوەیە کە بەوپەڕی حورمەتەوە ناویان بێنێو لەدەمی ناوهێنانیاندا داوای پایە بەرزتر بوونو خێرو خۆشییان بۆ لە خوا بـ کات، وەك خودا دەر بارەی پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النبي يَا أَيُّ هَا الذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيماً﴾[یر]، واتە: بێگومان خوداو فریشتەکانی سەڵەوات دەنێرنە سەر پێغەمبەر، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە سەڵەواتی لەسەر بدەنو سەلامی بۆ بنێرن.

وە لەبارەی پێغەمبەرانەوە بەگشتی فەرموویەتی: ﴿قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلامٌ عَلَى عِبَادِهِ الذِينَ اصْطَفَى...﴾[]، واتە: بلّێ ستایش بۆ خوا وە سەلام لەسەر ئەو بەندانەی کە هەڵی بژاردوون، بۆیەش لە دەمی ناوهێنانی هەرکام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلم)دا، گوتنی (صلی الله علیه وسلم) یان

---

(تر) متفق علیه.
(یر) (الأحــزاب  56).
() (النمــل - 59).

(صلی الله علیه وآله وسلم) یان (علیه السلام)[تێ] سـونـنەتو ئەدەبێکـی بەرزی ئیسـلامییە، بەڵام بە تایبەتـی پێغەمبەرمان محمد ﷺ، وەك فەرموویەتی: ((مَنْ صلّى عَلَيَّ صلاةً صلى الله عليه بِها عشراً))[2]، واتە: کەسێك سەڵەواتێکم لەسەر بدات، خوا بەوە (10) سەڵەواتی لە سەر دەدات.

وە فەرموویەتی: ((البخيل مَنْ ذُكِرْتُ عنده فلم يصلي عليَّ))[3] واتە: رژدو چرووك کەسێکە کە ناوی منی لەلا باس دەکرێ بەڵام سەڵەواتم لە سەر نادات.

---

(تێ) روونکردنەوەیەك دەربارەی مەعنای (صلاة) و (سلام):

وشەی (صلاة) لە ئەسڵی زماندا وەك (راغب الأصفهاني) دەڵێ لەلای زۆربەی زانایان واتە: پاڕانەوەو بەپیرۆز گرتن و بە گەورەگرتن، لە زاراوی شەرعیشدا لەلای جەماوەری زانا یان (جمهور العلماء) بە گوێرەی ئەو سەر چاوەیەی لێیەوە دەدێررێ واتا کەی دەگۆڕێ، ئەگەر لە خواوە بێ بۆ بەندەکانی ئەوە ماناى (بەزەیی نواندن)و (پایە ـ)و (پێهەڵگوتن) دەگەیەنێ، وە ئەگەر لە فریشتان یان لە مرۆڤانەوە بێ بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وە غەیری وانیش لە بڕواداران، ئەوە بریتیە لە لە خوا داواکردنی (بەزەیی و پایە بەرزکردنەوەو پێهەڵگوتن) بۆیان.

وشەی (سلام)یش لە ئەسڵی زماندا وەك (راغب) دەڵێ واتە: ساغو سەلامەتیو بێ عەیبیی دەرو دەروون، وە (سلام) ناردنیش وەك (صلاة) ناردن، بە پێی ئەو سەرچاوەیەی کە لێیەوە دەنێررێ ماناکەی دەگۆڕێ، (سلام) ناردنی خوا بۆ بەندەکانی یانی ڕەخساندنی سەلامەتیو بێعەیبی بۆیان، وە (سلام) ناردەنی فریشتانو مرۆڤان بۆ پێغەمبەرانو غەیری وانیش، واتە: داواکردنی هاتنەدیو زیادبوونی سەلامەتیو بێعەیبی بۆیان. بڕوانە: (معجم مفردات الفاظ القرآن)، ص (239، 285) ، وە بڕوانە: (اعانة الطالبين) ب (1)، ل (12).

(2) رواه مسلم عن عبدالله بن عمر بن العاص (رضي الله عنهما).

(3) رواه الترمذي عن علي (رضي الله عنه) وقال: حديث حسن صحيح.

## دووەم : گـرتنـى خـەت و ڕێبـازيـان :-

یەکی دی لەو شتانەی کە ئەنجام و بەرهەمی بڕوا بوون بە پێغەمبەرانی خوا (صەلاتو سەلامی خوایان لێ بێ)، ئەوەیە کە مرۆڤی مسوڵمان ئەو خەتو ڕێبازە بگرێ کە ئەوانی لەسەر بوون و، بێجگە لەوان هیچ کەسێکی دیکە بە ڕابەرو چاوساغو پێشڕەوی دا نەنێ، چونکە خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕابەرایەتیو چاوساغیی خەڵکی ڕەوانەکردوون و، بۆ ئەوەش کە بە چاکی بتوانن ئەو ئەرکە مەزنە جێبەجێ بکەن، سەر ڕاستو شارەزای ڕێی ڕاست (الصراط المستقیم)ی کردوونو دڵو مێشکی بە زانیاری را ستو پێویست ڕوون کردوونەوەو، لە هەڵەو پەڵەو لادانو ڕێ بزرکردن پاراستوونی.

خوای شارەزاو زانا فەرمووبەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[ت]، واتە: بە ڕاستی لە پێغەمبەری خوادا پێشڕەوایەتی یەکی چاك هەیە بۆ ئێوە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((فعليكم بسنَّتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين عَضوُّا عليها بالنواجذ..))[ي]، واتە: دەجا ڕێوشوێنی منو ڕێوشوێنی جێنشینە سەرراستە ڕێڕوونیکراوەکان بگرن، ددانی لە سەر ڕۆ گرن...!

بێگومان کە سێکیش پێغەمبەرانی لە هەموو کەس لەلا بەرێزترو خۆشەویستتربن و، بڕواشی وا بێ کە سەرتۆپی مرۆڤایەتیو کاملترین ئینسانن، بەهیچ ڕەنگێك بەخۆی ڕەوا نابینێ بێجگە لەوان وەدوای کە سی

---

(تر) (الأحزاب 21).

(یر) رواه ابو داوود والترمذي و قال حسن صحيح.

دیكە بكەوێ، مادام وا بێ كە سانێك كە خەتو ڕێ بازو ڕێو شوێنی پێغەمبەرانیان لەبەر دەستدایەو دەكەونە شوێن ئەملاولاو مـلـی كوێرەڕێ (ڕێچكان!) دەگرن، شایەدی یەكی زۆر بەهێز لە سەر خۆیان دەدەن كە مەسەلەی بڕوابوونیان بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لاف لێدانی ڕووتو بنچینەیەو، قسەیەكی بێپشتو پەناو بۆشەو هیچی دیكە!

## سێیەم : خۆشویستنی دۆستانیان و پشتگرتنیان :-

بەڵێ یەكی دیكە لە ئەنجامو بەرهەمە مسۆگەرو چاوەڕێكراوەكانی بڕوا بوون بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەیە كە هەموو ئەو كەسانەی كە خەتی وان دەگرنو دۆستو پشتیوانیانن، خۆشی بوێنو دۆستایەتیو برایەتییان لەگەڵ بكات.

خوای بێوێنەو تاك فەرموویەتی: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ..﴾[1]، واتە: وە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار هەندێكیان پشتیوانی هەندێكیانن... دیسان خوای پایەبەرزو بەخشەر لە وەسفی ئەو مسوڵمانانەدا كە لەپاش كۆچكەرو پشتیوانەكان (المهاجرون والانصار)ەوە دێن، كە ئێمەو هەر مسوڵمانێكی دیكەش دەگرێتەوە، تا ڕۆژی دوایی، دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾[2]، واتە: وە ئەوانەی لە دوایانەوە ـ لە دوای (المهاجرون والانصار) ـ دێن، دەڵێن: پەروەردگارمان لە ئێمەو لەو برایانەمان ببوورە كە پێش ئێمە بڕوایان هێناوە، وە ڕقو كینەمان

---

[1] (التوبة 71).
[2] (الحشر 10).

مەهاوێ دڵی سەبارەت بەو کەسانەی بڕوایان هێـناوە، پەروەردگارمان بە ڕاستی تۆ میهرەبانو بە بەزەیی.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((والذي نفسي بيده لاتدخلوا الجنة حتى تؤمنوا، ولاتؤمنوا حتى تحابوا...))(تر)، واتە: سوێند بەو زاتەی گیانمی بەدەستە هەتا بڕوانەیەنن ناچنە بەهەشتێ، بڕواش نایەنن هەتا یەکدیتان خۆش نەوێ....

جا بێگومان چاکترینو گەورەترینو دۆستو پشتیوانی پێغەمبەرمان (عليه الصلاة والسلام) برادەرە بەڕێزەکانیی (خوا لێیان ڕازی بێ)، بە تایبەتی کۆچکەرو پشتیوانەکان (المهاجرون والانصار)، کەواتە لە سەر هەرکەسێك پێویستە کە بڕوای بە پێغەمبەرمان هەیەو خۆی دەوێت، ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستی هەبێ بۆ برادەرە بەڕێزەکانی بە گشتیو بۆ کۆچکەرو پشتیوانەکانیش بە تایبەتی، (خوا لێیان ڕازی بێ)، گەورەترین زەقتـرین نیشانەی ڕێزو خۆشەویستیش سەبارەت بەو زاتە مەزنانە، ئەوەیە کە بەڕێزەوە ناویان بهێنرێو لە دەمی ناوهێنانیاندا ڕەزامەندی خودایان بۆ داوابکرێو بگوترێ (رضي الله عنهم) (خوا لێیان ڕازی بێ)(یر)، چونکە خودا

---

(تر) رواه مسلم.

(یر) گوتراوە: ﴿هەموو یاسایەك ڕیزپەر، (شاذ)ی هەیە﴾، لە نێو هاوەڵانی پێغەمبەریش دا (خوا لێیان ڕازی بێ) هی وا هەیە، کە دەبێ لە جیاتی (رضي الله عنه) خوا لێی بووورێ (غفر الله لهُ)ی بۆ بگوترێ، بۆ نموونە: (أبو سفيانو معاويەو عمرو بن العاصو مغيرة بن شعبة)! (خوا لێیان ببورێ)، بە تایبەتی (معاوية) کە حوکمی ئیسلامیی لە شوراییەوە گۆڕی بۆ میراتی و لە (الخلافة الراشدة)وە گۆڕی بۆ (الملك العضوض) پێغەمبەری خواش ﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی: ((أوّل مَنْ يغيِّر سُنّتي رَجُلٌ مِنْ بني أُميَّةَ)) بڕوانە (سلسلة الأحاديث الصحيحة) رقم ([illegible])، (الالباني) گوتوویەتی: (لعّل المراد بالحديث تغيير نظام أختيار الخليفة وجعله وراثة).

کەسێکیش کە بەم قسەیە قەڵس دەبێ، وادیارە بە (چاوپێچکی) (وما جرى بين الصحابة نسكت عنه) بەرچاوی خۆی گرتوەو وەك پێویستیش ئاگای لە مێژوو نیە.
بەڵام لێرەدا خستنە ڕووی چەند ڕاستی یەك بە پێویست دەزانم:
- من کە دەڵێم هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان لە یەك ئاست دانین و هی وایان هەیە (غفر الله له)ی لێ دەوەشێتەوە نەك (رضي الله عنه)، تەنها مەبەستم ئەوەیە کە لە ناسینی ئیسلامدا بە هەڵەدا نەچین و لەکاتی ڕوونکردنەوەی بەرنامەی خوادا خاتری هیچ کەس نەگرین، کەواتە با هیچ کەس واتێ نەگات من دەمەوێ لە ڕێزو پلەو پایەی هەندێك لە (اصحاب) دابشکێنم!! نەخێر، بەڵام ئامادەش نیم بۆ خاتری هیچ کەس چاو لە ڕاستی یەکانی ئیسلام بنووقێنم!
ئیدجا ئەو کەسانەشیان کە تێبینیی و ڕەخنەمان دەربارەیان هەیە پلەو پایەی هاوەڵایەتی (رتبة الصحبة) یان هەر لەجێی خۆی دایەو بەو ئیعتبارەش جێی هەموو ڕێزو حورمەتێکمانن،وە لە ڕووی گێڕانەوەی فەرموودەشەوە بە ڕاستگۆیان دەزانین وە ئەوەی لە سەر چاوە متمانەدارەکانی (أهل السنة والجماعة) شەوە دەربارەیان نەقڵ نەکرابێ، جێگای ئیعتبار نیە، چونکە ئاشکرایە کە رافضی یەکان بوختانو درۆودەلەسەی زۆریان بۆ هەڵبەستوون.
- بێگومان ئەو جۆرە کەسانەی کە من ئاماژەم پێ کردن زۆر نین و بە پەنجەی دەستان دەژمێررێن، کەواتە باهیچ کەس ئەم رایەی من نەکاتە دەستە چیلەی لە (أصحاب) کەوتنە گومانو دوودڵی یەوە، چونکە زۆر ناماقووڵو بێجێ یە کەسانێك خوا بە گشتی پاکانە (تزکیە)ی کردبن، تۆش لێیان بکەویە گومانەوە!
- ئەو کەسانەی کە لەژێر پەردەی خۆشویستنی (أهل البيت)، و بنەماڵەی پێغەمبەردا ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر بە گشتیو ناودارانیان بە تایبەتی دەبوغزێنن و، ناوو ناتۆرەی خراپیان بەدوا دەخەن، ئەوانە هیچ جیاوازی یان لەگەڵ ئەوانەدا نیە کە کاتی خۆی لەژێر پەردەی لایەن گریی (أصحاب) دا (أهل البيت) یان دەبوغزاند، هەر بۆیەش جەماوەری زانایان هەرکام لەم دوو تاقمەیان بەهەڵە داناون و، هەر لە کۆنەوەش بە تاقمی یەکەمیان گوتوە (رافضي) یەکان و، بەهی دووەمیش (ناصبي)یەکان.
ئیدجا جەماوەری مسوڵمانان کە بە (أهل السنة والجماعة) ناسراونو ڕێزگرتنو خۆشویستنی هەرکام لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و بنەماڵەکەییان بە پێویست زانیوە، هەربۆیەش ئیمام (شافعی) (خوا لێی خۆش بێ) دەربارەی خۆشەویستنی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(جل جلالە) لە گەڵ ئەو هەموو گەورەیی و بەرزی یەیدا لە کاتی باسکردنیاندا فەرموویەتی: ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ﴾[]، ئنجا لە دوای هاوەڵە

---

ان كان رَفْضاً حُبُّ آل أحمد    فليشهد الثقلان أني رافضي

وە (أبن تيمية)ش دەربارەی خۆشویستنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

لإن كان نَصْباً حبُّ أصحاب محمد    فليشهد الثقلان أني ناصبي

[] – هیچ کاتێکیش زا ناو پێشەوایانی ناوداری بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ، چ یازدە پێشەوایەکان کە شیعە بە لە گوناح پارێزراو (معصوم)یان دەزانن وە چ غەیری وانیش، بیروڕایان دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە گشتی و سێ خەلیفەکان بە تایبەتی خراپ نەبووەو هەرشتێکی خراپ لەوبارەوە لەو زاتانە نەقڵ کرابێ، درۆو بوختانێکی هەڵبەستراوە، بۆ وێنەش ئەم بەسەرهاتە دەگێڕینەوە:

﴿محمد﴾ی کوڕی (علی) کوڕی (حسين) کوڕی (علی) إبن إبي طالب﴾ (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە بابی کە بە (زين العابدين) ناسراوە، دەگێڕیتەوە کە کۆمەڵێك لە خەڵکی عێراق هاتنە لای و دەستیان کرد بە قسە گوتن بە (أبوبكر و عمر) (خوا لێیان ڕازی) بێ، ئیذجا (عثمان) (خوا لێی ڕازی بێ)، وە زۆر یان گوت! ئەویش، واتە: (زين العابدين) پێی گوتن: ئایا ئێوە لە (المهاجرين الأولين)ن؟! گوتیان: نەخێر، فەرمووی: ئەدی لە (الذين تبوؤا الدار والايمان من قبلهم)ن؟! گوتیان: نەخێر، فەرمووی: دە جا بێگومان کە بۆ خۆتان شایەدیی دەدەن لەم دوو کۆمەڵە نین، منیش شایەدیی دەدەم کە لەوانەش نین کە خوا لەبارەیانەوە فەرموو یەتی: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا...﴾ (الحشر – [])، دەهەستن بڕۆن خوا ئاواو ئاواتان پێ بکات! (بڕوانە تەفسیری (الجامع الأحكام القرآن)ی قرطبي، ب ([])، ل ([]، [])).

قوڵە نەزیلـەیەك:

شێخ حەسەنی گڵەزەردە کە یەکێك بووە لە ناودارانی کورد لە بواری (تصوف)دا، وە بەرەچەڵەك سەییدەو دەچێتەوە سەر بنەماڵەی بەرزی پێغەمبەر ﷺ، لە وەڵامی نامەیەکی (نادر شا)دا کە لە کاتی داگیرکردنی شاری (سلێمانی)دا بۆی ناردوەو لافی خۆشەویستنی (أهل البيت)ی لێداوە، لە نامەیەکیدا پێی گوتوە: (... ئەوەش کە لافی خۆشەویستنی (أهل البيت)ت لێداوە، ئەگەر بێتو بوغزا ندنی (اصحاب)ی تێکەڵ بووبێ، هیچ نرخی نیەو دادت نادات ...) بڕوانە کتێبی (شێخ معروف النودهی)ی شێخ محمد الخال..

(تر) (التوبــة – 100).

بەڕێزەکانی پێغەمبەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، زاناو پێشەوا خواناسە چاوسەغو تێکۆشەرەکان کە میراتگرو جێگری پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة وال سلام) لە هەموو کەسێك پتر جێی ڕێزو خۆشویستنی بابای مسولّمانن، بۆیە واچاکە لە دەمی ناوهێنانی هەر یەکێکیاندا داوای بەزەیی‌و رەحمی خوای بۆ بـ کریّو بگوترێ: (رحمهُ الله) خوا ڕەحمی پێ بکات.

بەلاّم بێگومان خۆشەویستی‌و ڕێزنواندن سەبارەت بە دۆستانی پێغەمبەران بەگشتی‌و پێغەمبەرمان بە تایبەتی، ئەگەر نەچێتە قالّبی کردارو ڕەفتارەوەو لە دنیای واقیعدا نەیەتە بەرچاو، نە بوونی خۆی ئیسپات دەکات‌و نە هیچ بایەخێکیشی هەیە، کەوا تە پ شتگرتن‌و لە سەرکردنەوەو هاو کاریکردنی دۆستانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە زانا یانی ڕا ستەقینەو تێکۆشەر لە ریزی پێشەوەیانن، بەلگە یەکی پێوی ست‌و گرن گە بۆ هەر کەسێك کە دەیەوێ دەعوای خۆشوی ستنی پێغەم بەران‌و خەت‌و ڕێ بازی‌و دۆستانیان ئیسپات بکات.

**چوارەم : بوغزانـدنی دوژمنـانیـان‌و لێ بەریـی بوونیـان :-**

چوارەمین بەرهەمی بڕوابوون بە پێغەمبەران (علیهم ال صلاة وال سلام) ئەوەیە کە مرۆ ڤی م سولّمان کە سانێك ببوغزێ نێ کە دوژمنا یەتی پێغەمبەران‌و خەت‌و ڕێ‌و شوێن‌و جێگرانی ڕاستەقینەیانیان کردوەو دە کەن، نەك هەر بوغزاندن‌و ڕق لـێ‌هەستان، بەلّکو بە گوێرەی توا ناو بۆ لوان دژایەتیشیان بکات!!

وەك خودا لە وەسفی هاوەلّە بەڕێزەکانی پێغەمبەردا (خوا لێیان ڕازی بێ) فەرموویەتی: ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ وَالَّذِينَ مَ عَهُ أَ شِدَّاءُ عَ لَى الْكُ فَّارِ رُحَ مَاءُ

**بَيْنَهُمْ...﴾**[تر]، واتە: موحەممەد ﷺ نێرراوی خوایە، وە ئەوانەی لەگەڵی لەسەر کافران توندوتیژنو لە نێو خۆیان میهرەبانن...

بەڵێ بێڕەحمی نواندنو ڕەقیو توندوتیژیی لە ئاقار نا حەزانی خەتو ڕێبازی پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلم) کە وەك لە لاپەڕەکانی پێشوودا ڕوونمان کردەوە، ناحەزو دوژمنانی پێغەمبەرانی خواش بە زۆری هەر لە چینی طاغووتو خۆبەگەورە زانو زۆردارو چەوسێنەردا خۆیان دەنوێنن، ئەنجامو بەرهەمێکی سروشتیو ئاسایی بڕوابوونە بە پێغەمبەرانو خەتو ڕێبازیان، هەربۆیەش خوای کاربەجێو بێهاوتا فەرموویەتی: **﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾**[یر]، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەگەڵ ئەو کافرانەدا بجەنگن کە لێتان نیزیکن ـو وەبەر پەلتان دەکەون ـ وە با زبریتان پێوە شك بەرن، وە بزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە، وەك دەبینین خوا زبریی نواندنو پارێزکردن، یان زبریی (غلظة)و پارێزکاریی (التقوی)ی پێکەوە با سکردوون، تاکو کەس وانەزانێ کە ڕەقییو توندوتیژی لەگەڵ تەقوادا دژن، یان پێکەوە نەگونجاون!! وەك هەندێك فەریکە مسوڵمانی فەقیرحاڵۆکەو دەستوپێ سپیو کەم دەمار گومان دەبەن!

بەڵێ بەڵگەی مسوڵمانەتیو خۆشویستنی خواو پێغەمبەرەکەی (علیە الصلاة والسلام) ئەوەیە کە مرۆڤی مسوڵمان دوژمنی سەرسەختی ناحەزانی خواو پێغەمبەر بێو، وەك ڕابەرە بەڕێزەکەی ﷺ وێرای پێ قەڵشینیو لەش سڕبوونی بەشەو نوێژان، ددان شکاوو ڕوومەت قەڵشاویش بێ لە مەیدانی جەنگو شۆڕشدا دژی کافرانی زۆردارو چەوسێنەرو خۆبەزلگر!

---

(تر) ( الفتح 29 ).

(یر) ( التوبة - 123 ).

**پێنجەم : هەوڵدان بۆ بووژاندنەوەی ڕێو شوێنیان :-**

یەکی دیکە لەو خەسڵەتانەی کە بڕوابوون بە پێغەمبەران وەك ئەنجامو بەرهەمێکی سروشتی لە بابای مسوڵماندا دەیهێنێتەدی، ئەوە یە کە لە یە کەمین ڕۆژی خۆ بە شوێنەکەوتووی پێغەمبەران لەقەڵەم دانیەوە، خۆشەویستی خواو پێغەمبەر (علیهم الصلاة والسلام) لە دەروونیدا ببێتە بڵێسەیەکی بەتینو ئارامی لێهەڵبگرێو ئیسراحەتی لێتێك بداتو، وای لێبکات خەووخۆراکی لێتێکبچێو شەوو ڕۆژان پێکەوە گرێ بدات، لە ڕێی گەشەپێدانی ڕێو شوێنی پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة وال سلام) بۆ بووژاندنەوەو بەرەوپێش بردنی ئە گەر لە مەیدانێ دا بێ ، وە هێناوەو هەڵستاندنەوەی ئەگەر لە گۆڕێدا نەمابێو شێوێنرابێ! وەك پێغەمبەری بەرێزمان لەوبارەوە فەرموویەتی: ((المتمسك بِسُنَّتي عند فساد أمتي له أجر شهيد))[تر]، واتە: دەستگرتوو بە ڕێوشوێنی منەوە لە کاتی تێک چوونی ئۆممەتمدا پاداشتی شەهیدێکی هەیە.

جا بێگومان گرتنی ڕێوشوێنی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی سەرگەردان بوونی خەڵکیو ڕێ لێ بزربوونیاندا کارێکی یەکجار سەختو دژوارەو عەزمو هیممەتێکی مەردانەی دەوێ وەك پێغەمبەر (عليه الصلاة وال سلام) فەرموویەتی: ((المتمسك بِ سُنَّتي ع ند إ ختلاف أ متي كال قابض ع لى

---

(تر) أخرجه الطبراني في الاوسط.

الجَمْرِ))[٢٣]، واتە: دەستگرتوو بە ڕێو شوێنی منەوە لەکاتی جیاجیایی ئۆممەتمدا وەك كەسێك وایە دەستی بە پۆلووان[٢٤] گرتبێ.

هەڵبەتە دەست بە ڕێوشوێنی پێغەمبەرەوە گرتن شتێكی گەورەیەو پاداشتێكی یەكجار بەرزی هەیە، بەڵام لەوە پادا شت بەرزتر ئەوەیە كە مرۆڤی مسوڵمان وێڕای دەست بە سوننەتەوە گرتنی خۆی، هەوڵ بدات خەڵكی دیكەش بەو ڕێوشوێنە ئاشنا بكات، واتە هەروەك چۆن لە ژیانی خۆیدا ڕێوشوێنی پێغەمبەری بووژاندۆتەوە، هەوڵ بدات لە واقیعی ژیانی كۆمەڵگاشدا بیبوژێنێتەوەو ڕاستی بكاتەوە، پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) لەوبارەوە فەرموویەتی: ((...فطوبى للغرباء، وهم الذين يصلحون ما أفسد الناس مِنْ بَعدي مِنْ سنتي))[٢٥]، واتە: ... خۆشیو بەختیاری بۆ غەریبان، ئەوانیش ئەوانەن كە ئەو ڕێوشوێنەم كە خەڵك دوای من تێكیان داوە چاكی دەكەنەوە.

جا بێگومان ڕێوشوێنی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) دوو واتای هەن، یەكیان گشتی، كە مەبەست ئەو ڕێبازو ڕاستە شەقامەیە كە لە قورئانی بەهێزو سوننەتی بەپێزەوە هەڵدەقوڵێ، وە ئەوی دیكەیان تایبەتی و مەبەست ئەو ڕفتارو ئاكارو خووو ڕەو شتە بەرزو پەسندانەن كە لە پێغەمبەردا ﷺ هاتوونە دیو، بۆ ئێمەش سوننەتە پێیانەوە پابەندبینو لە خۆمانیاندا بێنینەدی.

جا ئەوەی زۆر مایەی داخو خەفەتو پەژارەو ناسۆرە لە دڵی هەر مسوڵمانێكی ڕاستو ساغدا، ئەوەیە كە لەم سەردەمەدا زۆر بەی ئۆممەتی

---

(٢٣) رواه الترمذي.
(٢٤) پۆلوو: پشكۆ.
(٢٥) رواه الترمذي.

پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وآله و سلم) سەبارەت بە سوننەتەکانی پێغەمبەرو ڕەوشتو ئاکارو ڕەفتارە بەرزو هەڵبژاردەکانی، یەکجار کەمتەرخەمو بێ مشوورە، ئنجا ئەوەی پتر قورەکەی خەست کردووەو بگرە مایەو ئەسڵی دروستبوونی ئەو قوڕەیە، ئەوەیە کە زۆربەی ئەوانەی خۆشیان بە زاناو چاوساغی خەڵکیو میراتگری پێغەمبەران دەزانن، لە خەڵکی عەوامو ڕەشۆکی زیاتر دووچاری دەردی پشت لە سوننەتکردن بوونو لە بەرانبەر دەست بە سوننەت گرتندا گیرۆدەی چەندان دیاردەو خەسڵەتی خراپی نامو سڵمانانە بوون، بۆ وێنە: ڕیش تاشین، جگەرەکێشان، نوکتەبازییو قسەی هەڵلەقو مەڵلەق گێڕانەوە، دەم بە دەمەی بێ سوودو بەناهەق، پێکەنینی زۆرو بەقاقا، دامەو شەترەنجو دۆمینەو نۆڕیزکێنە، کەڵەمستێنە[تر]هەروەها سەردانی تاغووتو زۆرداران و ورگ ئاخنین لە خواردنی حەرامو پیسیان، غەیبەت کردن، پاڕانەوە بۆ کاربەدەستانی زۆردارو خوانەناس، بەرهەڵداکردنی کوڕو کچو خێزانو گوێ نەدان بە بارهێنانیان لەسەر ئیسلامەتیو ... هتد.

بەڵێ بە دەردی کورد دەڵێ: (ئەگەر دارخوار بوو سێبەری هەر خوار دەبێ)و دیارە (ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە)!! بەڵام هیچ دەرد بێدەرمان نینو، گەڕانەوەشمان بۆ سەر ڕێو شوێنی پێغەمبەر ﷺ لەخۆدا ڕەنگدانەوە

(تر) ئەمانە چەند جۆرە یارییەکن بەس بۆ کات گۆزەراندنو تەمەن کوشتن دەکرێن، دیارە ئەگەر لەسەر شت بکرێن، ئەوە زانا یان یەکدەنگ (بالأجماع) بە حەرامیان دەزانن، بەڵام ئەگەر هەروا لەسەر هیچ بکرێن، زانایان ڕایان جیاجیایە سەبارەت بە حەرامییو ناحەرامییان، بەڵام بێگومان ئەگەر حەرام یان ناپەسند (مکروە)یش نەبن، شتێکی پووچ و بێ کەڵکنو دەچنە خانەی (لغو)ەوە خوای بەرزیش ئیما ندارانی بەوە پێناسەکردوە کە پشت لە (لغو) دەکەن: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ۞ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ۞ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ﴾ (المؤمنون 1-3).

درەوشاندنەوەی سوننەتو ڕەوشتو ئاكارە پەسندەكانی چاكترینو بەڵكو تاقە دەرمانی چارەسەرە!

كەواتە: با هیچ كام لە سوننەتەكانی پێغەمبەران بە كەم نەگرینو پشتگوێ نەخەینو نەڵێین: جا خۆ سوننەتەو فەرز نییە! وە با گەورەترین پەندیش لە تێشكانی مسوڵمانان لە جەنگی(ئوحود)دا وەربگرن، ئایا هۆی تێشكانو لەدەستدانی(ﷺ)شەهید، ئەوەنەبوو كە یەك تاقە فەرمانی پێغەمبەریان شكاندو تیرهاوێژەكان شاخۆڵكەی[تر] ئوحودیان بەجێ‌هێشت؟!

جا ئەگەر شكاندنی فەرمانێكی پێغەمبەر ﷺ و بەگوێ نەكردنی یەك تاقە قسەی، ئەو ئەنجامو ئاكامو سەرئەنجامە شوومەی بەدواوە بێ، دە بێ پشتگوێ خستنی زۆربەی فەرمانو سوننەتەكانی چ سەرەنجامێكی هەبێ؟!

خوێنەری بەڕێزو سەنگین!

لە ڕاستیدا بڕواهێنان بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەو شێوەیەی كە قورئانو سوننەت فەرمانیان پێ‌كردوەو ئێمەش لە سێزدە (ﷺ) خاڵی سەرەكیدا خستمانە ڕوو، ئەنجامو بەرهەمی یەكجار زۆرو زەوەندی هەنو، بەرپرسیاری یەكی گەورەو قورس داوێتە سەرشانی مرۆڤی مسوڵمان، بەڵام ئێمە لەم باسانەدا نامانەوێ لە بنی كوولەكەی بدەینو هەموو شتێك بڵێینو بۆ لێكۆڵینەوەی تێرو تەسەلی ئەو بابەتانەی كە ئێمە

(تر) لە ڕاستیدا ئەو شوێنەی كە پێغەمبەر ﷺ پەنجا (50) هاوەڵە تیرهاوێژەكەی لەسەر دامەزرا ند، شاخۆلكەیەكی گچكەیە و دەكەوێتە دامێن چیای ئوحودەوە پێی دەگوترێ (جبل الرماة) چیای تیرهاوێژەكان، نەك تیرهاوێژەكان لەسەر چیا (ئوحود) بووبن ، وەك باوە.

بە چڕی‌و پڕی‌و گوشراویی دەیانخەینە ڕوو، خوێنەر حەواڵەی ئەو شوێن‌و سەرچاوانە دەکەین کە بۆ توێژینەوەی ئەو جۆرە باسانە تەرخان کراون.




خوێنەری بەڕێز!

لەم خاڵەدا خواپشتیوان بێ هەوڵ دەدەین بە پوختیی و گوشراویی باسی مافو هەقەکانی پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ بە سەر ئۆممەتو شوێنکەوتووانی یەوە بکەین، ئەویش لە سێ بڕگەدا کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە[تر]:

(①) لە بەرانبەر پێغەمبەری خوادا چیمان لەسەر پێویستە؟

(②) هەڵوێستی پێشینانمان لە ئاقار پێغەمبەری خوادا.

(تر) بۆ نووسینی ئەم خاڵە بە هەرسێك بڕگەکەیەوە سوودم لە کتێبی: (الشِّفاء بتعريف حقوق المصطفى)ی (قاضي عياض) وەرگرتوە، بڕوانە: القسم الثاني: فيها يجب على الأنام من حقوقه (عليه الصلاة والسلام) بەرگی (3)، لاپەڕە (301 – 341).

(ﻫ) مەرجو نیشانەکانی ئیمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ و خۆشویستنی.

ئیدی تۆو سێ برگەکانی ئەم خاڵی سێیەمەی بەندی سێیەم:

## (●) لە بەرانبەر پێغەمبەری خوادا ﷺ چیمان لەسەر پێویستە؟!

بێگومان هەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی بەرێزو پایە بەرزی خوا (علیهم الصلاة والسلام) ئەرك‌و مافێكی زۆری بە سەر ئەو كۆ مەڵو ئۆممەتەوە هەیە كە خۆی بە شوێنكەوتووی دەزانێ، جا ئێمە لێرەدا هەر چەندە بە گشتی باسی هەقی پێغەمبەران دەكەین بە سەر ئۆممەتەكانیانەوە، بەڵام زیاتر مەبەستمان پێغەمبەری پێشەواو سەروەرمان (محمد)ە (علیه الصلاة والسلام)، كە دەتوانین بە كورتی‌و گوشراویی لەژێر چوار ناوونیشاناندا باسی ئەو ئەرك‌و مافە بكەین كە لە سەر هەموو ئەندامێكی ئۆممەتی ئەو زاتە پایە بەرزە پێویستە جێبەجێ بكات:

● - بڕوا پێ بوونی: بەڵێ یەكەمین هەقی پێغەمبەر (علیه من الله افضل الصلوات واتم التسلیمات) بەسەر ئۆممەتەكەیەوە ئەوەیە كە لەناخی دەروون‌و قووڵایی دڵەوە بڕوای پێ بێنن، كە لەلایەن خواوە هەڵبژێرراوەو پلەو پایەی بەرزی پێغەمبەرایەتی پێ دراوەو، بە مەبەستی ڕێڕوونی‌و

دەستگرتنی خەڵکی بە بانگەوازێکی تەواوو بەرنامەیەکی بێ پەڵەوە ڕەوانەکراوە، وە لە سەداسەد بڕواو قەناعەتیان وابێت کە هەر چی لەلایەن خواوە هێناویەتیو پێی ڕاگەیانراوە، هێندەی دەنکە خەرتەلەیەکو بەقەدەر سەری دەرزییەك هەڵەو کەمو کورتی تێدانییە، وە بڕوایان وابێ کە ئەو زاتە چاکترینو تەواوترینو ڕاستترین ڕابەرو پێشەوایە لە هەموو بوارەکانی فیکریو ئەخلاقیو مەعنەویو سیاسیو کۆمەلایەتیداو، هیچ سەرکردەو ڕابەرێك هەرچەندە پیرۆزو بلیمەتو هەڵکەوتووو ناوازە بێت، نەك هەر شانی لە شانی نادات، بەڵکو تۆزی ڕێیەشی ناشکێنێ، پەرێزو بەرهەمیش چاکترین شایەدە.

دیارە دەقی قورئانو سونەتیش لەوبارەوە زۆر زۆرن بەلام ئێمە بەس دووانیان بە نموونە دێنینەوە:

* ﴿...فَآمِنُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ النبـي الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللهِ وَكَلِمَاتِهِ...﴾[ ]، واتە: ... دەجا بڕوا بەخواو بە پێغەمبەرە هەوا ڵدەرە نەخوێندەوارە کەی بێنن کە بڕوای بە خواو بە وشەکانی هەیە...

* ((أمرت ان أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا اله إلا الله وَيؤمنوا بي وَبِما جئت به...))[یر]، واتە: فەرمانم پێکراوە کە لە گەڵ خەڵکیدا بجەنگم هەتا شایەدیی دەدەن کە جگە لەخوا هیچ پەرستراونین، وە بڕوا بە منو بەوە دێنن کە ـ لە لایەن خواوە ـ هێناومە.

- فەرمانبەریی کردنیو شوێنکەوتنی: بێگومان سەرەکیترین ئەرکی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە ببێتە پێشڕەوو سەرمەشقی خەڵکی وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللهِ...﴾[ ]، واتە: وە

---

(تر) ( الأعـراف 158 ).

(یر) اخرجه الخمسة.

( ) ( النســاء 64 ).

هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە مەگەر بۆ ئەوە کە بە فەرمانی خوا فەرمانبەریی بۆ بکرێ ... دیسان فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ...﴾[تر]، واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە پێشڕەوایەتی‌یەکی چاك هەیە.

بەڵێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆیە نێرراون کە پێشەوایەتی‌و چاوساغیی خەڵکی بکەن، کەوابێ لە سەر هەموو ئەوانەی کە خۆیان بە ئوممەت‌و شوێنکەوتوویان دەزانن فەرزە کە گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریی‌یان بکەن‌و لە وردو درشتی ژیانیاندا بیانکەنە سەرمەشق‌و پێشڕەوی خۆیان‌و، لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانی تاکی‌و کۆمەڵایەتی‌یاندا بەجێ پێی واندا هەنگاو هەڵێنن، دیارە لەوبارەشەوە ئایەت زۆرن کە ئەمانە چەند نموونەیەکیانن:

* ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَوَلَّوْا عَنْهُ وَأَنْتُمْ تَسْمَعُونَ﴾[یر] واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، وە پشتی تێ مەکەن لە حاڵێکدا کە ـ هەق ـ دەبیستن.
* ﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا﴾[]، واتە: ئەو ڕۆژەی کە ڕووی (تاوانبار)ان لە ئاگر(ی دۆزەخ)دا ئەمدیوەو دیو دەکرێ، دەڵێن: ئەی خۆزگە فەرمانبەریی خوامان کردبایە، وە فەرمانبەریی پێغەمبەرمان کردبایە!

---

(تر) (الأحـزاب 21).
(یر) (الأنفـال 20).
() (الأحـزاب 66).

* ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلاً﴾[1]، واتە: وە ئەو ڕۆژە کەستەمکار دەستەکانی خۆی دە گەزێو دەڵێ خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێم گرتبایە بەرێ.

- ڕێزو حورمەت گرتنی: یەکی دیکە لە مافەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لەسەر ئۆممەتەکەی ئەوەیە کە بەدەرو دەروون ( ظاهرو باطن)یان ئەوپەڕی شەرمو ڕێزو حورمەتی بۆ دابنێنو، بەو پەڕی ڕێزو ئەدەبەوە ناوی بێننو لەگەڵی بجووڵێنەوە.

ئنجا بێگومان ئەو ئەدەب نواندنو شەرم لێکردنو ڕێزگرتنە لە زۆر شتاندا خۆی دەنوێنێ، کە ئێمە لەبەر تیشکی ئەم چەند ئایەتە بەرزو بە پێزەدا هەوڵ دەدەین گرنگەکانیان بخەینەڕوو:

* ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ۞ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لا تَشْعُرُونَ ۞ إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَى لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ﴾[2]، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ـ هیچ شتێك ـ وە پێش[3]، دە ستی خواو پێغەمبەر کەی مەخەن، وە پارێز لە خوا بکەن بێگومان خوا بیـ سەرو زانایە، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە دەنگی خۆتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا بەرز

---

(1) ( الفرقـان 27 ).
(2) ( الحجـرات 1 3 ).
(3) بۆ شارەزابوون بە چەمكو واتای ئایەتی ناوبراو دەتوانی سەرەنجی (الجامع الأحكام القرآن)ی القرطبي، ب (6)، ل (300)، وە (الميزان)ی محمد حسين الطباطبائي، ب (18)، ب (307) بدەی.

مەكەنەوە، وە وەك چۆن هەندێكتان لەگەڵ هەندێكتاندا دەنگ هەڵدێنن، ئاوا بە دەنگی بەرز قسەی لەگەڵ مەكەن، نەوەك بێ ئەوەی ئاگاتان لێ بێت كردەوەكانتان هەڵبوەشێنەوە، بێگومان ئەوانەی كە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا دەنگیان نزم دەكەنەوە، ئەوانە كەسانێكن كە خوا دڵیانی بۆ پارێزكاریی تاقی كردۆتەوە، وە لێبوردنو پادا شتی مەزنیان هەیە.

※ ﴿لا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُمْ بَعْضاً﴾[تر]، واتە: با بانگ كردنتان بۆ پێغەمبەر ﷺ لەنێو خۆتانداوەك بانگكردنی هەندێكتان بۆ هەندێكتان نەبێ ... (واتە: زێدە ڕێزو حورمەتێك بنوێنن بۆ وێ نە: نابێ بەناوی شەخسی كە (محمد)ە بانگی بكەن، بەڵكو بە شۆرەتی پێغەمبەرایەتی‌یەوە بانگی بكەنو بڵێن: یا رسول الله ! یا نبي الله ! نەك یا محمد).

※ ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا...﴾[یر]، واتە: ئەو ـ فەرمان ـ ەی كە پێغەمبەر ﷺ بە سەرتاندا دەدات وەری بگرنو، ئەوەی ئەو لێتان قەدەغە دەكات وازی لێ بێنن.

كەواتە: ئەدەبو ڕێزنواندن لەگەڵ پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) بەوە دەبێ كە:

<u>یەكەم</u>: هەتا فەرموودەی خواو پێغەمبەرەكەی وەستابن ـ كە قورئانو سوننەتن ـ ئینسان هیچ قسەو بڕیارو هەڵوێستێكی سەربەخۆ نەخاتەڕوو.

---

(تر) ( النــور 63 ).
(یر) ( الحشــر 7 ).

دووەم: دەنگی خۆی ڕەسەر دەنگی وی نەخات، بێگومان بیـروڕای خۆ، یان خەڵك هەڵبژاردنیش بەسەر فەرموودەی وی دا جۆرێ كە لە دەنگ هەڵبـڕین!

سێیەم: بە دەنگی بەرز قسەی لە خزمەتدا نەكات، ئێستاش كە تەشریفی لە بەیندا نەماوە لە مزگەوتەكەی‌دا یان لە نزیك مەزارەكەیەوە بەدەنگی بەرز قسە نەكات، وە هیچ هەڵوێست‌و ڕەفتارێكی وا پیشان نەدات كە ئەوەی تێدا بێتە بەرچاو كە لەگەڵ خەڵكی دیكە فەرقی پێ ناكات!!

چوارەم: بە شەرم‌و ڕێزەوە بیدوێنێ، ئێستاش كە ناوی پیـرۆزی دەبات بە ئەدەب‌و شەرم‌و ڕێزەوە ناوی ببات!!

پێنجەم: قەت بەناوی شەخسی خۆی بانگی نەكات، ئێستاش لەكاتی ناوهێنانیدا مەگەر لەبەر پێویستی‌و ناسین دەنا قەت نەڵێت (محمد) ﷺ وابوو و (محمد) واچوو، بەڵكـو هەر بڵێی (رسول الله) پێغەمبەری خوا.

شەشەم: هەر ئەمرو فەرمانێكی لەلایەن ئەوەوە پێ‌گەشت، بێ سێ‌و دوو وەری بگرێ‌و بە پێی توانا جێبەجێی بكات.

حەوتەم: هەر كە بیستی ئەو زاتە شتێكی قەدەغە كردوە یان بە ناپەسند (مكروه)ی زانیوە یەكسەر وازی لـێ بێنێ.

- خۆشویسـتنی: هەقێكی دیكەی پێغەمبەر (علیه الصلاة وال سلام) بەسەر ئۆممەتەكەیەوە ئەوەیە كە نەك هەر خۆشیان بوێ، بەڵكو لە هەموو شتێك‌و هەموو كەس‌و تەنانەت لە خودی خۆشیان خۆشتر بوێ، چونكە (عمر بن الخطاب) (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە كە ڕۆژێكی بە پێغەمبەری خوای گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێجگە لە خۆم،

تۆم لە هەموو کەس خۆشتــر دەوێ، دەڵێ ئەویش فەرمووی: (( لن یؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من نفسه)) واتە: یەکێکتان بڕوا نایەنێ هەتا منی لە خۆی لەلا خۆشەویست تر نەبێ، عومەر دەڵێ: ئنجا گوتم: ((والذي أنزل عليك الكتاب لأنْتَ أحب إلي من نفسي التي بين جنبــي)) واتە: سوێند بەوەی کتێبی ناردۆتە سەرتۆ، تۆم لە خودی خۆشم خۆشتر دەوێ، ئەویش فەرمووی: (الآن یا عمر) ئێستا ئەی عومەر، (واتە ئێستا بڕوایەکەت تەواو دامەزراوەو کامڵ بووە)، ئەم فەرموودەیش (بخاري) گێڕاویەتەوە.

دیارە دەقی دیکەش لەوبارەوە لە قورئانو سوننەتدا زۆرن، بەڵام ئێمە بە چەند نموونەیەك قەناعەت دەکەین:

* ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللهُ بِأَمْرِهِ وَاللهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾(تر)، واتە: بڵێ! ئەگەر بابتانو کوڕانتانو براياتانو هاوسەرانتانو تیرەو هۆزتانو سامانێك کە پەیداتان کردوەو، بازرگانی یەك کە لە ڕەواج کەوتنی دەترسنو خانووبەرەیەك کە دڵپەسندتانە، لەلاتان خۆشەویستتــرن لە خواو پێغەمبەرەکەیو تێکۆشان لە پێناویدا، ئەوە چاوەڕێ بن هەتا خوا فەرمانی خۆی دەنێرێ، وە خوا کۆمەڵی لارێ بووان ڕێڕوونی ناکات.

* ((لايؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من والده وولده والناس أجمعين))(یر)، (پێشتر لێکدراوەتەوە).

---

(تر) (التوبة 24).

(یر) متفق عليه.

* ((ثلاث من كن فيه بهن حلاوة الأيمان: أن يكون الله ورسوله أحب إليه من سواهما...))(تر)، (پێشتر لێکدراوەتەوە).

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست!

خۆشویستنی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەو شێوەیەی کە خواو پێغەمبەرەکەی دەیانەوێ لەسەر هەموو مسوڵمانێك فەرزەو مەرجی مسوڵمانەتی یە، جا بێگومان مەگەر چۆنەکایی‌و بەدەگمەن دەنا تێکڕای مسوڵمانان لافی خۆشویستنی پێغەمبەر لێ دەدەن و هیچ کەس نیە لەوبارەوە گلەیی لە خۆی هەبێت!

بەڵام بێگومان خۆشویستنی ئەو زاتە - ڕووحم فیدای بێ - بەوشێوەیەی کە خواو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) داوایان کردووەو پێی رازین هەروا شتێکی سووك‌و سادە نیەو، بە دەعوای بێ بەڵگەو قسەی ڕووت ئیسپات نابێ، جا بۆ ئەوەی لەم دەعواکردنەی خۆمان‌و خەڵکیش حاڵی بین، لە چەند خاڵێکی کورتدا هەندێك لە هەڵوێستەکانی زانایانی خوانا سانی دەربارەی مەرج‌و نیشانەکانی خۆشویستنی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ڕوون دەکەینەوە:

## (●) هەڵوێستی پێشینانمان لە ئاقار پێغەمبەر ﷺ دا:

- پرسیار لە (علي بن أبي طلب) کرا (خوا لێی رازی بێ) کە ئایا خۆشەویستیتان بۆ پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) چۆن بوو؟! ئەویش فەرمووی: بە خوا لە ماڵ‌و سامانمان‌و ڕۆڵەکانمان‌و بابمان‌و دایکمان وە لە ئاوی سارد لەکاتی تینوەتی دا، لە لامان خۆشەویست تربوو!!

---

(تر) رواه الشيخان.

- (زيد بن أسلم) دەگێڕێتەوە کە شەوێکی (عمر بن الخطاب) پاسەوانی خەڵکی دەکرد، چاوی بە چرایەك کەوت لە ماڵێکیدا پیرێژنێك (خوری)یە دەشکنێتەوەو لە (شە)ی دەکاتو دەڵێت:

علی محمــد صــلاة الأبــــرار
صلّى عليه الطيبـون الأخيـــار
قد كنـت قوّاماً بُكاً بالأســحار
يا ليت شَعْري والمنايا أطـــوار
هــل تجمعني وحبيبـي الدار(تر)؟!

ئیدی عومەریش دانیشتو دەستی کرد بە گریانی!

- جارێکی عومەر (خوا لێی رازی بێ) تەماشای بەردەرەشەکە (الحجر الأسود)ی کردو گوتی: بێگومان تۆ بەردێکی نەزیانو نە قازانجی ناگەیەنی، وە ئەگەر پێغەمبەری خوام ﷺ نەدیبایە کە ماچی دەکردی، ماچم نەدەکردی، ئنجا ماچی کرد.

- یەکێك لە والییەکانی (عمر بن عبدالعزيز) بۆ عومەری نووسیو حاڵی وڵاتەکەی خۆی پێ ڕاگەیاند کە (دز)ی زۆرن، جا ئایا بە گومان (ظن) ڕەفتار بکەین ـ و خەڵکی بگرین ـ؟ یان هەر بە پێی بەڵگە (بيّنة) ڕەفتار بکەینو بەو شێوەیە بەڕێوە بچین کە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بڕیاری داوە؟! ئەویش بۆی نووسی: کە هەر بە بەڵگەی شەرعی بیانگرەو بە پێی سوننەت ڕەفتار بکە، جا ئەگەر خوای بەرز چاکی نەکردن، یاخود قەت چاك نەبن!

---

(تر) واتە: سەڵەواتی چاکان لە سەر مەحەممەد، بەندە پاك و هەڵبژاردەکان سەڵەواتت لەسەر بدەن، بێگومان تۆ پێش سبەینان شەونوێژت دەکردو دەگریای، خۆزگە زانیبامو مردنیش جۆراو جۆرە، ئایا ماڵێك من لەگەڵ خۆشەویستەکەمدا کۆدەکاتەوە؟!.

- (عبدالله بن عمر) یان دی له شوێنێك حو شترەكەی خۆی سووڕاندەوە، لەوبارەوە پرسیاری لـێكرا، فەرمووی: نازانم، ئەوەندە هەیە پێغەمبەری خوام دی (علیه الصلاة والسلام) كە ئەویش لەو ئا قارە وای كرد!!

- لە (أحمد بن حنبل) گێڕراوەتەوە فەرموویەتی: ڕۆژێ كی لە گەڵ كۆمەڵێكدا بووم، ئەوانە خۆیان ڕووت كردەوەو چوونە نێو ئاو، بەڵام من ئیشم بەم فەرموودەیە كرد كە دەفەرموێ: ((من كان يؤمن بالله وَاليوم الآخر فلا يدخل الحَمَّام الاّ بِمْئزرٍ))، وا تە: هەركە سێك بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با بە پە شتەماڵەوە نەبێ نە چێتە نێو گەرماو، وە خۆم ڕووت نەكردەوە، هەر ئەو شەوە یەكێكم لە خەوێدا دی دەیگوت: ئەی ئەحمەد موژدەت لـێ بێ كە خوا لێت خۆش بووە بەهۆی ئیش پێكردنی سوننەتەوە، وەگێڕاویشی بە پێ شەوا (إ مام)، گوتم: تۆ كێی؟! گوتی: جوبرائیل (علیه السلام)[تێ].

## (ھ) مەرجو نیشانەكانی خۆشویستنی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام):

خوێنەری بەڕێز:

بەلای كەمەوە خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ دە مەرجو نیشانەی هەن:

<u>یەكەم</u>: شوێنكەوتنیو پایەبەند بوونی مووبەموو بەرێو شوێنەكەیەوە.

---

(تێ) ئەو ڕووداوو هەڵوێستانەم هەموویان لە كتێبی (الشفاء...) وەرگرتوون كە پێشتریش ئاماژەم بە گشت بابەت و لاپەڕەكانی كرد.

دووەم: زۆر یادکردنیو باسکردنی بە چاکە، وەك بۆی شایستەیە.

سێیەم: تامەزرۆ بوونی دیداریو بەخزمەت گەیشتنی.

چوارەم: ڕێز لـێگرتنیو بە گەورەگرتنی - بەبێ تێپەڕاندن - لەکاتی ناوهێنانیداو سەڵەوات بۆ ناردنی.

پێنجەم: خۆشویستنی هەرکەسێك کە ئەو خۆشی ویستوە، لەبنەماڵەیو هاوەڵانیو، دۆستایەتی کردنی ئەوانەی ئەو دۆستایەتی کردوون.

شەشەم: بوغزاندنی هەرکەسێك کە ئەو بوغزاندوویەتیو، دوژمنایەتی کردنی ئەو کەسانەی کە ئەو دوژمنایەتی کردوون.

حەوتەم: خۆشویستنی قورئانو بە گەورەگرتنیو پایەندبوون بەیاساکانی یەوەو بەرگری لـێکردنی.

هەشتەم: خۆشویستنی سوننەتو پێوە پابەندبوونیو بەرگری لـێکردنی.

نۆیەم: بەزەیی هاتنەوە بە ئۆممەتەکەیداو کۆششکردن لە جێبەجێکردنی پێداویستییەکانیانداو پاراستنیان لە زەرەرو زیان.

دەیەم: دنیا بەکەمگرتنو زیاد لە ئەندازەی پێویست گرنگ پێنەدانی.

کەواتە: هەرکام لەم دە (١٠) مەرجو نیشانەیە، وە هەموو شیان ویکڕا وەك ئاوێنەیەك وان کە ئینسانی موسڵمان دەتوانێ خۆی تێدا ببینێو بزانێ داخۆ تا چ ڕاددەیەك لە دەعوای خۆشویستنی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) ڕاست دەکات، چونکە شتێکی مەحاڵو چاوەڕوان نەکراوە تۆ پێغەمبەرێکت خۆش بوێ، کە تایبەتیترین خەسڵەتی بریتییە لە سەرمەشق بوونو پێشڕەوبوونی بۆ خەڵکی، کەچی شوێنی نەکەویو مووبەموو شوێن پێی هەڵنەگری! وە زۆر جێی سەرسوڕمانە کە سێکت خۆش بوێ، کە باسکردنیو یادکردنی بەچاکە بە عیبادەت بۆت لە قەڵەم

بدرێ، بەڵام تۆ یادی نەکەی، یان کەمتەرخەمیی بکەی لە باسکردنو یادکردنیدا!! وە زۆر سەیرە کەسێکت لە ناخی دڵەوە خۆش بوێو عەودالٌو تامەزرۆی دیداریشی نەبی(تر)! وە هیچ ڕێی تێناچێو ناگونجێ کە سێکت لە هەموو شتێكو هەموو کەسو تەنانەت لە خۆشت خۆشتر بوێ، کەچی بەرێزو حورمەتو گەورەگرتنەوە ناوی نەیەنی! وە شتێکی زۆر نامەنتیقیە کە ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیت بۆ کەسێك هەبێ، بەڵام دۆستو خۆشەویستەکانی ویت خۆش نەوێن و، دوژمنو ناحەزەکانی نەبوغزێنیو، دۆستایەتی دۆستانیو دوژمنایەتی ناحەزانی نەکەی! دیسان خۆشویستنو ڕێزگرتن لە قورئانو سوننەتیش دوو نیشانە مەرجی خۆشویستنی پێغەمبەرمان (علیە الصلاة والسلام)ن، چونکە قورئان بەڕێزترینو خۆشویستترین شت بووە لەلای پێغەمبەرو، سوننەتیش شەرحو لێکدانەوەی ویە، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە دەڵێین بێگومان کەسایەتی پڕ ڕێزو حورمەتی پێغەمبەرمان (علیە الصلاة والسلام) پەیوەستە بە قورئانو سوننەتەوەو، لەواندا دەدرەوشێتەوەو ئینسانیش هەر شتێکی خۆشویست هەموو ئەو شتانەشی خۆش دەوێن کە پێیەوە پەیوەستن.

بەزەیی هاتنەوەش بە ئوممەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وآله وسلم)و هەوڵدان بۆ دابینکردنی سوودو بەرژەوەندی یەکانیانو، پاراستنیان لە گیروگرفتو ناخۆشیو زیانەکانیش، شتێکی سروشتیو چاوەڕوان کراوەو، مەرجو نیشانەیەکی پێویستە لە هەرکەسێکدا کە بەڕاستی پێغەمبەری

(تر) دەگێڕنەوە کە (بلال)ی حەبەشەیی (خوا لێی رازی بێ) گەیشتە حاڵەتی سەرەمەرگ، خێزانەکەی گوتی: (وا حزناه) ئەی خەم و پەژارە بۆ من! ئەویش گوتی: (بل وا طرباه غداً ألقى الأحبة محمداً وحزبه) بەڵکو ئەی خۆشحاڵی بۆ من! بەیانی بە دیداری خۆشەویستان دەگەم، موحەممەد و کۆمەڵەکەی!!.

خۆش بوێ، چونکە بەدەردی پێشینان دەڵێن (لە پەنا گوڵە گەنمێکی یەوە سەد گوڵە جۆ ئاوێ دەخۆنەوە)و (مِن أجلِ عَينٍ ألفُ عَينٍ تُ كرَمُ)! دن یا بەکەمگرتنو زیاد لە پێویست پ یێوە خەریك نەبوونیو گرن گی پێ نەدانیشی، لە سۆنگەی ئەوەوە کە خەسڵەتێکی هەرە ب نەرەتیو سەرەکی پێغەمبەرمان بووە، شتێکی یەکجار سروو شتیو مەنتیقیش لە هەر کەسێکدا کە ژیانی دنیا بە فۆناغی تاقیکرانەوە دەزانیو، بڕوای وایە کە ژیانی ڕاستەقینەو جێگای ڕابواردنو لەززەت وەرگرتنی تەواو تەنیا ژ یانی دوارۆژە، یەکی دیکە لە نیشانەو مەرجەکانی خۆشویستنی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) پێکـدێنێ.

لە کۆتایی ئەم باسەشدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ دوو مەسەلان بکەم:

یەکەم: ئینسان هەتا بە ب یـروبڕواو ژ یانو گوزەرانو ڕەو شتو ئا کاری پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئاشناتر بێتو چاکتر بینا سێ، زیاتر دەتوانێ بڕوای پێ بێنێو شوێنی بکەوێو قەدرو ڕ یێزی ب گرێو خۆشی بوێ، کەواتە بۆ بەهێزکردنو قووڵکردنەوەی ئەو خە سڵەتانە لە خۆماندا، با هەوڵ بدەین هەرچی زیاتر چاکتر بە بیرو بڕوای پێغەم بەرو مێژووی ژ یانیو هەڵوێ ستەکانیو شێوەی هەڵ سوکەوتیو ڕەو شتو ئاکاری، شارەزا بین.

دووەم: هەرچەندە هەرکام لە (بڕوا پێبوون)و(شوێنکەوتن)و(خۆشوی ستن) ئەركو مافی پێغەمبەرن ﷺ بەسەر شانی ئێ مەوە، بەڵام بێگو مان بەهرەمەندو سوود وەرگر (رابح)ی هەرە بەختەوەر لەو سەودایەدا هەر ئێمەین و، پشكو بەشی هەرە زۆری سوودو قازانجی ئەو سەودایە هەر بۆ خۆمان دەگەڕێتەوە، چونکە ئە گەر ئێ مەش خوانەخوا ستە بڕوا بە

پێغەمبەر نەیەنین‌و شوێنی نەکەوین‌و ڕێزی نەگرین‌و خۆشمان نەوێ، هیچ زیانی پێ ناگات‌و هەر پێغەمبەری خوایە!!



## ( خـالّـی چـوارەم ):-

# ئــــەم خـــاڵــــە

خوێنەری سەنگین!

ئەم خاڵــی چوارەمە بریتـ ـیە ـلە بەر سەرهاتێکی ـگرنگ ـکە وتوو ـێژ (حوار)ێکی گرنگی گرتۆتە ـخۆ کە ـلە ـنـ ـێوان (هـ ـیــرەقلّ) پاد شای رۆمو

(ئەبووسوفیان) ڕیش سپیو قسە ڕۆیشتووی قورەیشی‌یە بتپەرستو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان لەکاتی خۆیدا، ڕوویداوە، وە بە ڕاستی کۆمەڵێك بەڵگەو نیشانەی گەورەو گرنگی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران بە گشتیو بەتایبەتی پێغەمبەری کۆتایی (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا)ی تێدان، بەتایبەت ئەو نیشانەو بەڵگانەی کە خاوەن کتێبە پێشووەکان لەبارەی کۆتایی پێغەمبەران (خاتم النبـیـیّن)ەوە ﷺ زانیویانن، وەك خوای پەنهانزان فەرمووویەتی: ﴿الذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ وَإِنَّ فَرِيقاً مِنهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾[1]، واتە: ئەوانەی کتێبمان پێدابوون دەیناسن (واتە موحەممەد) وەك چۆن کوڕەکانیان دەناسن، وە بێگومان کۆمەڵێکیان هەق دەشارنەوە لە حاڵێکدا کە دەشزانن (هەقە).

ئێستاش تۆو ئەو بەسەرهاتە گرنگو پڕمانایە:

((روى البخاريُّ وَمسلمْ عن عبدالله بن عباس (رضي الله عنهما) أنَّ أباسفيان بن حَرْبٍ أخْبَرَهُ أن هِرَقْلَ أرْسَلَ اليه في ركْبٍ من قُرَيْشٍ وكانوا تجّاراً بالشام في المدّة التي كان رسول الله ﷺ مادَّ أباسفيان وَكفّار قُرَيْشٍ. فأتوه وهم بأيلياء، فدعاهم في مَجْلسِهِ وَحوله عُظماءُ الروم)).

ثم دعاهم ودعا بترجمانه فقال:

أيكم أقربُ نَسَباً بهذا الرَّجُل الذي يَزْعُمُ أنَّه نبيّ؟

قال أبوسفيان: أنا أقربهم نَسَباً.

فقال أُدنوه مِنّي، وقَرِّبوا أصحابه فآجعلوهم عند ظَهْرِهِ.

---

[1] (البقــرة 146).

ثم قال لِتَرْجُمانه: قل لهم: إني سائِلٌ هذا الرجل، فأن كَذَبَني فكَذِّبوه! فو الله لولا الحياء منْ أن يأثِروا عليَّ كَذِباً لكَذَبْتُ عنه.

ثم كان أول ما سألني عنه أن قال: كيف نَسبُهُ فيكم؟!

قلت: هو فينا ذونَسبٍ.

قال: فهل قال هذا القول أحدٌ منكم قَبْلَهُ؟!

قلت: لا.

قال: فهل كان من آبائه مِنْ مَلِكَ؟!

قلت: لا.

قال: فأشراف الناس يَتّبعونه. أم ضُعفاؤهم؟

قلت: بَلْ ضُعفاؤهم.

قال: أيزيدونَ أم ينقصون؟!

قلت: بل يزيدون.

قال: فهل يرتدُّ أحدٌ منهم سَخْطَةً لدينه بعد أنْ يَدْخُلُ فيه؟!

قلت: لا.

قال: فهل كنتم تتَّهمونه بالكذب قَبْل أن يقول ماقال؟

قلت:لا.

قال: فهل يغْدِرُ؟

قلت: لا، ونحن منه في مُدَّةٍ لاندري ماهو فاعلٌ فيها! ولم تمكِنّيّ كلمة أُدْ خِلُ فيها شيئاً غير هذه الكلمة.

قال: فهل قاتلتموه؟

قلت: نعم.

قال: فكيف كان قتالكم إيّاه؟،

قلت: الحرب بيْننا وبينه سجالٌ ينالُ منّا وَ نَنالُ منه.

قال: ماذا يأمركم؟

قلت: يقول: اُعبدوا الله وحده ولا تُشْركوا به شيئاً وآتركوا مايقول آباؤكم وَيأمرنا بالصلاة وَالصدق والعفافِ وَالصِّلة.

فقال للترجمانِ: قل له: سألتك عن نَسَبِه، فذكرت أنه فيكم ذو نَسَبٍ، فكذالك الرُّسُلُ تُبْعثُ في نَسَبِ قَوْمِها.

وَسألتك: هل قال أحدٌ منكم قال هذا القول؟ فذكرت أن لا، قلت: لو كان أحدٌ قال هذا القول قبله لَقُلْتُ: رجُلٌ يأتسي بقولِ قيل قبله.

وسألتك: هل كان من آبائه مَنْ مَلِكَ؟ فذكرت أن لا. قلت: فلوكان مِن آبائه مَنْ مَلِكَ، قلت: رجُلٌ يطلبُ مُلْكَ أبيه.

وسألتك: هل كنتم تتّهمونه بالكذب قبل أن يقول ما قال؟ فذكرت أنْ لا، فقد اعرف أنه لم يكن ليذر الكذب على الناس ويَكْذِب على الله!

وسألتك: أشراف الناس اتبّعوه أم ضُعفاؤهم؟ فذكرت أن ضعفاؤهُمْ آتبعوه، وهم اتباع الرُّسُلِ.

وسألتك: أيزيدون أم ينقصون؟ فذكرت أنهم يَزيدون، وَ كذلك أمرُ الأيمانِ حتى يَتِمَّ.

وسألتك: أيرتَدُّ أحدٌ سَخْطَةً لدينه بعد أنْ يَدْخُلَ فيه؟ فذكرت أن لا، و كذلك الأيمان حين تخالُط بشاشتُهُ القلوب.

وسألتك: هل يغدر؟! فذكرت أن لا، وكذلك الرُّسُلُ لاتَغْدِرُ.

وسألتك: بَما يأمركم؟ فذكرت أنه يأمركم أن تعـبدوا الله ولاتـ شركوا ـبه شيئاً، وينهاكم عن عبادةً الأوثان، ويأمركم بالصّلاة والصدق والعفاف.

فأن كان ما تقول حقاً، فَسَيَمْلِكُ مَوْضِعَ قَدميَّ هاتين! وقد كنت أعـ لَمُ أنَّه خارجٍ، لم أكُنْ أظْنُّ انه منكم.

فلو أنيّ أعْلَمُ أنيِّ أخْلُصُ اليه لَتَجشَّمْتُ لقاءه ولو كنت عنده لَغَـ سلْتُ عن قَدَمِه! ثم دعا بكتابِ رسول الله ﷺ الذي بَعثَ به دحْـ يةُ الى عـ ظيم بُصْرى فَدفَعَه الى هرقل.

فقرأه، فأذا فيه:

بسم الله الرحمن الرحيم

من محمدٍ عبدالله ورسوله الى هِرَقْلَ عظيم الروم. سلامٌ عـ لى من اتّـ بع الهُدىُ، أمّا بعد:

فأني أدعوك بدعايةِ الأسلام، أسْلِمْ تَسْلَمْ، أسْلِمْ يُؤتِك الله أجرك مَرتين فأنْ تولّيْتَ فأن عليك إثمُ الأريسيّين، و﴿ **قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلا نَعْبُدَ إِلا اللهَ وَلا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ** ﴾ (آل عمران 64).

فلمّا قال ما قال، وفَرَغَ من قِراءَةِ الكتاب، كَثُرَ عِندَهُ الصَّخَبُ وآرْتَفَعتِ الأصوات، وَأُخْرِجْنا.

فقلت لأصحابي حين أُخرجْنا: لَقَدْ أمِرَ أمْرُ أبن أبي كَبْشة، إنَّه يخافُهُ مَلِك بني الأصْغَر!

فما زِلْتُ مُوْقِناً أنه سَيَظْهر، حتى أدْخَلَ الله عَليَّ الأسلامَ!

وكان (ابن النّاطور) صاحِبُ إيلْياءَ وهرقْلَ سُقُفّاً على نصارى الشام يُحَدِّثُ أنَّ هِرَقْلَ حين قَدِم إيلْياءَ أصبح يَوْماً خبيث النّفسِ.

فقال له بعض بطارقته: قد إستنكَرْنا هيئتك!

قال إبنُ النّاطور: وكان هِرَقْلُ حَزّاءً ينظر في النّجوم.

فقال لهم حين سألوه: إني رأيت الليلة ـ حين نظرت في النّجوم ـ مَلِكَ الخِتانِ قد ظهر، فَمَنْ يَخْتَتِنُ من هذه الأمة؟!

قالوا: لَيْس يَخْتَتِنُ الاّ اليهود، فلا يُهِمَنَّكَ شَأْنُهُمْ وَاكْتُبْ الى مدائن مُلْكك، فيقتلوا مِنْ فيهم مِنَ اليهود!

فَبينماهم على أمرهم، أُتيَ هِرَقْلُ بِرَجُلٍ أرْسَلَ بهِ مَلِكَ غَسّان يُخْبِرُ عَنْ خَبَرِ رسول الله ﷺ .

فلمّا استَخْبَرَه هِرَقْلُ، قال: إذْهَبوا به فانظروا أمُخْتَتَنٌ هو أمْ لا؟!

فنظروا اليه، فحدَّثوه أنهُ مُخْتَتَنٌ!

وسأله عَن العرب، فقال: هم يختتنون.

فقال هرقل: هذا مَلِكُ هذه الأمة قد ظهر!

ثم كتب هِرَقْلُ الى صاحبٍ له بِرومية، وكان نظيره في العلم ... وَسارَ هرقلُ الــى حمص.

فَلَمْ يَرُمْ حِمْصَ حتى أتاهُ كتابٌ مِنْ صاحِبِه يوافق رأي هرقْلُ على خروج النبــيّ ﷺ وَأنّه نبــيّ!

فأذن هرقل لعظماءِ الروم في دسكرةٍ له بِحمص، ثم أمر بأبوابها فَغُلِّقتْ، ثم اطّلع فقال:

يامعشر الروم: هل لكم في الفلاح وَالرُّشْد، وأنْ يَثْبتَ مُلْكُكُمْ؟

فَتُبايعوا هذا النبــيّ؟!

فحاصوا حَيْصةَ حُمرِ الوَحْش الى الأبواب فَوجودَوها قَدْ غُلِّقَتْ، فلمّا رأى هرقْلُ نَفْرَتَهُمْ و أيسَ من الأيمان قال، ردُّوهم عَلَيَّ!

وَقال: إني قُلْتُ مقالتي آنِفاً أخْتَبِرُ بها شِدَّتكُمْ على دينكم! فقد رأيت! فسجدوا لَهُ، ورضُوا عَنْهُ، فكان ذلك آخِرُ شَأْنِ هِرَقْل))(تر).

جا خوێنەری بەڕێز!

من ئێستا ئەم بەسەرهاتە دەقاودەق وەردەگێڕمە سەر زمانی کوردیو پەندو عیبرەت لێوەگرتنەکەیشی بۆ خۆتو تێوەڕامانو بیرکردنەوەت لێ دەگەڕێم:

((بوخاریو موسلیم (خوا لێیان خۆش بێ) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ) دەگێڕنەوە کە ئەبوو سوفیان هەواڵی پێداوە، کە هیرەقل لەگەڵ کاروانێك لە قورەیشییەکان بە دوایدا ناردوە، لەوماوەیەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماوەیەك لە گەڵ ئەبووسوفیانو کافرەکانی قورەیش ڕێککەوتبوو بۆ بازرگانی چوونە شامێ، ئەوانیش لە (ئیلیاء) چوونە لای - کە گەیشتنە لای - بانگی کردنە نێوکۆڕەکەیەوە کە زلەزلانی ڕۆمیشی لە دەورە بوون، ئنجا بانگی کردنو بانگی وەرگێڕەکەیشی کردو گوتی:

کامەتان بەڕەچەڵەك لەو پیاوە نزیکترن کە پێی وایە پێغەمبەرە؟!

---

(تر) رواه البخاري، برقم (7)و برقم (4553)و اللفظ له، و رواه مسلم برقم (1773)، بڕوانە (صحيح مسلم)، ص (976 – 978).

ئەبووسوفیان دەڵێ: منیش گوتم: من لە هەموویان بەرە چەڵەك لـ ێی نزیکترم، هیـرەقل گوتی، لێمی نزیك بخەنەوەو هاوەڵەکانیشی نیزیك بخەنەوەو لە پشتیەوە دایانبنێن، ئنجا بە وەرگێرەکەی گوت، پێیان بڵێ: من دەر بارەی ئەو پیاوە پرسیار لەم (ئەبووسوفیان)ە، دەکەم جا ئەگەر درۆی لەگەڵ کردم، ئێوەش بە دۆری بخەنەوە، ئەبووسوفیان دەڵێ، بە خوا ئەگەر لە شەرمی ئەوە نەبووایە کە درۆم لـێ بگێرنەوە درۆم لە بارەیەوە دەکرد!

ئنجا یەکەمین شت کە لێی پرسیم لەوبارەوە ئەوەبوو کە گوتی، رە چەڵەك (نَسَبْ)ی لە نێوتاندا چۆنە؟!

گوتم: ئەو خاوەن وەجاخە لە نێوماندا (واتە رەچەڵەکی بەرزە) .

گوتی: ئایا هیچکەس لە ئێوە لە پێش ویدا ئەم قسەیەی کردوە؟

گوتم: نەخێر.

گوتی: ئەدی هیچ کام لە باب و باپیرانی حوکمران بوونە؟

گوتم: نەء.

گوتی: باشە خەڵکی پلەو پایەدار شوێنی دەکەون یان بێهێزەکانیان؟

گوتم: بەڵکو بێهێزەکانیان.

گوتی: زیاد دەکەن، یان کەم دەکەن؟!

گوتم: بەڵکو هەرزیاد دەکەن.

گوتی: ئایا کەسیان هەیە دوای ئەوەی دەچێتە نێو ئایینەکەیەوە لە رووی بێزارییەوە پاشگەز بێتەوە؟

گوتم: نەء.

گوتی: ئایا بەرلەوەی ئەوەی دەیڵێ بیڵێ، درۆتان دەدایە پاڵـی؟

گوتم: نەء.

گوتی: ئایا پەیمان دەشکێنێ؟

گوتم: نەء، بەڵام پەیمانێکمان لە نێواندا هەیە نازانین چی تێدا دەکات.

(ئەبوو سوفیان) گوتی: هیچ قسەیەك نەبوو كە بتوانم شتێکی ڕەگەڵ بخەم بێجگە لەم قسەیە!

گوتی: ئایا تا ئێستا لەگەڵی بەشەڕ هاتوون؟

گوتم: بەڵێ.

گوتی: جەنگەکەتان لەگەڵی دا چۆن بووە؟

گوتم: جەنگ لەنێوانماندا بە نۆرەیە لێمان دەباتەوەو لێشی دەبەینەوە(تر).

گوتی: بەچی فەرمانتان پێدەکات؟

گوتم: دەڵێ، خوا بە تاکیی بپەرستن هیچ شتێك مەکە نە هاوبە شی، وە وازلەوە بێنن کە باب‌و باپیرانتان دەیانگوت، وە فەرمانمان پێ دەکات بە نوێژو ڕاستیی‌و پاکیی‌و خزم دۆستیی.

ئنجا بە وەرگێرەکەی گوت:

پێی بڵێ: لەبارەی ڕەچەڵەکی‌یەوە پرسیارم لێکردی، باستکرد کە خاوەن وەجاخە، هەروەها پێغەمبەران لەوەجاخ ـ ی بەرز ـ ی گەلەکانیاندا دەنێررێن.

وە لێم پرسی: کە ئایا لەپێش ویدا هیچکەس لەئێوە شتێکی وای گوتوە؟

گوتت: نەخێر، گوتم ئەگەر کەسێك لە پێش ویدا شتێکی وای گوت بێ، وادیارە لاسایی قسەیەك دەکاتەوە کە لە پێش ویدا گوتراوە.

---

(تر) (سجال) لە (سجل)ەوە هاتوە کە بە دۆلکەی ئاو هەڵهێنجان لەبیر دەگوترێ، واتە بە نۆرەیە وەك چۆن دۆلکەی ئاو هەڵهێنجان نۆرەو دەست‌و دەستی پێدەکرێ، بڕوانە: (فتح الباری) ب (1)، ل (29).

وە لێم پرسی: کە ئایا هیچ کام لە باب‌و باپیرانی حوکمڕانیی یان کردوە؟
گوتت: نەء، گوتم (ئەگەر وابایە) ڕێی تێ دەچێ کەداوای مولکی باب‌و باپیرانی بکاتەوە.
وەلێم پرسی: ئایا بەرلەوەی ئەم دەعوایە بکات درۆتان پێوەشك بردوە؟
گوتت: نەء، دەجا من دەزانم کە ناگونجێ درۆ لەگەڵ خەڵکی نەکات، بەلام درۆ بە ناوی خواوە بکات!
وە لێم پرسی: کە ئا یا خەڵکی پلەوپا یەدار شوێنی دە کەون یان بێهێزەکانیان؟! گوتت: بێهێزەکان دوای کەوتوون. دیارە هەر ئەوانیش شوێنکەوتووی پێغەمبەرانن.
وە لێم پرسی: ئایا زیاد دەبن یان کەم دەکەن؟ باستکرد کە ز یاد دە کەن. دیارە ئیمانیش هەروایە هەتا تەواو کامل دەبێ!
وە لێم پرسی: کە ئایا هیچ کامیان دوای ئەوەی دەچێتە نێو ئایینەکە یەوە لێی بێزار دەبێ‌و هەڵدەگەڕێتەوە؟ گوتت: نەء، دەجا ئیمان کە ڕووناکیی یەکەی دەچێتە دڵانەوە هەروایە.
وە لێم پرسی: کە ئایا پەیمان دە شکێنێ؟ گو تت: نەء، هەر ئاواش پێغەمبەران پەیمان ناشکێنن.
وە پرسیارم لێکردی: کە ئایا فەرمانتان بەچی پێدەکات؟ باستکرد کەوا فەرمانتان پێدەکات کە خوا بپەرستن‌و هاوبەشی بۆ دا نەنێن، وە پەر ستنی بتانتان لێ قەدەغە دەکات، وە فەرمانتان پێدەکات بە نو یژو ڕا ستیی‌و پاکیی.

جا ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێی ڕاست بێ، ئەوە شوێن ئەم دوو پێیەی منیش دەگرێ، وە من مسۆگەر بووم کە پەیدا دەبێ بەڵام پێم وانەبوو کە لەنێو ئێوە دەبێ.

بێگومان ئەگەر زانیبام دەتوانم خۆمی بگەیەنمێ ڕەنجی دیداریم قبووڵ دەکرد، وە ئەگەر لە خزمەتیدا بام پێیەکانیم دەشۆری!

ئنجا هیرەقل داوای ئەو نامەیەی پێغەمبەری خوای کرد ﷺ کە بە (دحية)دا بۆ گەورەی (بُصْری)ی ناردبوو ئەویش وە هیرەقلی دا، ئنجا خوێندیەوە ئەمەی تێدابوو:

بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، لە موحەممەد بەندەو ڕەوانەکراوی خواوە بۆ هیرەقڵ مەزنی ڕۆم، سڵاو لەو کەسەی کە بە دوای ڕێنمایی ـ خوا ـ دەکەوێ، دوای سڵاو، بێگومان من بەرەو بانگەوازی ئیسلام بانگت دەکەم، مسوڵمان ببە سەلامەت دەبی، خوا دووقات پاداشتت دەداتەوە، بەڵام ئەگەر پشتت لە ڕێنمایی خوا کرد ئەوە گوناهی جوتیارەکان[تر]، لە ئەستۆی تۆیە، وە ((ئەی خاوەن کتێبەکان وەرن بەرەو وشە (پەیام)ێك کە بۆ ئێمەو ئێوە وەك یەکە: کە جگە لە خوا نەپەرستین و هیچ شتێکی نەکەینە هاوبەش، وە هەندێکمان هەندێکمان لە جیاتی خوا نەکەینە گەورەو سەروەر، جا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە بڵێن: شایەدیی بدەن کە ئێمە مسوڵمانین)).

ئەبووسوفیان دەڵێ:

(تر) (الأريسيين) کۆی (أريس)ەکە بە (فلاّح و أکار) ماناکراوە، واتە: جوتیار، بڕوانە: (فتح الباري) ب (1)،ل (32،33).

دوای ئەوەی ئەوەی گوتی، وە لە خوێندنەوەی نامەکە بۆوە، بۆڵەبۆڵ لەلای زۆر بوو وە دەنگەکان بەرز بوونەوەو ئێمە یان وەدەرنا.

جا کاتێك وە دەرێ نراین بە هاوەڵەکانم گوت: ئیشی کوڕی ئەبوو کەبشە، بەهێز بووە، چونکە پادشای ڕۆمەکان لێی دەترسێ، جا لەوکاتەوە من دڵنیابووم کە سەردەکەوێ، هەتا خوا ئیسلامەتی بەسەردا هێنام!

وە (ابن النّاطور) کە هاوەڵی ئیلیاءو هیرەقلْ بووو (ئەسقەف) بوو بە سەر نەصرانییەکانی شامەوە، دەیگێڕایەوە کە کاتێك هیـرەقلْ هاتوە بۆ ئیلیاء ڕۆژێکیان بێ خولْق بووە جا هەندێك لە پیاوە ئایینییەکانی پێیان گوت: شێوەت بۆ واگۆڕاوە؟

(ابن الناطور) دەڵێ: وە هیـرەقلْ فاڵچی (کاهن) بوو تەماشای ئەستێرانی دەکرد، جا کاتێك لێیان پرسی، گوتی: من ئەمشەو کە سەرنجی ئەستێرانم دابینیم کە گەورەی ـ ئۆممەتی ـ خەتەنەکراو دەرکەوتوە، جا ئایا لە خەڵکی ئەم ڕۆژگارە کێ خۆی خەتەنە دەکات؟

گوتیان: جگە لە جوولەکەکان کەس خۆی خەتەنە ناکاتو خەمیان لێ مەخۆ بنووسە بۆ شارەکانی وڵاتت کە هەر چی جوولەکەیان لە نێویاندا هەموویان بکوژرێن!

جا کاتێك ئەوان سەرگەرمی ئەمە بوون پیاوێکیان هێنا بۆ لای هیـرەقلْ کە حوکمڕانی غەسسان ناردبووی هەواڵی دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدا، جا دوای هیـرەقلْ هەواڵەکەی لێ وەرگرت، گوتی: بیبەن تەماشا بکەن داخۆ خەتەنە کراوە یان نا؟!

کە تەماشایان کرد گوتیان: خەتەنە کراوە!

ئنجا لەبارەی عەرەبەوە پرسیاری لێکرد، گوتی خۆیان خەتەنە دەکەن.

هیرەقلیش گوتی: ئەمە دەستەلاتی خەلکی ئەم رۆژگارە یە دەر کەوت، پاشان هیرەقل نامەی بۆ برادەرێکی نووسی کە لە (رۆما) بوو وە لە زانیاریدا هاوتای بوو، وە هیرەقل بەرەو (حمص) رۆیی.

ئیدی هیرەقل (حمص)ی بەجێنەهێشت کە نامەی برادەرەکەی بۆ هات کە لەبارەی دەرچوونی پێغەمبەرەوە ﷺ رای وەك هی هیرەقل بوو کە پێغەمبەرە.

ئنجا هیرەقل گەورەکانی رۆمی لە هۆلێکدا لە (حمص) خڕکردنەوەو دەرگاکانیشی لەسەر گالەدان، پاشان لەسەرێوە بۆی روانین‌و گوتی: ئەی خەلکی رۆم! دەتانەوێ سەرفرازیی‌و سەرەنجام خێریتان چنگ بکەوێ وە دەستەلاتیشتان بۆ بچەسپێ، وە ئیمان بەم پێغەمبەرە بێنن؟!

ئیدی ئەوانیش وەك رەوەی کەرەکێوی سلەمینەوەو بەرەو دەرگاکان چوون تەماشایان کرد داخرابوون!

جا کاتێك هیرەقل ئەو بێزاریی‌یەیانی بینی‌و نائومێد بوو لەوەی کە ئیمان بێنن.

گوتی: بیانگێرنەوە بۆ لای! وەگوتی: من ئەو قسەیەی پێشێ کردم تاقیم کردنەوە داخۆ لە دینتاندا توندو تۆلن!، جا ئەوە بینیم!

ئەوانیش سەجدەیان بۆبرد لێی رازی بوون، وە ئەمە دواهەوالی هیرەقل بوو.

لێرەش دا کۆتایی بەم خالی چوارەمە دێنین‌و بەرەو خالی پێنجەمو

# ئـــەم خـــاڵـە

خوێنەری خۆشەویست!

ئەم خاڵی پێنجەمو کۆتاییی‌یەی ئەم بەندی سێیەمە بریتیە لە خستنەڕووی دەبەرێك ڕاچوونو تووێژێکی یەکجار گرنگی نێوان پێغەمبەرانی خوا ( صلی الله تعالى عليهم وسلم)و سەرانی کوفر (الطواغيت)، ئەویش لەبەر تیـ شکی نۆ (9) ئایەتی بەهێزوپێزی قورئانی بەرێزدا کە ئایەتەکانی (9 تا 17)ی سوورەتی (إبراهيم)ن.

دیارە ئێمە تەفسیرو لێکدانەوەی ئایەتەکانی دابەش دە کەین بۆ چەند برگەیەكو لە ژێر چەند ناوونیشانێکدا پێشکەشی دەکەین.

جا هیوادارم کە زۆر بە وردیی‌و ئارامیی تێیەوە ڕابـمێنیو زۆر بە قووڵیی سەرەنجی تابلۆو دیمەنە دڵبزوێنەکانی ئەم وتووێژەی نێوان بەرەی ئیـمان، بە سەرکردایەتی پێغەمبەرانی خوا ﷺو بەرەی کوفر بە سەرکردایەتی طاغووتە یاخییو خۆبەزلگرەکان بدەی و سەرەنجام چەندان پەندو عیـبـرەتی گەورەو گرنگی لـێ دەستگیر بکەی.

خوێنەری بەڕێز!

هەموو چیـرۆكو بەسەرهاتو وتووێژەکانی قورئان گرنگو بایە خدارنو، پڕپڕن لە پەندو حیکمەت، بەڵام گرنگیو بایەخی تایبەتی ئەم بە سەرهاتو دەبەرێك ڕاچوونە لەوەدایە کە بریتیە لە ململانێو وتووێژی هەموو ( حق)

لەگەڵ سەرجەمی (باطل)دا، بەڵێ هەموو هەق لە پێغەمبەرانی خوادا کورت کراوەتەوەو (باطل)یش هەمووی بە باڵای سەرانی کوفر بڕراوە، کەوابێ ئەم ململانێو گفتوگۆیە، کە لە نێوان هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و سەرانی کوفردا رووی داوە، بە زۆرانبازیی‌و وتووێژی نێوان هەق‌و ناهەق دادەنرێ.

دیارە مەبەستیشمان لە خستنەڕووی ئەم دەبەرێك ڕا چوونە ئەوەیە کە هەرچی زیاتر کەسایەتی پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا (علیهم الصلاة والسلام) بناسین‌و، پتر تیشك بهاوێینە سەر بانگەوازە بەرزو پیرۆزەکەیان، ئیدی ئەتۆو ئەو وتووێژە گرنگ‌و مەزنە: خوای بەرزو مەزن‌و بێوێنەو هاوەڵ‌و تاك‌و پاك فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى قَالُوا إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا تُرِيدُونَ أَنْ تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ ۞ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِنْ نَحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَمَا كَانَ لَنَا أَنْ نَأْتِيَكُمْ بِسُلْطَانٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ۞ وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَى مَا آذَيْتُمُونَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ ۞ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ ۞ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الْأَرْضَ مِنْ بَعْدِهِمْ ذَلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ۞ وَاسْتَفْتَحُوا وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ۞ مِنْ وَرَائِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَى مِنْ مَاءٍ

صَدِيدٍ ۞ يَتَجَرَّعُهُ وَلا يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِنْ وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾(1).

لەم ئايەتانەدا خواى كاربەجىٚ سەرگوزشتەو بەسەرهاتى تىٚكڕاى پێغەمبەرانمان بە گشتى بۆ دەگێڕێتەوە، هەر لە نووحەوە (عليه السلام) بيگرە هەتا هەموو ئەوانەى كە لەپاش وى هاتوون كە بێجگە لەخوا كەس بەتەواوى زانيارى دەربارەيان نيە، كەواتە ئەوەى كە لە دوو توىٚى ئەم كۆمەڵە ئايەتەدا ڕاگەيەنراوە سەبارەت بە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) چەند ياسايەكى بنەڕەتىو سەرەكين كە هەموو ئەو زاتە بەرزو پيرۆزانە تێيياندا هاوبەشن بىٚ جياوازى.

جا ئێستا با ناوى خواى لىٚ بێنينو ئەم نۆ (9) ئايەتە بەپێزە بكەينە بابەتى تێفكرينو سەرنجدانێكى وردو قووڵو، بزانين دا خۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) چۆن لەگەڵ مرۆڤايەتيدا بەگشتىو سەرانى كوفر بە تايبەتى ڕووبەڕووبوونەوەو چىيان گوتوەو چىيان پىٚ بووەو چى يان لە نێواندا ڕابردوەو سەرەنجامى هەردووك لايان بە چ گەيوە؟!

خواى بەرزو مەزن لە سەرەتاوە ڕوومان تىٚدەكاو دەفەرمووىٚ: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لا يَعْلَمُهُمْ إِلاَّ اللَّهُ﴾ (ئايا هەواڵى ئەو ـ گەل ـ انەى پێش خۆتان پىٚنەگەيوە، گەلــى نووحو گەلى عادو گەلى سەمود، وە ئەوانەى دواى وان كە جگە لە خوا كەس نايانزانىٚ).

ئنجا بىٚئەوەى چاوەڕىٚى وەڵامى ئێمە بكات، چونكە بۆ خۆى چاكتر دەزانىٚ كە بەسەرهاتى ڕابردووان مەگەر لە هەگبەى زانيارى بىٚ سنوورى خوادا

(1) (ابراهيم 9ـ17).

پارێزرابێ، دەنا هیچ کەس شـــارەزاییەکی ڕاسـتو درو ستی لەوبارە یەوە نیە ، دەفەرمووێ: ﴿جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ﴾ (پێغەمبەرانیان بە بەڵگەوە هاتنە لایان).

لەم ڕستە[تر] بە بڕستەوە دەزانرێ کە سەرەکیتـرینو زەقتر ین خە سڵەتو نیشانەی پێغەمبەرانی خوا ئەوەیە کە خودا بەڵگەو موعجیزە یەکی وا یان دەداتێ کە بشێ پاڵپشتیی دەعوای پێغەمبەرایەتی یە کەیانی پێ ب کەنو بیکەنە شایەدیی ڕاستیو تەواویی بانگەوازە کەیان چونکە پ لەو پا یەی پێغەمبەرایەتی (النبوة) پلەوپایەیەکی یەکجار بەرزو گەورەیەو حەتمەن دەبێ هەرکەسێك ئەو پلەوپایە بەرزەی پێ بەخشرا درووشمو نیشانەیەکی وای هەبێ کە پێیەوە بناسرێ، بۆ ئەوەی ڕێ گە لە کە سانێکی درۆزنو هەلپەر ستو خۆبەزلگرو خەڵك فر یودەر ب گیرێ کە بەنا هەق لا فی پێغەمبەرا یەتی لـێدەدەن، وە هەرکاتێکیش لافێ کی وا یان لـێدا، بێبەڵ گەییو بێموعجیزەیی ڕیسواو شەرمەزاریان بکاتو خەڵکیان لـێ تێبگەیەنێ.

ئنجا خوای زا نا بەر لەوەی بێ تە سەر خ ستنەڕووی ۆ سەو پەیامی پێغەمبەران کە بە خەڵکیان ڕاگەیا ندوە[یر]، یەک سەر بۆ پێ شاندانی

(تر) هەروەها لەم ڕستەیە ئەوەش دەفامرێتەوە کە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بە دوای خەڵکیدا عەودالْ بوونو ئەوان دەچوونە لای خەڵکی (جائتهم رسلهم) نەك وەك گەلێك خۆ بە جێگرو میراتگری پێغەمبەر زانی ئەم سەردەمە لە ماڵی لێی پاڵ بداتەوەو چاوەڕێی خەڵکی بکات دا خوا کەنگێ پرسیارێکی لێ دەکەنو پرسو ڕایەکی پێ دەکەن!! چونکە بابای کڕیار بە دوای شتی دا دەڕواتو خۆی ماندوو دەکات.

(یر) هۆی ئەمەش ئەوە یە کە ئە ندازەی سەرەخەریو دژا یەتیو نا حەزیی بێ بڕوا یان سەبارەت بە پێغەمبەران بخا تەڕوو، چونکە ئەم تەعبیرو شێوازە وادەگە یەنێ کەبێ بڕوایان هیچ دەرفەتی پێغەمبەرانیان نەداوەو یەکسەر دوای هاتنیان دەستیان بەزاری یەوە ناون چونکە بە ئیحتیمالی زۆر نیزیك (ف)ی سەر وشەی (فردّوا) بۆ بەدواداهاتن (تعقيب)ە.

هەڵوێستی ناحەزانەو سەر ڕەقانەی گەلەکانیان‌و دەفەرموێ: ﴿فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ﴾ (یەکسەر ـ زلەزلەکانیان[تر] ـ دەستیان بە زاریانەوە نا) لێرەدا دەست بەزاری یەوەنان، ئەگەر ڕواڵەتەکەی مەبەست بێ دوو واتایان هەڵدەگرێ:

1 ـ دەستیان بەزاری خۆیانەوە نا، جا بە مەبەستی گاڵتەکردن بە پێغەمبەران بووبێ ـ وەك فیتوو کێشان‌و جرت لێدان ـ یان بە مەبەستی نارەزایی دەربڕین‌و سەرسامی دەربڕین بووبێ.

2 ـ دەستیان بەزاری پێغەمبەرانەوە نا، واتە نەیانهێشت پەیامی خۆیان ڕابگەیەنن وڕێی قسەکردنیان نەدان، یان ئیشارەیان بۆ کردن کەبێ دەنگ بن.

وە ئەگەر ئەم ڕستەیە ڕواڵەتەکەی مەبەست نەبێ، ئەوە دەست بە زارەوەنانە کە بە (مجاز) بەکارهێنراوە بۆ پیشاندانی ئەندازەی سەرسامیی‌و ڕق هەستان‌و بێزاریی سەرانی کوفر، یان هەوڵ دان یان بۆ کپ کردنەوەی بانگەوازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و ڕێگە نەدانیان بۆ قسەکردن‌و ڕاگەیاندنی ئەو پایەمەی پێیاندا نێرراوە.

ئنجا پاش ئەوەی هەڵوێستی بێبڕوایانی لە دیمەنێکی وادا خستەڕوو کە ئەوپەڕی بێ شەرمی‌و بێ ئەدەبی یان دەگەیەنێ، هەڵبەتە بێ شەرمی‌و بێ‌ئەدەبی‌و ڕەفتار دزێویش هەموو دەمێ نیشانەی زەقی بێبڕوایان بووە بە

---

(تر) هەرچەندە لەم ئایەتانەدا بەگشتی باس لەو گەلانە دەکرێ کە پێغەمبەرانیان بۆ نێرراون، بەڵام (القرآن يفسر بعضه بعضاً)و لەسەر لەبەری قورئانیشدا ئەو جۆرە هەڵوێستانە بەهی (الملأ)و (المستكبرين) دانراون‌و، خەڵکە سادەکە ئەوەی لە توانادا نەبووە کە هەڵوێستێکی ئاوا بنوێنن.

تایبەتی زلەزلەکانیان، بەڵێ دوای ئەوەی هەڵوێستو تێڕوانینی خوارو خێچو سەر ڕەقانەی بێبڕوایان سەبارەت بە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) دەخاتەڕوو، دەفەرمووێ: ﴿وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ﴾ (وە گوتیان ئێمە بڕوا بەوە ناکەین کە ئێوە پێی ڕەوانکراون، وە بەڕاستی ئێمە لەبارەی ئەوەوە کە ئێمەی بۆ بانگ دەکەن لە گومان داینو دوو دڵین).

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە سەرانی کوفر پاش ئەوەی بەخەستی بێبڕوایی خۆیان دەردەبڕن لەبارەی بانگەوازی پێغەمبەرانەوە، دەڵێن: وە ئێمە لەبارەی بانگەوازەکەتانەوە دوو دڵینو لەگومان داین! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەبیری بێبڕواییو بێدینی هیچ کاتێك مرۆڤ تێیدا ناگاتە پلەی یەقینو دڵ دامەزران، بەڵکو بابای بێبڕواو دژئایین لەکاتێکدا دەگاتە لووتکەی هەرەبەرزی بیری ڕزیوو تەپیوی بێبڕوایی، ئنجا لە گێژی گومانو دوو دڵیدا دەخولێتەوەو سەرسوورەکەی دەگاتێ!

هۆی ئەمەش ئەوەیە کە بیری بێبڕوایی شتێکی نامۆو نەگونجاوە لەگەڵ سروشتی مرۆڤداو دژی واقیعی شتانە!

بەڵێ لە ڕاستیدا بێ بڕوایی‌و خوانەناسیی شتێکی بێڕەگو ڕیشەو بێبنچینەیە لە سروشتی مرۆڤو بوونەوەرداو، شتێکیش دژی عەقڵو سروشت (فطرة)ی ئینسان بێ، بەڵگە پشتیوانی لێ ناکەنو، مرۆڤیش قەت قەت لە شتێکدا ناگاتە پلەی دڵنیابوونو دڵ دامەزران کە لە دنیای بەڵگاندا بێبەشەو لە لای عەقڵو سروشت ڕووڕەشەو سەربەهەشە.

## وەڵامدانەوەی پێغـەمبـەران

ئنجا دێتە سەر وەڵامدانەوەو پەیام راگەیاندنی پێغەمبەرانو دەفەرمووێ: ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ؟!﴾ (پێغەمبەرەكانیان گوتیان: ئایا لە بوونی خوای بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەویدا گومان هەیە؟!).

لێرەدا دەبینین كە پێغەمبەرانیژیرو لێزان (علیهم الصلاةوالسلام) توند بەرۆكی بێبڕوایان دەگرنو نایەڵن بەملاو لایاندا وەك ڕێوی فێڵباز قۆرتو پێچان بكەنو دەیانبەنە سەر ئەسڵـی مەبەست كە خواناسینە، چونكە بیروباوەڕی ئیسلامی بیروباوەڕێكە لەسەر بنچینەی عەقڵو زانستدا مەزراوە وەك چەند ئاڵقەی زنجیـرێك هەركام لە بەندەكانی توند لەوی دیكە قایم كراوەو، بڕواهێنان بە یەكەمیان، بە شێوەیەكی سروشتیو مەنتقی پەلكێشت دەكات بۆ بڕواهێنان بەوەی دوای خۆی، وە هەروەها، مادام وابێ هیچ ماقووڵ نیە هەتا یەكێك نەگەیەنیە قەناعەتو دڵنیایی سەبارەت بە یەكەمین ئاڵقەی ئەو بیروباوەڕە، بچیە سەر توێژینەوەی ئاڵقەكانی دیكە، چونكە لە حاڵێكی وادا ماندووبوونت بێ سوودەو ئەگەر گریمان بێ سوودیش نەبێ ڕێیەكی زۆر زەحمەتت گرتوەو ژیرانەو لێزانانە دەستت پێ نەكردوە.

ئنجا با ڕامێنین! پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) روو حەم فیدایان بێ، چەند كارزانانەو ژیرانە مەسەلـەی بڕوا بە خوابوون دێننە پێش: (ئایا لە بوونی خوای بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەویدا گومان هەیە؟)، وەك دەبینین ئەم شێوازە (هجومی) هێرش بەرانەیە نەك (دفاعي) بەرگریكەرانە، بەڵێ بیری ڕاستنی خواناسی تۆمەتبار (متَّهم) نیە تا بەرگری لـێبكەین، بەڵكو بیری

بێباوەڕیو خوانەناسی تاوانبارو بێجێو ناماقووڵەو شایستەی هێرش کرا نە سەرو سەر کوتانە، جا بێگومان ئەم شێوازەش سەرکەوتووترین شێوازە لە وتووێژو گفتوگۆودا، چونکە تۆ هەر لە سەرەتاوە بەهێزیی‌و پتەویی بیروباوەڕەکەتو بەهێزیو هیچ لە دەست نەهاتوویی بیری بەرانبەرە کەت دەخەیەڕوو!!

ئنجا با سەرنج بدەین!

ئەم قسەیەی پێغەمبەران: (ئایا بوونی ... هتد) خۆی لە خۆیدا سێ ئەرکان ئەنجام دەدات، بەم شێوەیە:

1 ـ وەڵامە بۆ هەڵوێستو قسەی بێشەرمانەی بێبڕوایان.

2 ـ پرسیارێکی هێرشکەرانەیەو وەك فیشەکێك ئاڕاستەی بیری رزیوی بێبڕوایی کراوە، کە مادام لەبوونی خوادا گومان نەبێ، زمان دریژیی بێبڕوایان بێجێیە.

3 ـ وە لە هەمان کاتیشدا پتەوترین بەڵگەی مەنتیقیو عاقڵانەی تێدایە لەسەر سەلماندنی بوونی خوا، چونکە پاش ئەوەی فەرموویەتی: ﴿أَفِي اللَّهِ شَكٌّ﴾، وەسفی خوای کردوە بە: ﴿فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾، کەواتە لە بوونی خوادا گومانو دوو دڵیی ڕێی تێنا چێ، چونکە ئاسمانەکانو زەوی حەوجێی بەدیهێنەرنو لە خواش بترازێ هیچ شتێکی دیکە لە بەدیهێنەرایەتی بوونەوەر ناوەشێتەوە.

ئاسمانەکانو زەوی حەوجێی بەدیهێنەرن، چونکە بەپێی لێکدانی بڕوادارو بێبڕوایان، ئاسمانەکانو زەوی هەربوو (أزلي) نینو پەیداکراون، ئنجا بەپێی یاسای هۆکاریی (قانون السببية) یش هەموو پەیدابووێك پەیدا کەرێکی

هەیەو، بوونەوەریش مادام پەیداکراوبێ حەوجێی پەیداکەرە، ئەو پەیداکەرەش حەتمەن دەبێ غەیری بوونەوەر بێ، غەیری بوو نەوەریش خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارە، هەڵبەتە ئێمە لێرەدا نامانەوێ ئیسپاتی بوونی خوا بکەین، چونکە توێژینەوەی ئەو مەسەلەیە پێویستی بە کتێبی تەرخان کراو هەیە[تر].

**پێغەمبەران ئامانجی خۆیان ڕادەگەیەنن :-**

ئنجا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دوای چەسپاندنی ئەسڵو بنچینەی پەیامو بانگەوازەکەیان دێنە سەر باسی خستنەڕووی ئامانجو مەبەستی خۆیانو بانگەوازەکەیانو دەفەرموون: ﴿يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ (ـ خوا ـ بانگتان دەکات تا تاوانەکانتان بۆ بپۆشێو هەتا کاتی دیاری کراو دواتان بخات).

بەڵێ ئامانجو مەبەستی پێغەمبەرانو ئەو پەیامەی هەڵیانگرتوە، ئەوەیە کە بەندەکان، خوای میهرەبانو باڵادەستی خۆیان بناسنو بەندایەتی بۆ بکەن، بۆ ئەوەی وەبەر بارانی ڕەحمەتو بەخشندەیی خوا بکەونو مەیدانی تاقیکردنەوەی ژیانی دنیا بەسەلامەتیو سەربەرزی ببڕنو لەسزاو ئەشکەنجەی دادگەرانەی خودا چەپاڵەدراوبن.

کەواتە کە خوای بەخشندەو کاربەجێ پێغەمبەرانی ڕەوانە دەکاتە لای خەڵکی لەبەرئەوە نیە کە خوا ـ پاکی بۆ وی ـ حەوجێی خەڵکی بێت، یان

(تر) کە بەرگی دووەمی ئەم زنجیرە دەرسەی بۆ تەرخان کراوە هەروەها لە ئاڵقەی یەکەمی زنجیرەی (دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان)یشدا هەر قسەی لێکراوە، وە کتێبی (گەورەترین ڕاستی) دا کە دوایی لەژێر ناوونیشانی (خواناسیی، ئایین، ئیمان)دا چاپ کراوە، چاپی یەکەم ساڵی (2000) نوسینگەی تەفسیر. بە درێژی باس لەو مەسەلەیە دەکات.

پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) چاویان بڕیبێتە تەماعو بەرژەوەندی یەکی دنیایی کە لە دەست خەڵکی دایە، بەڵکو مەسەلە ئەوەیە کە خوا (جل جلاله) بەخشندەو چاکەکارەو حەزناکات بەندەکانی ڕێیان لێ تێك بچێو تووشی ئازارو ئەشکەنجەی خوا ببنو پێی خۆشە هەموویان خواناسانەو چاکەکارانە بژین، بۆ ئەوەی لەوە بوەشێنەوە کە بچنە بەهەشتی بەرینەوەو بە ڕەزامەندیی خوا شادبن.

## زلەزلانو سەرانی کوفر دەست دەکەن بە بەهانەگرتن :-

ئنجا بەرلەوەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) قسەکەیان تەواو رابگەیەنن، سەرانی کوفر بێشەرمانە قسەکەیان پێ دەبڕن:(تر) ﴿قَالُوا إِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُنَا تُرِيدُونَ أَنْ تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾ (گوتیان ئێوە بەس مرۆڤێکی وەك ئێمەن، دەتانەوێ لەوەمان لابدەن کە بابو باپیرانمان دەیانپەرستن، جا بەڵگەیەکی ڕوونمان بۆ بێنن).

وەك گوتمان دوای ئەوەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتنە گۆو دەستیان کرد بە گەیاندنی ئەو بانگەوازو پەیامەی پێیی ڕەوانەکراون، بێبڕوایانی خۆبەزلگر زۆر بێئەدەبانە چەڵتووکیان تێهاویشتو قسەکەیان پێ بڕین، جا با بزانین داخۆ ئەو سەر ڕەقانە چ برو بەهانەیەك دێننەوە بۆ بەرپەچدانەوەی پێغەمبەرانی خواو پاشەخۆدانی پەیامو بانگەوازەکەیان؟

(تر) قسە بەخەڵکی بڕین لە کاتی قسەکردن داو بە تایبەتی لە دەمی وتووێژدا خەسڵەتێکی زۆر دزێوو بەدەو هەر لەو جۆرە کەسانە دەوەشێتەوە کە لێرەدا بە سەرانی کوفر ناودەبرێن. کەواتە: با لەو خەسڵەتە نزمە وریابین، پێیەوە گیرۆدە نەبین.

1 ـ ئێوەش بەس مرۆڤێکن وەك ئێمە!
2 ـ دەتانەوێ لە ڕێوشوێنی پێشینانمان لامان بدەن!
3 ـ بەڵگەو موعجزەیەکی ڕوونمان بۆ بێنن!

لە ڕاستیدا ئەگەر سەرنجی مێژووی بە سەرهاتو ژیانی هەرکام لە پێغەمبەران بدەین (علیهم الصلاة والسلام)، دەبینین ئەم سێ ڕەخنەو بەهانەیە دەستەگیرەو چاوپێچکی سەرانو زلەزلانی خۆبەزلگرو خۆشگوزەرانی تێکڕای ئەو گەلو کۆمەڵانە بووە کە لەگەڵیاندا ڕووبەڕووبوونەوە، بەڵام با لەم سێ ڕەخنەو بیانووە ڕامێنین داخۆ بۆ ئەوە دەشێن کە بکرێنە ڕەخنەو لە پێغەمبەران بگیرێن یان نا؟

## پووچاندنەوەی بەهانەی یەکەم:

## ( ئێوەش بەس مرۆڤێکن وەك ئێمە )

ئەم ڕەخنەیە شتێکی یەکجار بێجێیە لەبەر دوو هۆیان:

یەکەم: بەسووك لێڕوانینو نرخاندنی مرۆڤ، چونکە بێبڕوایان کە بە پێغەمبەرانیان گوتوە: بۆیە بڕواتان پێ نایەنین چونکە ئێوەش بەس ئینسانێکی وەك ئێمەن، مەبەستیان ئەوە بووە کە ئینسان ڕێی نا کەوێو زۆر لەوە نزمترو کەمترە کە بتوانێ لە گەڵ خوادا پەیوەندی هەبێو گفتوگۆی لەگەڵ بکاتو پەیامی لێ وەربگرێ، جا بێگومان بە کەم سەیرکردنی مرۆڤو بە بێنرخ لە قەڵەمدانی درووشمو نیشانەی هەرە زەقی بیری خوانەناسیی بووەو مۆرێکە پێیەوە دەنا سرێو هەرکام لە بیردۆزەکانی مارکسیزمو داروینیزمو فرۆیدیزمیش بە ڕوونترین شێوە ئەم جۆرە تێڕوانینەیان تێدا ڕەنگ دەداتەوە.

هەڵبەتە بەبێ نرخ دانرانی مرۆڤیش لە بیری ماددیو بێبڕوایییدا ئەنجامو بەرهەمێکی سروشتیو چاوەڕوان کراوە، چونکە مرۆڤ مادام بەس ئەو جەستە بەرهەستەبێ، کە لە ئەندازەیەك ئاوو خوێو ئاسنو هەواو گۆگردو فۆسفۆرو... هتد پێك هاتبێ کە بە هەمووان نرخێکی کەم دەکەن ، وە مادام دەستی خوا لە دروستبوونی دا نەبێو بەڕەچەڵەك بچێتەوە سەر قەوزەو بۆقو قرژاڵو قۆڕیو سەرمازەڵەو کیسەڵو چەقەڵو مەیموونو بەراز!

بەڵێ ئینسانێکی ئاوا حەتمەن سووكو بێنرخەو دەبێ لە ڕیزی چوارپێو ماڵات بژمێررێو، بێگومان شتی هێندە گچکەو سووكو چرووكو نزمیش لێی ناوەشێتەوە ببێتە پەیامبەرو لەگەڵ خوادا بدوێو نوێنەری خوا بێ بۆ لای بەندەکانی.

دووەم: بێبڕوایان کە بە پێغەمبەران دەڵێن: ئێوە مادام ئینسانێکی ئێمە ئاسان، ڕێتان ناکەوێ ببنە نێرراوی خوا، بەدەردی کورد دەڵێن ( لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزان دەژمێرن) ، دزیش پێی وایە هەموو کەس دزە.

بەڵێ پێغەمبەرانیش وەك خەڵکی مرۆڤن بەڵام مرۆڤ تا مرۆڤ فەرق دەکات، مرۆڤ هەیە لە فریشتە بەرزترەو، هەشە لە ئاژەڵ نزمتر، شاعیرێك لەوبارەوە کە مرۆڤەکان هەرچەندە لە ئەسڵی سروشتدا یەکن، بەڵام لە چۆنیەتیو ماهیەت دا جیاوازن، دەربارەی پێغەمبەری ڕابەرمان ﷺ گوتوویەتی:

محمد بشر وليس كالبشر بَلْ هو ياقوتة والناس كالحجر

واتە: موحەممەد مرۆڤە، بەڵام وەك مرۆڤی ئاسایی نییە، بەڵکو ئەو مرواریییەو خەڵکیش وەك بەرد وان!! هەڵبەتە مرواریش هەر جۆرێکە لە بەرد بەڵام چ بەردێك!

## پووچـاندنەوەی بەهـانەی دووەم:

## (دەتانــەوێ لەڕێو شـوێنی پێشینــانمان لامان بــدەن)

یەکی دیکە لەو درووشمو نیشانە بەر چاوانەی بیری بێبڕوا یانی پێ دەناسرێ، ئەوەیە کە کەللە ئیشكو کۆنەپەرستنو چاو لەسەر خوو خدەو دابو نەریتی پێشینانیان چڕ دادەگرنو کوێرانە لاسایان دەکەنەوەو ئامادەی وەرگرتنی هیچ شتێکی نوێ نین، با هەقیش بێ، مادام لەگەڵ ڕ چەی ڕابردووانیاندا دانووی ناکوڵێ، جا بێگومان دەردی لاساکردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانەش پیسترینو کوشندەترین دەردەو هەرکەس دوو چاری بێ پەکی دەخاو لە مرۆڤی دەکات.

## پووچاندنەوەی بەهـانەی سـێیەم :

## ( بەڵگـەو موعجیزەیەکی ڕوونمان بۆ بێنــن )

هەڵبەتە بێبڕوایان کە داوای بەڵگەی ڕوونیان لە پێغەمبەران کردوە (علیهم الصلاة والسلام)، هەر ویستوویانە پەڵپو بەهانان بگرنو خۆ لا باز بدەن، دەنا هیچ پێغەمبەرێك بەبێ بەڵگەو موعجیزەی ڕوونو ئاشکرا ڕەوا نەکراوە، بەڵام دیارە کە بەڵگەو موعجیزە دادی کە سێك دەداتو کە سێك قەناعەتی پێ دێ، کە بیەوێ بڕوا بێنێو بە دوای ڕاستیدا بگەڕێ، دەنا بۆ کەسێك کە هەر تەنها تەشقەڵەچیو نیاز خراپبێ، بێ سوودە، چونکە بە دەردی کورد دەڵێن: ( بە تۆبزی کە چەڵی بنێر یە مازووان لە داری هەڵناڕوانێ). ئنجا با بزانین پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) چۆن وەڵامی ئەم سێ بەهانەیەی بێ بڕوایان دەدەنەوە؟:

## وەڵامی ددان شـکێنی پێغـەمبەران :-

**﴿قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِنْ نَحْنُ إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُكُمْ وَلَكِنَّ اللهَ يَمُنُّ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾** پێغەمبەرانیان ﴿علیهم الصلاة والسلام﴾ (پێیان گوتن: ئێمەش بەس مرۆڤین وەك ئێوە، بەڵام خوا هەرکەسێك کە بیەوێ لە بەندەکانی چاکەی لەگەڵ دەکات ـ پلەی پێغەمبەرایەتی پێ دەبەخشێ ـ) وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە ئەم قسەیە وەڵامی پڕ بە پێستی ڕەخنەو بەهانەی یەکەمی بێ بڕوایانە، لە وەڵامی بەهانەی سێیەمیشدا دەڵێن: **﴿وَمَا كَانَ لَنَا أَنْ نَأْتِيَكُمْ بِسُلْطَانٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللهِ﴾** (وە بۆمان نیە کە هیچ بەڵگەیەکتان بۆ بێنین بەبێ فەرمانی خوا).

بەڵێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەندەی خوانو زۆر لەوە بەئەدەبترن کە پێشنیاران پێشکەشی خوا بکەنو داوای بەڵگەو موعجیزەیەکی لـێ بکەن کە فەرمانی لەسەر نیە.

وەك دەبینین پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هیچ وەڵامی بەهانەی دووەمیان نەدایەوە، چونکە ناماقوڵیی و بێ جێیی وی ئاشکراو بەڵگە نەویستەو حەوجێی بەربەرچدانەوە ناکات.

ئاخر ڕچەی بابو باپیران ئەگەر ڕاستو بەجێبێ، ئەوە پێغەمبەران هەوڵی پتـر چەسپاندنی دەدەن، ئەگەر هەڵەو خواریش بێ، ئەوە لە جیاتی گلەیی و گازاندە، دەبوو ئەو زلەزلە دنیاخۆرانە زۆریش سوپاسی پێغەمبەرانیان کردبایە کە لە ڕێی چەوتو خوار دەیانگێڕنەوەو ڕێی ڕاستیان پێشان دەدەن.

## پێغەمبەران بێمنەتیی خۆیان دەخەنەڕوو:-

ئنجا لە کۆتاییدا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بێمنەتانە پشت بە قەلای مەحکەمی دەستەلاتی خواوە دەدەنو دەڵێن: ﴿على الله توكلنا وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ (بەس پشتمان بە خوا بەستوە، وە با بڕواداران بەس پشت بەخواوە بدەن).

ئنجا بۆ زیاتر بێمنەتیو بێباکی دەربڕینو پێ شاندانی خۆیان دەڵێن: ﴿وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَى مَا آذَيْتُمُونَا وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ (وە لەبەر چی پشت بەخوا نەبەستین، مادام لە کاروبارماندا ڕێڕوونی کردووین؟ وە بێگومان خۆڕادەگرین لە سەر ئەو ئازاردانەی ئێوە، وە با پشت بەستووان بەس پشت بەخوا ببەستن).

بەڵێ ڕێی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە گوڵان نەچێنراوەو لە هەمووی ئارەقو خوێن ڕژاوەو، هەرکەسێك بیەوێ بێ فوڕتو گرێو فیسقو گەوە، ئەو ڕێیە سەختو دژوارە ببڕێ، دەبێ دەیانو سەدان جۆرە مەینەتیو ئیشو ژانو چەرمەسەریی لە خۆی بگرێ، دەنا با دانیشێو دەست لەکاری مەردان نەداتو پاروی لە گەرووی زلتر نەکات!!

## هەڕەشەو گوڕەشەی بێبڕوایان پاش تێشکانو بەزین:-

ئنجا لەکۆتاییدا سەرانی کوفرو بێبڕوایانی کەللە ئیشكو کۆنەپەرستو ستەمکار، وەك عادەتی هەمیشەیی یان دوایین تیری نێو تیردانیان داوێنو، دەست دەکەن بە هەڕەشەو هەڕو گیفو قسە پڕژاندنو دەڵێن: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا﴾ (وەئەوانەی بێ

بڕوابوون بە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان گوت: حەتمەن یان لە خاکی خۆمان دەرتان دەکەین یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر رچەی ئێمە!)، بە واتایەکی روونتر: بێبڕوایان بە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان گوت: ئەگەر بەو جۆرەی ئێمە دەمانەوێ لە خاکی ئێمەدا دەژین چاکە، دەنا لێرە جێتان نابێتەوە!

بێگومان ئەم شێوە گوتارو ڕەفتارەش یەکێ دیکەیە لە نیشانەو دروشمە هەرە زەقەکانی خوانەناس و بێبڕوایانی ستەمکار بەدرێژایی مێژوو! دیسان دەربەدەری و خاك و ئاو بەجێ هێشتن و کۆچکردنیش یەکێ دیکەیە لە خەسڵەت و نیشانە بنەڕەتییەکانی پێغەمبەرانی خوای زاناو تواناو شوێنکەوتووانی ڕەسەن و ڕاستەقینەیان لە هەموو چاخ و رۆژگارێکدا، چونکە هەرچەندە بابای خواناس و مسوڵمان خاك و ئاوو نیشتمانی خۆی خۆش دەوێ و حەز لە تێدامانەوەی دەکات، بەڵام ناپەرستێ، هەر کاتێك بارودۆخێکی وا هاتەپێش کە ڕێی خواپەرستیی و بەرێوەبردنی بەرنامەی خوای لێ بگرێ، خواو بەرنامەکەی هێندە لە لا شیرین و بەرێزو خۆشەویستن کە بتوانێ لە پێناوی واندا دەستبەرداری هەموو شتێك بێ و هەموو شتێك وەلابنێ کە دەبێتە پەرچ و کۆسپی خواپەرستیی و خوا ڕازی کردنی.

## خوا لەسەر بەندەکانی وەدەنگ دێ:-

ئنجا پاش ئەوەی بێبڕوایانی ستەمکار ئەو بڕیارە بێ ویژدانەیان لەبارەی پێغەمبەرانەوەدا، (علیهم الصلاة والسلام)، دۆست و یارییدەدەرو پشتیوانی میهرەبان و بەهێزیان لەسەریان وەدەنگ دێ و دەفەرموێ: ﴿ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ﴾ ( جا پەروەردگاریان پێیی ڕاگەیاندن، کە بێگومان ئێمە ستەمکاران لە نێو دەبەین).

بەڵێ ئەگەر بێت‌و بەندە ڕەسەنەکانی خوای دادگەر هەرچی لە دەستیان دێ لە پێناوی خوادا بیکەن، دوای ئەوەی بڕستیان لێ بڕاو تینیان تێ نەما، خوای بەبەزەیی‌و تۆڵەستێن لە باتی وان وەدەنگ دێ‌و دەستبەکار دەبێ!

ئنجا پاش ئەوەی خوا موژدەی لەنێوبردنی ستەمکارانی بە پێغەمبەراندا، موژدەی وەسەرخستن‌و نیشتەجێبوونیشیان لەزەویدا پێ دەدا: ﴿.. وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الْأَرْضَ مِنْ بَعْدِهِمْ﴾ (وە بێگومان لەپاش وان لە زەویدا نیشتەجێ تان دەکەین)، واتە دەتانکەینە میراتگری ستەمکارانی دز یاخۆرو، دە سەلاتتان پێ دەبەخشین‌و جڵەوی هەڵسووڕاندنی کاروباری وڵاتتان پێ دەسپێرین.

بەڵام ئایا ئەو موژدەو بەڵێنە لە هەموو کەس دەوە شێتەوەو بە هەموو کەس ڕەوا دەبینرێ؟ خوای قسە لەجێ وەڵام دەداتەوەو دەفەرمووێ: ﴿ذَلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ﴾ (ئەوە ـ واتە ئەو موژدەیەـ بۆ کە سێکە کە لە پلەوپایەی من بترسێ‌و لە هەڕەشەی من بترسێ).

بەڵێ موژدەو بەڵێنی خوا تایبەتە بە کەسانێکەوە کە ترس‌و سام‌و ڕێزی پلەوپایەی بڵندی خوایان دڵی پڕکردوون‌و، جێی ترس‌و سامی کەسی دیکەی تێدا نابێتەوە، وە موژدەی خوا تایبەتە بەوانەوە کە بەس لە هەڕەشەی خوا دەترسێن‌و گوێ نادەنە هەڕەشەو گوڕەشەی کەسی دیکە.

### ئەنجامی دەبەرێك ڕاچوونی هەق‌و ناهەق:-

ئنجا خوای بێوێنە ئەنجام‌و ئاکامی دەبەرێك ڕاچوونی پێغەمبەران‌و سەرانی کوفرمان بۆ دەخاتەڕوو ﴿وَاسْتَفْتَحُوا وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾ (وە پێغەمبەران داوای یارمەتی‌و سەرکەوتنیان کرد، وە هەر زۆردارێکی کەللەڕەق زیانباز بوو).

بەڵێ حەتمەن کاسانێك لەگەڵ دۆستو خۆشەویستانی خوادا بە شەڕبێنو دەگژیان ڕابچن، دەبێ هەر باریْ بنەوەیان پێ ببڕیْو لە مەیدانیْدا تخـیڵ بن[تر].

بەڵام وەنەبێ کەسانێك کە لەگەڵ خواو دۆستانی خوادا دە جەنگن هەر بەوەندە وازیان لـێ بهێنریْ کە لە دنیادا بدۆڕێنو تێ‌بشکێن، ﴿ مِنْ وَرَا ئِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَى مِنْ مَاءٍ صَدِيدٍ﴾ (دۆزەخیش لە دواوەیەتی، وە لە ئاوێکی بە گەروویدا دەکریْ کە کێمو زووخاوە).

جا ئایا کێمو زووخاو قووت دەچێ؟! ﴿يَتَجَرَّعُهُ وَلا يَكَادُ يُسِيغُهُ﴾ (بە زەحمەت قم قم قووتی دەداتو خەریکە بۆی قووت نەچیْ!).

هەڵبەتە کەسێك لە حاڵێکی وادابێ، مردنو گیان دەر چوونی شتێکی یەکجار نزیكو چاوەڕوان کراوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ﴾(بە هەموو لایانرا مردنی بۆ دیْ)، واتە هێندە ئازارو ئێشێکی بە سفتو سۆو ژانی هەیە، کە ئازاری هەر شوێنێكو هەر ئەندامێکی بەسە بۆ مراندنی! بەڵام ئایا بە مردن قوتاری دە بیْو، خوای داد گەرو تۆڵە ستێن مردنیش بە کەسانێکی ئاوا ڕەوادەبینیْ؟! ﴿وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ﴾ (بەڵام ناشمریْ).

بەڵێ تەنانەت مردنیش کە ناخۆ شترین شتە بە سەرانی کوفرو شوێنکەوتووانیان ڕەوا نابینریْ!

ئنجا لە کۆتاییدا دەفەرمووێ: ﴿وَمِنْ وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ (وە ئازارێکی سەختو قەبەی لە دواوەیە ـو چاوەڕێی دەکات ـ).

بەڵێ ئەمەیە ئاکامو سەرەنجام دەبەرێك ڕاچوونی هەقو با طل بەڵام بە مەرجێك!

---

(تر) تخێڵ بوون: لەسەر گازی پشت کەوتن.

هەروەك چۆن (باطل) بە ڕاستیو بە مەعنای وشە (باطیل)و ناهەقە، هەقیش بە ڕاستیو بە مەعنای تەواو وشەی (حق) هەق بێتو، خلّتەوخالّو گرێوگۆڵی (باطل)ی پێوەنەمێنێو تەواو بۆ خوا ساغو یەکلابێتەوەو، لە ڕیزی ناهەق جودا ببێتەوە!!

ئیدی بە هیوای هاتنەدی بەرەیەکی هەقی ئەوتۆ لە داهاتوویێکی نزیکدا، لەنێو گەلی کوردو تێکڕای ئۆممەتی ئیسلامدا. (وما ذلك على الله بعزيز).

# دوا قســـەم

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!

لە کۆتاییدا دەمەوێ دواقسەی خۆمت لەچەند خاڵێکدا ئاڕاستە بکەم:

1 ـ وەك لە ڕابردوودا گوتمان گەورەترین حیکمەتی خوای کاربەجێ لە ناردنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەبوو کە خەڵکی بەڵگەو بیانوویان بەدەستەوە نەمێنێ و، ڕێگای گلەییو گازندەیان نەمێنێ: ﴿رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾[1].

کەواتە بێگومان دوای هاتنی پێغەمبەرانو بەتایبەتی دوایین پێغەمبەرو چاکترین پێشەواو سەروەری مرۆڤایەتی، بەهیچ شێوەیەك هیچ کەسێك بەڵگەو بیانووی لە خوا دوورکەوتنەوەو گرتنی ڕێچکەی چەوتو هەڵەی بەدەستەوە نەماوە، چونکە شێتیو نەفامی‌یە ئینسان واز لە ڕووناکی خۆر بێنێو لە پشـتیــرو بنەبانێکی تاریكو تەڵەمدا بەدیار چرا ڕەشکەیەکی نابووتەوە دابنیشێ!!

دیارە ئێستاش هەرچەندە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە شەخسی خۆیان لەنێو مرۆڤایەتیدا نەماون، بەڵام بە فیکرو ڕێو شوێنو بەرنامەو پەیڕەو ـ کە لە ئیسلامدا خۆی دەنوێنێو ئەویش لە ئاوێنەی زاناو میراتگرو جێگرانی ڕەسەنو ڕاستەقینەی پێغەمبەراندا

[1] (النســاء 165).

دەدرەوشێتەوە ـ هەر ماونو خەتو ڕێبازەکەیان بەردەوام لە ئارادا یەو درێژەی پێدەدرێ.

2 ـ جۆرو شێوەی ژیانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وا هەڵکەوتوە کە هیچ کەس ڕێگای بەهانە هێنانەوەو مذ جەمنجی نەبێ، چونکە: ئەگەر کابرا بیانووی ئەوەبێ کە لەمێژە خەریکی باذ گەوازو خەبا تەو هیچی بۆ بە هیچ نەکراوە، تەمەنی دوورو درێژو کەم بەرهەمی ( نووح) (علیه الصلاة والسلام) قسەی دەبڕێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلاَّ خَمْسِينَ عَاماً﴾(تر)! ﴿...وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾(یر). وە ئەگەر عوزری نەداریی‌و تەنگدەستیی بێ (عیسی) (علیه الصلاة والسلام) کە پێشەوای دنیا بەکەمگران بووە، لەسەری دەبێتە شایەد کە بابای هەژاریش دەتوانێ خواپەرستو پابەند (مُلْتَزِم) بێت! وە ئەگەر بێجێو ڕێبیو دەربەدەریی بە بەهانە بێنێتەوە (إبراهیم) (علیه الصلاة والسلام) کە هەر جارە بۆ ولاتێك کۆچی کردوەو دەربەردەر بووە، قسەی پێ نایەڵێ، چونکە ئەو پایەبەرزە لە گەڵ ئەو حاڵە شیدا گەورەترین بانگەوازو خەباتی کرد! وە ئەگەر دەستەڵاتو سامان بکاتە بیانووی خۆی، (داوودو سلێمان)(علیهما الصلاة والسلام) کە وێڕای پێغەمبەرایەتی پادشا (مَلِكْ)یش بوون، بە بەڵگەی ژیانی خۆیان پێی دەسەلمێنن کە خواناسییو دینداریی لەگەڵ دەستەڵاتو ساماندا دژایەتی نیەو، ئینسان دەتوانێ وێڕای سامانداریی‌و دەستەڵاتداریی خواش

(تر) ( العنكبوت 14 ).
(یر) ( هود – 40 ).

بپەرستیّو دەستەڵاتو[تر] سامانەکەشی بکاتە وەسیلەی خزمەتی ئایینەکەی!!

3 ـ کەواتە با ئێمەی مسوڵمانو خۆبەشوێنکەوتووی پێغەمبەران زان (علیهم الصلاة والسلام)، هەوڵ بدەین کە هەرچی زیاترو چاکتر لە ژیانو بەسەرهاتی ئەو زاتە بەرزانە بگەینو وردبینەوە، گەوهەرو مرواری‌یەکانی دەریای قووڵـی ژیانو گوزەرانیان دەربێنینو، بە چاوی عەقڵو دڵ لە فەرموودەو هەڵوێستەکانیان وردبینەوەو رامێنین، تاکو بتوانین لەبەر تیشكو رووناکی مەشخەڵـی هیدایەتیاندا بەرێوەبچینو ئەم ئامۆژگاری‌یە بەرزەی خواوەند لە دڵ بگرین، کە دەربارەی کۆمەڵێك لەو زاتانە بە پێغەمبەرمان دەفەرموێ: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ﴾[یر]، واتە: ئەوانە کەسانێك بوون کە خوا رێنمایی کردبوون دە جا تۆش بکەوە شوێن رێنمایی وان.

بەڵێ ئینسانی ژیرو فامیدە تەنها متمانە بەو رابەرو چاوساغانە دەکات و، بەس خۆی تەسلیمی خەتو رێبازی ئەو سەرکردەو پێشەوایانە دەکات، کە خوا پاکانە (تزکیة)یان دەکاتو، شایەدیی رێ دێننەوەو سەر راستیی‌یان بۆ دەدات، کە پێغەمبەرانی پایەبەرز (علیهم الصلاة والسلام)و ئەو زانا جێگرە رەسەنانەن کە بەراستی دڵبەندو تامەزرۆو شوێنکەوتووی موو بەمووی ئەو زاتە بێ‌وێنانەن.

ئیدی بە ئومێدی زیاتر حاڵی بوون لە بانگەوازی پێغەمبەرانو چاکتر پابەندیی بەخەتو رێبازیانەوە.

---

(تر) دیارە مەبەست دەستەڵاتو سامانێکە کە بە رێگایەکی شەرعی وەدەست هێنرابێ.

(یر) (الأنعام ‒90).

# نێـــوەڕۆك

| | |
|---|---|
| | يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ .. الظَّالِمُونَ .. |

www.alibapir.com

## ئەم کتێبە

لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و فراوانە دەربارەی ئیمان وعەقیدەی ئیسلامیی
گومانیشی لەوەدا نییە کە ئیمان وعەقیدە لە ئیسلامدا وەک بناغە بۆ دیوار و
ڕەگ وڕیشە بۆ درەخت وهەوێن بۆ ماست وهەناو بۆ ئینسان وایە !
بۆیە هەر کەسێک بیەوێ مسوڵمانێتی و دینداریەکی ڕاست و ڕەوان
دەبێ لە ئیمان وعەقیدەوە وبنیاتنانی لە عەقڵ و دڵیدا دەستپێبکات !
وە هەر کۆمەڵ و میللەتێک بیەوێ ژیان وگوزەرانی خۆی بەپێی شەریعەتی
خوا پاکسازیی وچاکسازیی بکات و ڕێگەی نجاتی پێویستە لە ڕاستکردنەوەو
بژارکردن وچەسپاندنی ئیمان وعەقیدە دەست پێ بکات .
پێشم وایە ئەم کتێبە بە هەرشەش بەرگەکەیەوە هاوکارێکی باش و
جێی متمانە وپشت پێ بەستنە بۆ هەر تاک وکۆمەڵێک بیەوێ
دەست بە وگۆڕانکاریی و پاکسازیی وچاکسازییە بکات .

عەلی باپیر





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice
trizone ARCHITECTURE COVER DESIGN
6000 دینار


